

# کاروان


گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە ئەمینداریەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا .

سەرنووسەر
محمدامین محمد احمد

جێگری سەرنووسەر
حسین ڕەشوانی

٧١
کانوونی دووەمی ١٩٨٩
ساڵی حەوتەم

ئەدرەس
هەولێر : ئەمینداریەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری « کاروان » : ٢٠٨٨٢


## لەم ژمارەیەدا




نرخی « ٥٠٠ » فلسە

« ٧٠٠٠ » دانەی لێ چاپ کراوە

لەکتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە « ٤٨٣ »ی ساڵی « ١٩٨٢ » دراوەتێ

لە چاپخانەی « دار الحریة للطباعة » چاپکراوە







کەریم مستەفا شارەزا

# مرۆڤێکی میللی رەندو خێرخوازو خزمەتگوزار بوو

لەو رۆژەوە کە مرۆڤ لەسەر ئەم کۆنە دنیایە خولقاوەو ، هوشیاریی کۆمەلاّیەتی پەیدا کردووە . خێرو شەر و ، چاکەو خراپەی هاتوّتەریّو ، بەپێی رادەی هوشیاریی خۆی ، پێوانەیەکی بۆ ئەم دیاردە دژ بەیەکانە داناوەو ، ئەو جیهانەی کە لە سەری ژیاوە بۆی بووەتە شانۆیەکی فراوان و ، هەرکەسە دەوری خۆی تێدا نواندووە. هەیە دەورێکی خێرخوازانەی تێدا بینیوەو هەیشە دەورێکی خراپ و شەرانی تێدا نواندووە . هەر ئەو دوو جۆرە کەسانەش ناویان لە مێژووی مرۆڤایەتی دا تۆمار کراوەو کەم وا بووە نموونەی نێوانی خێر خوازو شەرخواز ناوی لە مێژوودا تۆمار کرابێت ، چونکە نە چاکەی کردووە و نەخراپە ، بۆیە بە بێ دەنگی ژیاوە و هەر بەبێ دەنگیش چووەتەوە دنیای نەبوون .

دەستەی چاك و خێر خواز بوونەتە نموونەی باش بۆ نەوەی نوێ ، تاکو پەیرەویان بکەن و ، دەستەی خراپ و شەرخوازیش بوونەتە نموونەی بەد تاکو نەوەی تازە نەفرەتیان لێ بکەن . لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوەو بەم جۆرە خۆی دەردەبرێ : « ئایا پێوانەی چاکەو خێر خوازیی لە ناو کۆمەلّی ئادەمیزاد دا چییە ؟» لە وەلاّم دا دەلّێن : « هەر چەندە پێوانەکە بەپێی سەردەم و جێگە دەگۆرێ ، بەلاّم بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین چەند لایەنێکی سەرەکی لێ بخەینە روو و بلّێین : خزمەت کردنی رۆلّەکانی نەتەوە بە کردەوەی چاکی وەکو یارمەتی دانی هەژار و لێ قەوماوان و دوورخستنەوەی رۆلّەکانی میللەتەکەی لە خوورەوشتی خراپ و لادانیان لە رێگەی چەوت و ناهەموار و رواندنی تۆوی شادی لە دلّی غەمبارو لێو بەباران ، هەندێ پێوانەی چاکەو خێر خوازیی مرۆڤە لە بواری خزمەتگوزاریی کۆمەلّگای نەتەوەکەی داو ، هەر کەسێکی لە بازنەی ئەم پێوانانەدا خزمەتی نەتەوەکەی خۆی و مرۆڤایەتی بکات ، ئەوا مرۆڤێکی چاك و خزمەتگوزارەو ناوی لە مێژوودا بە نەمریی دەمێنێتەوەو ، مەرجیش نییە خۆی لە نموونەی مرۆڤی زانا یا هونەرمەند یان شاعیر و نووسەر یاخود خەباتگێری سیاسی دا بنوێنێ . بەلّکو گەلێ جار وا دەبێ خۆی لە نموونەی مرۆڤی سادەو ساکار و نەخوێندەواری وەکو [ عەولاّ جەیدی ] ی کۆیی رەوەندو کاسبکارو گاڵتەچی و یاری زانی میللی دا بنوێنێ .

## عەولاّ جەیدی کێیە ؟

عەولاّ جەیدی ناوی تەواوی عەبدوڵلای کوری وەستا حەمەدی ئاسنگەری کوری یەعقووبە ، بە درێژایی دە پازدە پشت بنەمالّەکەی هەر لە کۆیە ژیاوە ، لە ساڵی ١٨٦٩ دا لە خانوویکی قوری هەژارانەی گەرەکی قەلاّتی شاری کۆیە لە دایك بووە و ، نەخراوەتەوە بەر خوێندن و باوکی ئاسنگەرێکی زۆر وەستا بووە، ئەمیش ئەو پیشەیەی ئاسنگەری لەوەوە فێر بووە و دوای مردنی باوکی چووەتە سەر دەزگای وەستایی و خەریکی دروست کردنی کەل و پەلی سووکی وەکو چەقۆ و ئالقەو رێزە و ئەستێ و شانەی موو و سووژن قوفڵ و کلیل بووە و بەم کارە وردەی ژیانی خۆی و خێزانەکەی دابین کردووە .

وەستا عەولاّ تەنیا خوشکێك و برایێکی بووە [ خەجیج و حەمەد ئەمین ] و هەردووکیان پێش خۆی مردوون و خۆیشی ژنی هێناوە ، ناوی (ئامینە) بووە و ١٣ منداڵی بووە لەوانە دوو کچ و




کوڕێکی بۆ گەورە بووە و ، ئێستا تەنیا حەمەدی کوری لە ژیان دا ماوە و وەکو باوکی وەستایێکی گورج و گۆڵ و کارامەیە بەڵام خۆی لە کاری گۆڕهەڵکەندن نەداوە . وەستا عەولا لە دەرە بەهاری ساڵی ١٩٤٤ لە تەمەنی ٧٥ ساڵی دا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (کەکۆن) نێژراوە .

بۆ پێی گوتراوە عەولا جەیدی ؟

لە نامەیەکی تایبەتی ی کاك (فاضل شەورۆ)ی شاعیری کورمزای «وەستا عەولا»[1] دا ئەمە هاتووە و دەڵێ : «جارێکیان لە نەنکم پرسی : بۆ بە باپیرم و بە ئێمە دەڵێن (جەیدی) ؟ ئایا ئەم نازناوە لە چی‌یەوە هاتووە ؟» ئەویش لە وەڵام دا گوتی : «ئەم نازنـاوەی جەیـدی هی باپیرتە لەوەو پێش بنەماڵەی ئێوە ئەو نازنـاوەی نەبووە ، باپیرت چونکە لە منداڵی و هەرزەکاری‌یەوە زیرەك و کارزان بووەو ، هەر کارێکی خێری پێ‌سپێردرابایە ، بە جوانی‌و پوختی ئەنجـامی دەدا بۆیـە مەلاکان پێیان گوتووە کاری عەبدوڵلا زۆر باش و (جەییدە) ، ئەم وشەیەی (جەیدی) ێ دروست بووە .

کاك شەورۆ لە هەمان نامەی‌دا دەڵێ : «بەڵام باوکم دەڵێ: ئەم وشەیە لەڕاستی‌دا لە وشەی [جید : جەیید]ی عەرەبی‌یەوە نەهاتووە ، بەڵکوو لە وشەی [جدي = جیدی]یەوە هاتووە ، چونکـە باوکم چ لە کاری چەقـۆکەرێتی و چ لە کاری خێری گۆڕهـەڵکەندن و ناشتنی مردووان زۆر بە دڵسۆزیی و پاك و پوختی کارەکەی ئەنجام دەدا ، بۆیە مەلاکان و خەڵکەکە پێیان دەگوت : وەستا عەولا لە کارەکەی دا زۆر (جیددی)یە ، ئینجا لەگەڵ زۆر بەکارهاتن دا (جیددی)یە کە بووە بە (جەیدی) ] ، ئینجا ئەم نازناوەی وەستا عەولا لە کام وشەیانەوە هاتبێ هەر مانای کارامەیی‌و چالاکی‌و زیرەکی‌ی وەستا عەولای چەقوکەرو، گۆڕ هەڵکـەن و ، گاڵتەچی‌و یاری زانی میلی‌و مشوور گێری سەیـران و ئاهـەنگان دەگەیێنێ و ، ئێستا بۆ کورو نەوەکانی ماوەتەوەو ، چونکە وشەی (جەیدی) نازناوو یادگاری پیاوێکی میلی‌ی رەند و روو خۆش و خێرخوازو خزمەتگوزارە ، تا هەتایە وەك نازناوێکی خۆش و نەمر لە ناو کورددا دەمێنێتەوە .

شێوەو ئەدگارو جل و بەرگی عەولا جەیدی :

عەولا جەیدی پیاوێکی دەستەی مەیلەو وردیلە بوو ، نە قەڵەو نە لاواز بوو ، رووخـۆش و ئێسك سووك بوو، چاوێکی گەش و مەیلەو زەقی هەبـوو نیگـای زۆر تیژ بوو ، دەست و بازووێکی بەهێز و پتەوی هەبوو لە قسەکردن دا مەیلەو گورج بوو ، کورتـەك و شەرواڵی لەبەر دەکرد ، بەڵام لە هاوینان دا لەبەر گەرما تەنیا کورتەکی دەخستە سەر دەرپێی سپی‌و کڵاو جەمەدانی رەشی لەسەر دەنا و ، کاڵەکی سەر بە گوڵینگەی کۆیە یان ئێمەنی رەشی بە کلکی لەپێ دەکرد . چای کەم دەخواردەوەو بە درێژایی تەمەنیشی جگەرەی نە دەکێشا[2]

عەولا جەیدی لەچەند بواری ژیان دا ناوبانگی دەرکردووە ؟

عەولا جەیـدی جگە لەوەی کە وەستایەکی چەقوکەری کارامـەبـوو ، لە هەمـان کات دا ، لەگەڵێ بواری تری ژیانی کۆمـەڵایەتی‌دا ناوبانگی چاکی دەرکردووە ، هەمیشە بەسەر زارانەوە بووە ، ناوی بە ئازایەتی و جوامێریی و خزمەتگوزاریی رۆیشت بوو ، لەو کاتەی کە لە بواری وەرزش و یاری میلی‌ی کوردەواری دا زۆر وەسـتـا بوو ، لەهـەمـان کات دا لە مشـوورگـێرانی سەیـران و ئاهـەنگی خەڵکی شارەکەدا زۆر

شارەزابـوو ، لە هەمـان کاتیش دا لە کاری گۆرهەڵکەندن بۆ مردووان و ناشتنیان ، بەتایبەتی مردووی هەژاری بێکەس ، یەگجـار گورج و گۆڵ و بە راپەر بوو ، هەر لەو کاتەش دا لە باروبووکردن و ، پیتاك کۆکردنەوە بۆ هەژارو لێ قەوماوان گەلێك بە خەم و لەش سووك بوو . لە نوکتەبازیی‌و سوحبەتی خۆش و گالتــەو گەپیش دا هەر مەپـرســە کە چەنــدە روح سووك و قوشمەبوو ، لێرەو دوا کەمێك بە درێژیی لەسەر گورج و گۆڵی وەستا عەولای جەیدی رەندو روو خۆش و خزمەتگوزار دەدوێین و بەپێی ئەو بوارو مەیدانانەی کە چالاکی تێدا نواندوون ئەم مرۆڤـە میللی‌یـە روح سووکـە نەمـرە بە خوێنەرە بەرێزەکان دەناسێنین .

## ١ـ عەولا جەیدی مشوورگێری سەیران و رێکخەری یاری میللی‌ی کوردی :ـ

وەستا عەولا مرۆڤێکی رەندو رووخۆش و لێو بە خەندە بوو رێزی لە هەموو گەورە و بچووکی شارەکەی کۆیە دەناو ، ئەوانیش هەموویان خۆشیان دەویست و لە قسەو راو تەگبیری دەرنــەدەچـوون . چی گوتبایە بە گوێیان دەکرد ، چونکە بۆ خۆشی و بەرژەوەندی ئەوان دەجوولایەوە . کە بەهار دادەهات و دەشت و دەرو گرد و نەوال بەگـژو گیـاو گوڵ و لالە و نەرگز دەرازانەوە و، باخ و گوڵزار دەبووژانەوە و بە جوانی دەخەملین و بولبول لەسەر چلان دەیخوێند ، لەو وەرزە خۆشـەدا ، وەستا عەولا لە رۆژە خۆشەکانی چوارشەممەکان دا لە بەیانی‌یەوەو ، لە رۆژانی هەینیش لە دوای نوێـژی جومعەدا دەکەوتە خۆ ، بەنــاو بازاری شاردا دەســوورایەوە و دوکانی بە دوکانداران دادەخست و مەلاو فەقێ و مجێوری لە مزگەوتان دەردەهێنان و ، هەرزەکـارو گەنج و جوامێرەکانی سەر پاکی شاری کۆیەی دەنگ دەدا هەمووی بەگەڵ خۆی دەدان و هەرکەسە خۆراکی ئەو رۆژەی لەگەڵ خۆی‌دا دەبردو ، دەچوونە ناو رەزو باخان ، بۆ سەر کانی‌و کانیاوو رووباران و هەر جارە بۆ سەیرانگایەکی رۆخ شار ، جارێك بۆ (ئۆمەر خوچان)و جارێك بۆ (کەندەکۆخ)و جارێك بۆ دەرماناوی بنەو زۆر جارانیش بۆ کانی بسکان و کانی جلیت دەچوون [٣]. جوانترین جلکیان لەبەردەکردو خۆشترین خواردنیان دەبرد ، کە دەگەیشتنە جێ و کەل و پەل خۆراکیان لە شوێنێکی دیاری کراو دادەنا ،وەستا عەولا کورگەلی دەنگ دەداو، هەمووی لە گۆرەپانێك لە دەورەی خۆی کۆدەکردنەوە ، دەمێك ئاهەنگی شایی‌و هەڵبەرکی‌ی بۆ سازدەدان و دەمێکیش دەبـووە، [مـامۆستای وەرزش و یاری‌یە میللی‌یەکان و جۆرها یاری فۆلکلۆری کوردی سازدەداو دەوری حەکــەمی یاری و مەشق پێکەری دەبینی] [٤].

بە زۆری ئەم یاری‌یـە فۆلکلۆری‌یـانــەی بە خەڵکــەکە کردووە : [یەك باز ، سێباز ، چوار کەوشەك ، قەڵەوە ، گوریس کێشەکێ ، شەقی گۆلکێ و یاری (کەری میری ئەسکەندەر ، کە بە یاری عەولا جەیــدی ناسراوە و ئەم لە شاری کۆیــەی بڵاوکردۆتەوە] [٥] ، هەروەها یاری (چکەندەرە) یشی بە لاوەکان کردووە و ، لە کاتی چوونە سەیرانان گورانی [شیرنێ لەیلانێ لە یلانێ شیرنێ بابچینە سـەیرانێ ] ی گوتوون و خەڵکەکەش بە چەپلە لێـدانــەوە بۆ یان گێراوەتــەوە و ، لە گەرانــەوەشدا گۆرانی [ئەسمەر غەزاڵێ پەرچەمە] ی پێ گوتوون و ، [٦] دەبێ ئەو راسستی‌یـەش بلێــین : وەستا عەولا لە گوتنی ئەو جۆرە گورانی‌یــە سووکـانــە دەنگی بوو . بەم جۆرە رۆژێك یا نیوە رۆژێکیان بە سەیران و یاری میللی خۆش خۆش بە سەر دەبرد و پیر و گەنــج خەم و تاڵی زەمـانــەیـان لە بیردەکـرد و هەزار رەحمەتیان بۆ گۆری باوکی عەولا جەیدی دەنارد ، کە ئەو جۆرە بەزم و سەیرانەی بۆ سازدەدان . جگە لەم سەیرانانە وەستا عەوڵلا زۆربــەی ئێــوارەی رۆژە خۆشەکانی بەهار خەڵکەکەی دەبردە دەرەوەی شار بۆ دەرکی گەروو سۆرکێ یا زەوی میری یاخود دامێنی (قولەتێنی نیزامان) و گەلێ یاری میللی‌ی کوردی وەکـو (تـوپی جغـزێ) و سێبازو (یەك باز) ی پێ دەکردن و دەوری مامۆستا و حەکەمی لەناویان دا دەبینێ .

## ٢ـ عەولا جەیدی گۆرهەڵکەنی خێرومەند :ـ

لەگەڵ ئەوەی کە عەولا جەیدی پیاوی زەوق و خۆش رابواردن و مامـۆستـای یاری فۆلکۆری کوردی مشوور گێری ئاهەنگ و

سەیرانی پڕ خۆشی و شادی بوو ، لە هەمان کاتیش دا مرۆڤێکی خوا پەرست و باوەڕ بەهێز بوو ، هەر ئەو باوەڕە ئایینی‌یە پتەوەی بوو ، وای لێ کرد بە خۆرایی و لە ڕاهی خودا گۆڕ بۆ مردووی هەژاری بێ کەس و دەوڵەمەندان هەڵکەنی و بە ڕێکوپێکی بە خاکیان بسپێرێ ، بۆیە هەموو دەم لە ماڵەوەی دا کەل و پەلی گۆڕ هەڵکەندن و پێویستی وەکو [ بێڵ و پێمەرەو کوڵنگ و قازمە و چادرو لۆکس و کفن و لیفەی مردوو شتن ][٨] ی هەبوو ، ( خامی سپی کفن ) ی لێ دەربچێ کە هەندێ دەوڵەمەندی خێرەومەندی وەکو (حاجی کاکەمین و یا زەهوەی مام خدر) بە تۆپ خامی کفنیان لەلا دادەنا ، تاکو بە خێر بەمردووی هەژارەوەی بنێ [٩]. دەنا کەل و پەلەکانی دیکە هەمووی لە کیسەی خۆی دەکرین و خێراتێك بوون بۆ مردووانی شارەکە بەکار دەهاتن .

هەندێ کەس بەر لەمن بەم جۆرە لەسەر خێر خوایی‌ی خوالێ خۆش بوو عەولا جەیدی‌یان نووسیوە و دەڵێن : [ وەستا عەوڵلا جەیدی هەموو دانیشتوانی شاری کۆیە ، لەگەورە و بچووك و لە مەلاو ئاغاو گەدا ، گوێ ڕایەڵی ئەو زاتە بوون هیچ کەسێك لە قسەی دەرنەچووە ، چونکە هەموو کارەکانی بۆ سوودی دانیشتوانی شارەکە بووە ، گەرماو سەرماو ماندوو بوونی نەزانیوە ، ئەگەر کارێك هاتبێتە پێش ، بەتایبەتی ناشتنی مردووان ، عەبدوڵلا جەیدی هەموو ئەرکێکی گۆڕهەڵکەندن و کفن کردن و ناشتنی ئەو مردووەی گرتۆتە ئەستۆ ، جا ئەو مردووە ، بەکەس بوو بێ یان بێ کەس و هەژار ، جۆرە ڕێو شوێنێکی بۆ کۆمەگ و هاریکاری لە کۆیە داناوە ، تا ئێستا پەیرەو دەکرێ و هەموو کەل و پەلێکی ناشتنی مردووان ئامادە دەکەن ، بەبێ ئەوەی خاوەن مردوو تۆزقاڵێك ماندوو ببێ ][١٠] یا خود شتێکی وای لەکیس بچێ و هەموو ئەرکێکی ئەو کۆستەی بکەوێتە سەرشان ..

خەڵکی کۆیە لە بارەی وەستا عەولا جەیدی ی گۆڕهەڵکەنی خێرەومەندەوە گەلێ هەواڵی سەیر و هەڵوێستی سەرنج ڕاکێشی وەکو ئەمانەی لێ دەگێڕنەوە و دەڵێن :ـ

١) وەستا عەولا جەیدی کە چەند ڕۆژێك بێ کاری گۆڕ هەڵکەندن دەمایەوە ، دەچوو بە تەنیا لە گۆڕستانی کە کۆن گۆڕێکی بۆ خۆی هەڵدەکەندو لە دڵی خۆی‌دا دەیگوت : نەبادا کە مردم خەڵکەکە زۆر پێمەوە ماندوو ببن ، بەتایبەتی بە گۆڕهەڵکەندنم . بۆیە هەمیشە گۆڕێکی لێ دراوی سەرداپۆشراوی ئیحتیاتی بۆ خۆی ئامادەکرد بوو .[١١] کاك فاضل شەوروّ لە نامەکەی‌دا دەڵێ : [ جاریك نەنکم بۆی گێڕامەوە و گوتی : لە ڕۆژێکی زۆر ساردی زستان دا کابرایێکی هەژارو بێ کەس دەمرێ‌و بەو تەڕو تووشی‌و سەرمایەش گۆڕ هەڵکەندن کارێکی زۆر گرانە ، بۆیە باپیرت گۆڕەکەی خۆی پێشکەش بەو مردووە بێ کەسە دەکات و دەڵێ : من لە دەرفەتێکی تردا گۆڕێکی دیکە بۆ خۆم لێدەدەمەوە !]

ب ) وەك دەگێڕنەوە ، وەستا عەوڵلا . نەك هەر ئەو جارە بە لکو چەند جاری تریش گۆڕی بۆ خۆی لێداوە و لە دوایی‌دا بەنسیبی مردوویکی بێ کەس و هەژار بووە کاك شەروّ لە هەمان نامەی دا دەڵێ : [ نەنکم گوتی : جارێکی دی باپیرت گۆڕێکی لێ دراوی خۆی پێشکەش بە مردوویکی هەژار کردووە، خۆی بێ گۆڕی لێدراو ماوەتەوە !! بۆیە بەشەو خۆی لە خەڵکەکە دزیوەتەوە و چووەتە بن چیای هەیبەت سولتان بەردی بە پشت هێناوە بۆ گۆڕستانی کەکۆن و گۆڕێکی نوێی بۆ خۆی لێداوەتەوە و ، بەو شەوە چووەتە ناوی تاکو بزانێ بۆی تەسکە یان نە و گۆڕەکەی تەواوکردووە سەری داپۆشیوە و بۆ دوای نیوەشەو هاتۆتەوە ماڵەوە !!][١٢]

ج) وەستا حەمەدی کوری خوالێ خۆش بو ، بۆی گێڕامەوە ، گوتی : [ باوکم مردنەکەیشی هەر بە هۆی مردوو ناشتنەوە بووە، چونکە لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤ دا . کاتێك لە ڕۆژێکی زۆر ساردی ئەو زستانەدا ، تەرمی مستەفای هەمینەی لەیلێ‌ی موختاری گەرەکی هەواو دەنێژێ هەندێ خوێنی هەناوی ئەو مردووەی بەجلەکانی دەکەوێ ئەویش کاتێك لە ناشتنی دەبێتەوە ، گورج دەچێتە دەم ڕووبارو جلەکانی دەشوات و بە تەری لەبەریان دەکاتەوە لەوەوە تووشی نەخۆشی‌یەکی گران بوو، زۆری نەبرد بەو دەردە کۆچی دوایی کرد .

د). دەگێڕنەوە دەڵێن :[ جارێکیان عەولا جەیدی دەچێتە سەردانی مەلا عیزەتی کوری مەلا حەبیبی جەلی زادە بۆ هەواڵ پرسینی ، چونکە تازە تووشی نەخۆشی شەپرە بوو بوو ، ئەمیش

لە جیاتی پێی خۆش بێ ، هاواری کردووەتێ و پێیء گوتووە ، برۆ لەبەرچاوم لاکەوە !!] ئەمەش لەبەر ئەوە بووە ، چونکە وەستا عەولا گۆرهەڵکەن بووەو نەخۆشەکەش وای زانیوە عیزرائیلی لە دواوەیە ]

ھ) . جارێکیان سەرەتای هاوین بوو ، ئێمە ماڵمان لەسەر باخێکی خۆمان بوو ، کە نزیکە ٢ کیلۆ مەترێك لە بازارەوە دوور بووە پاش نیوەرۆیەك باوکم لە شار گەرایەوە و پێی گوتم « رۆڵە هەستە برۆ بازار و ( ئەستێ ) یەکم بۆ لە عەولا جەیدی بکرە خۆیشی تازە لە نوێژی جومعە لە شار گەرابوەوە ، منیش لەبەر دووری رێگاو گەرما بەشەرمەوە گوتم « بابە خۆ بۆ خۆت تازە لەشار بووی بۆچ نەت گری ؟» لە وەلام دا باوکم بە تووڕەیەوە پێی گوتم : قسەم لە قسەدا مەکە ، من لەهەموو دوکانەکانی ترم پرسیار کرد ( ئەستێ ) یان نەبوو ، دەڵێن : تەنیا لەلای ئەو دەست دەکەوێ ومنیش نەچوومە لای !!] ، ناچار ملی رێگام گرت و هەر بیرم لەو قسەیەی باوکم دەکردەوە کە بۆچ نەچۆتە لای عەولا جەیدی ؟ لە دواییدا بۆم ساغ بووەوە کە باوکم پیر بووەو لە وەستا عەولای گۆرهەڵکەن دەترسێ نەبادا عیزرائیلی لە دواوە بێ !!

## ٣- عەولا جەیدی و کۆکردنەوەی پیتاك بۆ هەژارو لێقەوماوان:

ئەگەر یەکێك لە شاری کۆیەدا تووشی کارەساتێکی وەکو ماڵ سووتـان و نەخۆشیو هەژاری و دەست کورتییەکی زۆر ببوایە ، ئەوا گورج وەستا عەولایان تێدەگەیاند و ئەویش خێرا کلاوەکەی سەری دادەکەند و دەیخستە ناو لەپیو بەناو بازار و قەیسەری کۆن و نوێدا دەگەراو دەچووە بەردەم عەتارو بەقاڵ و قەساب و مسگەرو چەخماخسازو بازرگان و پارەدارەکان و ، دڵی هەر کەسەی بە قسەیەك نەرم دەکرد تاکو پارەیەکی باش بدەن بەو لێقەوماوە و ، وەك بزانم هۆی ئەو رێزگرتنەی لەلایەن بازرگـانـەکـانــەوە ، هەر دەگـەرێـتــەوە بۆ مەســەلەی گۆرهەڵکەندنەکەی و خەڵکەکە بە بینینی عەولا جەیدی مردنیان بە بیردەهاتەوەو دەستیان لە ماڵی دنیا شل دەکرد . چونکە کە دەچووە بەردەم ئاغەو بازرگانە چەلبییەکان پێیدەگوتن بێنن پارەو پیتاکتان ، ئەمرۆ دنیایەو سبەی قیامەت و ئەمرۆ ژیانە و سبەی گۆری تەنگ و تارەو بە خوا کە مردن کەستان لە خێرو چاکـەی سەر دنیا بەو لاوە ، هیچ پارەو پولێك لەگەڵ خۆیدا نابـاتــە ژێـر گڵ ! ئەوانیش هەر کە گوێیـان لە مردن و گۆر دەبوو ، گورج بەزێدەوە پارەی پیتاکیان دەدایێ .

## ٤- عەولا جەیدیو ئاهەنگی مەولوود خوێندنەوە:-

جاران مەولوود خوێنـدنەوە لە زۆر مزگەوت و ماڵان دا دەکراو ، خەڵکێکی زۆر بانگ دەکران ، دەتوانم بڵێم زۆربەی خەڵکی شاری کۆیە ، بە هەژار و دەوڵەمەندەوە بۆ نان خواردن و بەشداری کردن لە ئاهەنگەکەی بانگ دەکران و ، ئەو ئاهەنگە گەورەو فراوانــانــەش خزمــەت و مشــوورگــێران و تەگبــیری پێدەویـــســـت و کەم کەســـیش بە چاکــی سەری لەم کارە دەردەچــوو ، یەکێکی وەك عەولا جەیـدی نەبوایە ، بۆیە هیچ ئاهــەنگی مەولوود خوێندنەوە لە کۆیە بەبێ ئەو نەکراوە ، کە رۆژێك پێشتر بانگیان دەکرد ، وەستا عەولا هەموو کارو بارێکی دەگـرتــە ئەستــۆ ، ئەو مەلای مەولوود خوێنی بانگ دەکرد و تەنزیلە خوێن و دەفەی ئامادە دەکردو ، هەر ئەویش خەڵکەکەی بانگ هێشت دەکردو ، سەرپەرشتی چێشت لێنان و تێکردن و چاو چایەچیو چاتێکردنی دەکرد ، تەنانەت کاری تەشریفات و دانـانی خەلـکـەکـەیشی دەگـرتـە ئەستۆ ، کەسیش لە قسەو تەگـبــیری دەر نەدەچــووو ، خاوەن ئاهــەنـگ ئەرك و ماندووبوونێکی ئەو تۆی نە دەکەوتە سەرشان .

## ٥- عەولا جەیدیو ئاهەنگی ئیجازەی مەلایەتی:

جاران کۆیە مەڵبەندێکی گرنگی ئەدەب و زانیاریو ئایین بوو لە کوردستان ، لە چاو بچووکی شارەکە مزگەوتێکی زۆری هەبـوو ، هەر مزگـەوتـەش حوجـرەی مەدرەســەی خوێندنی فەقێـیـانی هەبـوو ، کاتێك موستەعیدێك خوێندنی مەلایەتی تەواو کردبـایە ، ئەوا ماموستاکەی لە ئاهەنگێکی گەورەدا کە دەستـەیەکی زۆر لە مەلاو فەقێی شارەکەو دەورو پشتی بۆ بەشداری کردن لەو ئاهەنگەدا بانگ دەکران و بەزم و شایی چەند شەو و چەند رۆژێك بەردەوام دەبوو [١٤] ، گەلێ جۆرە شایی وەکو [چەپەیی ، سووسکەیی ، ئایشوکێ ، شێخانی] دەکران ،

ئەم ئاهەنگ و چالاکییانە سەرپەرشتی و مشوورگێرانی پێدەویست و ، لە سەردەمی ژیانی وەستا عەولا جەیدیدا هیچ ئاهەنگێکی ئیجازەی مەلایەتی بەبێ سەرپەرشتی ئەو جێبەجێ نە دەکرا . ئەگەر (مەلای ئیجازە دەر) دەست ڕۆیشتوو بوایە ، ئەوا بەرگی نوێ و جوبەیەك و مەندیلێکی لە کیسەی خۆی بۆ مەلای تازە دەکری و لە دوا ڕۆژی ئاهەنگەکەدا لەبەری دەکردو هەموو خەرجی مەسرەفی زیافەتەکانیش هەر ئەو دەیکێشا ، بەڵام ئەگەر مەلای مامۆستا دەست کورت بوایە ، ئەوا عەولا جەیدی دەچووە لای چەند دەوڵەمەندێکی خێرکەر و بەبێ دەنگی پارەی پێتاکی لێوەردەگرتن و بۆی دەهێناو مەسرەفی پێدەکێشا . لە سەرخستنی ئەو ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی مەلایەتی عەولا جەیدی دەورێکی دیارو بەنرخی هەبوو .

### ٦- عەولا جەیدی و ئاهەنگی بووك گواستنەوە:-

عەولا جەیدی چەندە بە کاری دینەوە خەریك بوو ، ئەوەندەش بە کاری دنیاوە ماندوو بوو ، بەڵام ئەو کارەی کە خێری خەڵکەکەی تێدا بووبێ ،وەکو ئاهەنگی بووك گواستنەوەو ، دەیگوت : ئێمە نابێ هەر مردووان لە گۆر بنێین و دەبێ بووکانیش بگوازینەوە ، تاکو زاو زێی نوێ ببێ ، چونکە دنیا لەسەر بوون و مردن ڕاوەستاوەو ، دەبێ ژن هێنان ئەرکی زۆر نەبێو بە ئاسانی جێبەجێ بکرێت ، بۆیە هەر کەسێکی شارەکە ژنی بۆ کوری یا کەس و کارێکی هێنابایە ، ئەوا زوو بیری بۆ لای عەولا جەیدی دەچووو ، بانگی دەکرد و پرسی پێدەکرد ، ئەویش مشوورێکی باشی بۆ دەگێرا ، چونکە لەو بارەوە پسپۆرییەکی کۆمەڵایەتی باشی پەیدا کردبوو ، دەچووە سەر باوکی کچەو دەیگوت نەکەی زاوا بە مارەیی زۆر ببریەوە و لە کاتی زیافەت دا ، ئەو خەڵکەکەی بانگ دەکرد و سەرپەرشتی خواردن دابەش کردن و خوانچە دانانی دەکرد و ، تەنانەت بەزم و مەراسیمی زاوا بردنە حەمامیش هەر بە تەگبیرو سەرپەرشتیکردنی ئەو جێبەجێ دەکرا ، بە کورتی وەستا عەولا پیاوی دین و دنیا بوو ، بەڵام دینێکی پاك و دنیاییکی دوور لە تەماع و فروفێڵ .

هەبوو ، هەر مزگەوتەش حوجرەی مەدرەسەی خوێندنی فەقێیانی هەبوو ، کاتێك موستەعیدیك خوێندنی مەلایەتی تەواو کردبایە ، ئەوا مامۆستاکەی لە ئاهەنگێکی گەورەدا کە دەستەیەکی زۆر لە مەلاو فەقێی شارەکەو دەورو پشتی بۆ بەشداری کردن لەو ئاهەنگەدا بانگ دەکران و بەزم و شایی چەند شەو و چەند ڕۆژێك بەردەوام دەبوو[١٤] ، گەلێ جۆرە شایی وەکو [چەپەیی ، سووسکەیی ، ئایشۆکێ ، شێخانی] دەکران ،

ئەم ئاهەنگ و چالاکییانە سەرپەرشتی و مشوورگێرانی پێدەویست و ، لە سەردەمی ژیانی وەستا عەولا جەیدیدا هیچ ئاهەنگێکی ئیجازەی مەلایەتی بەبێ سەرپەرشتی ئەو جێبەجێ نە دەکرا . ئەگەر (مەلای ئیجازە دەر) دەست ڕۆیشتوو بوایە ، ئەوا بەرگی نوێ و جوبەیەك و مەندیلێکی لە کیسەی خۆی بۆ مەلای تازە دەکری و لە دوا ڕۆژی ئاهەنگەکەدا لەبەری دەکردو هەموو خەرجی مەسرەفی زیافەتەکانیش هەر ئەو دەیکێشا ، بەڵام ئەگەر مەلای مامۆستا دەست کورت بوایە ، ئەوا عەولا جەیدی دەچووە لای چەند دەوڵەمەندێکی خێرکەر و بەبێ دەنگی پارەی پێتاکی لێوەردەگرتن و بۆی دەهێناو مەسرەفی پێدەکێشا . لە سەرخستنی ئەو ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی مەلایەتی عەولا جەیدی دەورێکی دیارو بەنرخی هەبوو .

٦- عەولا جەیدی و ئاهەنگی بووك گواستنەوە:-

عەولا جەیدی چەندە بە کاری دینەوە خەریك بوو ، ئەوەندەش بە کاری دنیاوە ماندوو بوو ، بەڵام ئەو کارەی کە خێری خەڵکەکەی تێدا بووبێ ،وەکو ئاهەنگی بووك گواستنەوەو ، دەیگوت : ئێمە نابێ هەر مردووان لە گۆر بنێین و دەبێ بووکانیش بگوازینەوە ، تاکو زاو زێی نوێ ببێ ، چونکە دنیا لەسەر بوون و مردن ڕاوەستاوەو ، دەبێ ژن هێنان ئەرکی زۆر نەبێو بە ئاسانی جێبەجێ بکرێت ، بۆیە هەر کەسێکی شارەکە ژنی بۆ کوری یا کەس و کارێکی هێنابایە ، ئەوا زوو بیری بۆ لای عەولا جەیدی دەچووو ، بانگی دەکرد و پرسی پێدەکرد ، ئەویش مشوورێکی باشی بۆ دەگێرا ، چونکە لەو بارەوە پسپۆرییەکی کۆمەڵایەتی باشی پەیدا کردبوو ، دەچووە

سەر باوکی کچەو دەیگوت نەکەی زاوا بە مارەیی زۆر ببریەوە و
لە کاتی زیافەت دا ، ئەو خەڵکەکەی بانگ دەکرد و سەرپەرشتی
خواردن دابەش کردن و خوانچە دانانی دەکرد و ، تەنانەت بەزم
و مەراسیـمی زاوا بردنـە حەمـامیش هەر بە تەگبیرو
سەرپەرشتی‌کردنی ئەو جێبەجێ دەکرا ، بە کورتی وەستا
عەولا پیاوی دین و دنیا بوو ، بەڵام دینێکی پاك و دنیاییکی
دوور لە تەماع و فروفێڵ .

## ٧ـ عەولا جەیدی خۆش ڕۆ:-

عەولا جەیدی وەك لە وەرزش و یاریی فولکلۆریی
کوردیدا وەستاو مەشق پێکەر بوو ، لە خۆش ڕۆیی‌و ڕێگەی
دوور برینیش دا یەکجار گورج و گۆڵ و خێرا بوو ، کەس نەبووە
لە ڕۆیشتن دا لەگەڵی دەربیات ، لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ کە
لە منداڵی‌یەوە هەر خەریکی وەرزش کردن بووەو ، بە درێژایی
ژیانیشی جگەرەی نەکێشاوە ،

هەروەك دەڵێن : «جارێکیان بازرگانێکی خەڵکی مووسڵ
دێتە کۆیە ، ناوی (مەتی) دەبێ ، وەکیلی بازرگانێکی گەورەی
مووسڵ دەبێ ، مەحەڵێك لە خانی مەحموود ئاغا دەگرێ و ئەو
ساکـەش کۆیـە تەنیـا بە ڕێگـەی کاروان بە شارەکـانی تر
بەسترابوو ، وەك دەڵێن : لە سەردەمێك بوو تازە حکومەتی عیراق
دامەزرابوو ، جارێکیان تەلگرافی کۆیە خراپ دەبێ و (مەتی)
پەیوەندیی لەگەڵ مووسڵ دەپچڕێ و ڕادەسپێرێ یەکێکی خۆش
ڕۆی بۆ پەیدابکەن ، تاکو نامەیەکی بۆ بباتە مووسڵ بۆ ئەوەی
لە نرخی نوێی خوری و مازوو بگـات و وەڵامـەکـەیشی بە
ماوەیەکی کەم بۆ بهێنێتەوە بازرگانەکانی کۆیەش عەولا جەیدی
بۆ دێنن ، مەتی باوەڕ ناکـات ئەو پیـاوە خرکـەڵە وردیلەیـە
بتوانێ لە ماوەیێکی کەمتر لە شەوو ڕۆژێك بگاتە شاری مووسڵ
کەچی وەستـا عەولای خۆمـان پێی دەڵێ تۆ هیـچ کرێیەکم
پێمەدە تاکوو وەڵامت بۆ نەهێنمەوە !!

ئینجا نامەکەی لێوەردەگرێ و بە سووکی بۆی دەردەچێ
و بە پیـادە ڕێی قەدبر ، ڕێگەی هەولێر و لە وێوەش ڕێگەی
مووسڵ دەگرێتەبەرو ، بە دوو ڕووژی هاوین و شەوێك نامەکە
دەبـاتـە مووسڵ و وەڵامەکەیشی دەهێنێتەوە کۆیەو ، دەیداتە
(مـەتـی)ی بازرگـان و ئەمـیش سەری سوڕدەمـێـنـێ لەو
خێرایی‌یەی کە چۆن ئەو ڕێگە دوورەی بە چوون و هاتنەوەی
٣٠٠ کیلومەتر پترە تەنیا بە دوو ڕۆژ و شەوێك بریویەتی و .
هەڵدەستێ هەقی مانـدووەتی ڕێگـەی بە زێدەوە دەداتێ
ئەوەی شیـاوی باسیشـە ئەمـڕۆ وەستـا حەمەدی کوری کە
ناودارتـرین کەوبـازو ڕاوچی کۆیەیە ، لە ڕۆیشتن و ڕێگەی
ڕاودا لە هەموو کەسێکی تر خێراترەو کەس لەگەڵی دەرنابات .

**هەندێ کردارو چالاکیی جیا جیای عەولا جەیدی :**

١ـ دەڵێن کابـرایـەکی دراوسێی ماڵی وەستـا عەولا لەگـەڵ
ژنەکەی خۆی ناخۆشییان دەبێ ، لەسەر ئەوەی کە ژنەکەی ماڵی
بەجێهێشتووەو چووەتە سەردانی ژنە دراوسێیەکی . کە وەستا
بەمـە دەزانێ لە کابـراو ژنە دەچێتە ژوورەوە و هەوڵێکی زۆر
دەدا کابرا لە ژنەکەی خۆش بێ‌و ڕێك بکەونەوە ، کەچی کابرا
نایـەتـە ڕایـە . ئینجا وەستا دەستی کابرا دەگرێ و دەیباتە
ژوورێك و لەپڕ دەرگای لەسەر کلیل دەدات و ، پێی دەڵێ : «دە
باشە تۆ لە ژوورەوە بە ، بزانە خۆشە یان نەء ؟» . تاکو ئێوارە
بەنـدی دەکـات ، ئینجـا کابـرا هاوار دەکات و دەڵێ «وەستا
پەشیمـانم ، جارێکی تر سەرکۆنەی ژنەکەم لەسەر چوونەدەر
ناکەم» . وەستاش دەرگای لێدەکاتەوە و پێی دەڵێ : «کوری
بابم ئێستا بۆت دەرکەوت کە ژنەکەت هەقیەتی گەر ناو بە ناو
سەردانی ژنـەدراوسێیـەکی بکـات و ، هەر بە تەنیا لە کونی
ژوورەوە دانەنیشێ»[١٧] .

٢ـ وەستا عەولا لە مەیدانی سەرێی بازاری کۆیە دوکانێکی
قشتیلەی چەقوگەرێتی هەبوو ، هەمیشە حەزی دەکرد خەڵکی
بازار لە شادیدا بن ، ڕۆژ نەبوو گاڵتەو بەزم و سوحبەتێکی
لەگـەڵ دوکاندارێکی دراوسێی نەکردبێ و خەڵکی بازاری لە
خۆی کۆنـەکـردبێتـەوە ، جاری وابـووە ، بە گاڵتـە لەگـەڵ
دواکاندارێکی دۆستیدا بە دەمەقاڵ هاتوون و قسەی سەیر
سەیـریان بە یەکتری گوتووەو ، ئەوانەی کە بە لایان دا ڕەت
بوون و گوێیـان لە قسەکانیان بووە ، نەیان زانیوە ئەو دوو
کەسە شەڕدەکەن یا سوحبەت ؟ ئەو قسانەیان بە ڕاستی‌یە یان
بە گاڵتە ، زۆر جار بووە خەڵکی شارێکی تر کە بە لایانەوە ڕەت

بوون و چاویـان بەم بەزمـەکـەتووە ، وایان زانیوە شەڕی بە ڕاستی‌یـە کەچی کە لە هەنـدێ کەسیان بیستووە ئەمە شەڕ نی‌یـەو تەنیـا گاڵتـەو سوحبـەت کردنە ، سەریان لەم بەزمە سوڕماوە و گوتوومیانە بەخوا [سەیرە لە کۆیە !!]

٣ـ دەڵێن : زۆر جار وەستا عەوڵا لەسەر دوکانەکەیەوە چاوی لە دۆستێکی بادەداو ، هەردووکیـان دەهـاتن بە گاڵتـە لەبـەر دوکانەکەی یەخەی یەکتریان دەگرت و قسەیەك لەم و قسەیەك لەو ، خەڵکی تر کە بەلایان دا تێ‌دەپەڕین ، وایان دەزانی ئەوە شەڕی بەڕاستی‌یـەو یەکێکیـان دەکەوتە نێوانیانەوەو ناوبژی دەکردن ، ئینجا لەو کاتەدا بە هەردووکیان تێرو پڕیان لە کابرای ناوبـژی‌کـەر دەداو ، دەیـان دا لە قاقای پێکەنین و ، ئینجا هەڵدەستان بە هەردووکیان دڵی کابرایان دەدایەوەو دەیان گوت: ئەمە شەڕنی‌یەو ، گاڵتەو سوحبەتی خۆمانەو تۆ بۆ خۆت خستە ناومان ؟! بێگومان ئەم بەزمەی وەستا عەوڵاش هەر بۆ ئەوەی بووە ، تاکـو خەڵکی بازار بێنێتـە پێکـەنـین و غەمی دڵیـان برەوێنێتەوە .

٤ـ وەستا نەصروڵڵا چەخماخساز [ کۆیە: ١٩١٠] گێڕایەوە و گوتی :ـ ڕۆژێکی هاوین ناو بازار کش ومات بوو ، وەستا عەوڵا لەسەر دوکانەکەی خەریکی ئیش کردن بوو یەکێ لە دوکاندارە دراوسێ‌یەکانی گوتی :« وەستا ئەمڕۆ بازارمان زۆر خامۆشە ، بزانە قەت بەزم و سوحبەتێك ناخولقێنی ! هەر کە کابرا ئەمەی گوت ، وەستا عەوڵا هەڵساو هاتە بەر دوکانەکەی و ، لەو کاتەدا ، کابـرایێکی لادێی ڕەت دەبـوو و ، لوولە قامیشێکی جگـەرەو هەندێ شمەکی تری لەبن هەنگڵ بوو ، وەستا توند باوەشی لە کابرا وەردێنی‌و هاوار دەکات و دەڵێ :« گرتم ، دزم گرت ، ئەم شمـەکانەی لای ئەم پیاوە هی منن و لێی دزیوم !!» کابرای لادێی دەڵێ : « نەخـێر هی خۆمن و ، لەلای فلانـە دوکاندار کریـومن » ، بەڵام خەڵکەکە بۆ ئەوەی بەزمەکە گەورەتر بێ ، هەموویان دەڵێن « کابرا ئێمە شایەدین کە ئەم شمەکانەی لای تۆ هی وەستا عەوڵان» ، کابرا هەر سوێند دەخوات و دەڵێ :« بەخـوا هی خۆمن و نەم دزیـوە !» تاکو لە ئەنجام دا دەگاتە ئێسکی‌و خەنجەرەکەی هەڵدەکێشی‌و دەڵێ : « بەخوا ئەگەر بەرەم نەدەی بەم خەنجـەرە دەتکـوژم !» کە خەڵکـەکە دەبینن کار گەیشتە خەنجەر یەکێکیان هاوار دەکات و دەڵێ :« وەستا بەری دە ، من تازە وا لە پۆلیسخانە دێمەوە ، دزەکەی بەڕاستی‌یان گرتـووە و برۆ شمـەکەکانت وەرگرەوە » ، ئینجا وەستا بەری دەدات و کابراش خەنجەرەکەی دەخاتەوە کالانی و شمەکەکانی هەڵدەگرێ‌و بەبێ ئاوردانەوە بۆی دەردەچێ ، کە کابراکە ئاوا دەبێ ، خەڵکی بازار دەڵێن : « هەر خۆش بی وەستـا لەگـەڵ بەزمی گێرات !»

لەیـەکێکی دیکـەم بیستـووە و دەیگـوت کە ئەو کابـرایـە چووەتـەوە دێ یەکـەی ئەم بەسـەرهـاتـەی بۆ خەڵکـەکـە گێڕاوەتەوەکە وەستایێك لە مەیدانی سەرێی بازاری کۆیە ئەو گۆبـەندەی لە دژی گێڕاوە ئەوانیش پێ‌یان ووتوە ئەوە وەستا عەوڵا جەیـدی بووە و سوحبـەتی لەگـەڵ دا کردووی ، دەنا پیاوێکی تا بڵێی بەدین و خێر خوایە » کابراش گوتوویەتی : « بەخـوای ئەگـەر مەلائیکـەتیش بوایـەو بەری نەدابام ، بە قوربانی خەنجەرێکم دەکرد !!» .

٥ـ دەڵێن وەستـا عەوڵا لە ئەنجـامی نەخـۆشی‌یەك دا ، زێدە گۆشتێکی لە ئاستی قونچکی چاوی بەلای کوڵی‌یەوە پەیدابوو بوو ، کونێکی تا دیـاری تێـدا بوو ، جارێکیـان لەبـەردەم دوکـانـەکـەیدا دەروێشێك زەرگێك لە لا گوپی خۆی دەدا و خەڵکێکی زۆری تێ دەئاڵێو ، وەستا عەوڵاش باوەری بەشتی وەهـا نابێ ، هەڵدەسێ لەسەرە خۆ شیشێکی سپی‌و باریك بە کونەکەی لاچاوی دا دەکات و بەدوای کابرای دەروێشی غەریب دەکەوێ ، دەرویش کە ئەمە لە وەستا عەوڵا دەبینێ ، وا تێ دەگات زەرگی لە چاوی خۆی داوە و زۆری لێ دەترسێ و لەبەری را دەکـات و [١٨] و لەدڵی خۆی دا دەڵێ :« وا دیارە ئەمە لەمن دەروێشترە ، شێخەکەیشی لە شێخی من گەورەترو بەهێزترە »، خەڵکەکەی دەروپشتی لە نهێنی‌یەکەی وەستا عەوڵا دەگەن و هەموویان دەدەنە قاقای پێکەنین .

## دواوشە:

عەوڵا جەیدی پیاوێکی کاسبکاری هەژاری نە خوێندەوار بوو ، کەچی ڕێـزو پایـەی هەر لەناو خەڵکە هەژارەکە بەرز نەبوو ،

بەڵکو لەناو دەوڵەمەند و مەلا و شێخانیش دا ڕێز و ڕووەتێکی زۆری هەبوو ، چونکە هەر کارو کردەوەیەکی دەیکرد بۆ سوودی گشتی‌ی خەڵکەکە بوو ، کاتێك بەناو بازاڕی کۆیەدا دەگەڕا هەموو دوکاندارەکان بە بەقاڵ و عەتار و قەساب و بازرگانەوە ڕێزێکی تایبەتی‌یان لێ دەناو هەر پێشنیارێکی کردبایە و هەر داوایێکی هەبایە بۆیان جێ بە جێ دەکردو ، هەر شەڕو دەمەقاڵێیەك لە نێوان دوو کەسی ناو بازاڕدا ببوایە ، عەوڵا جەیدی دەگەیشتە سەریان و کە بەدیار دەکەوت دەیان گوت : بێ دەنگ بن و واز بێنن عەوڵا جەیدی‌و مردنتان لەبیربێ زوو بەم قسەیە وازیان لە شەڕو ناخۆشی دەهێناو بە هۆی وەستا عەوڵاوە مردنیان دەهاتەوە بیر وەك بڵێی عەوڵا جەیدی وەکاڵەتی مردنی هەبوو بێ !!

وەستا عەولا نەك هەر لە بازاڕدا ئەو نرخ و ڕێزەی بووە ، بەڵکو لە دیوەخانی ئاغاو بازرگانە چەلەبی‌یەکانی ئەو شارەش ڕێزو پایەیێکی دیاری هەبووە ، لەناو کۆڕی یەند و وەعزی مەلا ناودارەکانی کۆیەی وەکو مەلای گەورەو مەلا بەهائوددین و مەلا صادقی مەلا ئەحمەد و مەلا عەلی باداوەیی و مەلا مەعسوومی خدر هەورامی شوێنێکی دیاری بووەو ، خۆ لەناو کۆڕ و کۆمەڵی هەژارانیش دا ، هەر مەپرسە کە چەندە ڕوح سووك و خۆشەویست بوو ، لەناو هەموو چین و توێژێکی خەڵکەکەی ئەو شارەی کۆیەو دەوروپشتی بەڕێزو بە حورمەت بوو ، هەموو قسەو داواکانی پەسەند بوون و جێ بە جێ دەکران ، چونکە بۆ سوودی هەموو کەسێکی شارەکەو ناوچەکە بوو ، هەزار سڵاو لە گیانی پاکی وەستا عەوڵا جەیدی ڕەند و ڕووخۆش و مشوور گێڕی کاروباری خەڵك و گۆڕ هەڵکەنی خێر خواو خزمەتگوزاری میللەت ، لەیادی ٤٤ ساڵەی کۆچی دوایی و ١١٩ ساڵەی لە دایك بوونی دا .

## سەرچاوەو پەراوێز:

١ـ كاك فاضل شەورۆ ، لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/١ دا نامەکەی بۆ نووسیوم و ئەویش جگە لە زانیاری‌یەکانی نەنکی و وەستا حەمەدی باوکی ، پشتی بە هەندێ زانیاری‌و بیرەوەری برایان : وەستا نەصروڵڵای چەخماخساز حەمیدی تایەر حەبۆڵی بەستووە .

٢ـ لە تۆماری بیرەوەری‌یەکانی نووسەر .

٣ـ لە یادداشتەکانی مامۆستا عەبدولەجید نوردەین جەلی زادە [ کۆیە : ١٩١٢] .

٤ـ حاجی محێدین ئەسعەد ـ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ـ ژمارە (١٠٨) ساڵی ١٩٨٥ ، ل : ٨٢ .

٥ـ طاهر احمد حويزي ـ مێژووی کۆیە ـ ب ١ ، بەغدا ١٩٦٢ ، ل : ٢٠ ، ٢١ .

٦ـ لە یاد داشتەکانی مامۆستا عەبدولەجید نووردەین جەلی زادە .

٧ـ لە بیرەوەری‌یەکانی کاك ئەحمەد خدر ئەحمەد [ فەرمانبەری خانەنشین ، کۆیە : ١٩٢٤]

٨ـ نامەکەی کاك فاضل شەورۆ.

٩ـ لە بیرەوەری‌یەکانی کاك ئەحمەد خدر ئەحمەد .

١٠ـ حاجی محی الدین ئەسعەد ـ ڕۆشنبیری نوێ ـ ژمارە (١٠٨) بەغدا ١٠٨ ، ل : ٨٢.

١١ـ نامەکەی کاك فاضل شەورۆ.

١٢ـ هەمان سەرچاوە.

١٣ـ لە یاد داشتەکانی مامۆستا عەبدولەجید نورەدین جەلی زادە.

١٤ـ لە تۆماری بیرەوەریەکانی نووسەر.

١٥ـ بۆ پتر شارەزا بوون لە دابودەستووری ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتن ـ بنوارە باسێکی مامۆستا عەزیزی مەلای ڕەش لە گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ ) ژمارە ١١٠ ی ساڵی ١٩٨٦، ل : ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦.

١٦ـ لە بیرەوەری‌یەکانی وەستا حەمە ی کوری خوا لێ خۆش بوو.

١٧ـ نامەکەی کاك فاضل شەورۆ.

١٨ـ لە بیرەوەری‌یەکانی کاك ئەحمەد خدر ئەحمەد [ فەرمانبەری خانەنشین] .



# ئەدیب و نووسەری لەبیرچوو

## جیمۆبێ ناو
## ١٩١٠ - ١٩٨٢

مصطفی نەریمان

نزیکەی سەد ساڵێك لەمەوپێش شێخ عمری ضیاء الدین لەبیارەوە بەرەو بەغداد ئەچێت . لەرێگە لەو شارانەی لای دابوو وەك (کفری . خانەقی . قزرابات) ئەمر ئەکات سەرو خانەقایەك دروست ئەکەن . لە کفری (مەجیدپاشای بابان) پارچە ئەرزێکی خۆی ئەبەخشێت و دانیشتوانی شاریش بەبار بۆ خانەقایەکی پوختە دروست ئەکەن . کە شێخ لەو سەردەوە پاش سەفەرە درێژخایەنەکەی ئەگەڕێتەوە ئەبینێت وا خانانەقاکە دروستکرا ـە . زۆری پێ خۆش ئەبێت . شێخ (نظام الدین)ی کوڕی و مەلائەحمەدی باوەرپێکراوی ا... دائەنێت . ئەوەبو مفتی ئەو سەردەمەی کفری (اسماعیل أفندی محمود) کچەکەی ... لە شێخ نظام الدین مارە ئەکات و ئەمیش شیخ خالدی ئەبێت . مەلائەحمەدیش لەکفری ژن ئەهێنێ (ابراهیم)ی ئەبێت کەبوو بە (مەلاوحاجی) بە (حاجی مەلا برایم) شۆرەتی وەرگرت و بووبە پێش نوێژی هەمان خانەقا مێژوی دروستکردنی خانەقا ساڵی ١٣٠٧ی کۆچی یەو ئەو مێژووە لەسەر بەردە مەرمەڕەکەی سەر دەرگاکەی هەڵکەندراوە .

لەحاجی مەلابرایمیشەوە مەلاجەمیل ئەبێت و ئەچێتە بەر خوێندن و زانستێکی باش وەرئەگرێ و بە (جەمیلی حاجی برایم) ناوبانگ دەرئەکات . لەسی یەکانەوە ئاشنایەتی و هام شەهری و برادەریم لەگەڵ مەلا جەمیلدا هەبوو کتێبمان لەنێواندا ئەگۆڕایەوە لە ئەدەب و مێژوو فەلسەفە دەستێکی درێژی هەبوو عەرەبی . تورکی فارسی و هەندێکیش ئنگلیزی دەزانی لە سلێمانی و کەرکوك و کفری مەلایەتی کردوەو خارجی مەلابەتیش فەرمانبەری لەدایەرەی نەوتدا کردووە . مەلاجەمیل زۆر چالاك و زیرەگ و بەتوانا بووە . کتێب و رۆژنامەو گۆڤارە کوردی یەکانی ئەخوێندەوە لەچلەکاندا نوسینی لە گۆڤاری (گەلاوێژ ١٩٣٩ ١٩٤٩) بە ناونیشانی (جیمۆبێ ناو) بڵاوکردوەتەوە . وەك ئەو نوسنیەی کەوا لەژمارە(٥) ساڵی ١٩٤٤ دا بە ناونیشانی (کۆمەڵی پێشو) بڵاوکردوەتەوە تیادا ئەڵێت (لە کۆمەڵی بە شەردا کۆمەڵی عائلە لەهەموکۆنترو طبیعی ترە . هەر لەم وێنەیەدا منداڵەکانیش لەبۆ پارێزگاری ژیانیان تاوەکو پێویستی یان بێت بە باوکیانەوە بەستراون . هەر لەکاتێکا ئەم پێویستی یەیان نەما جیا ئەبنەوە . جا ئەو وەختە هەروەکو منداڵ بە سەربەستی فکری خۆی رەفتار ئەکا باوکیشی لە چاوێری کوڕەکەی رزگار ئەبێ چ باوك چ کوڕ هەر یەکە بۆ خۆیان رەفتارێك ئەگرن ئەگەر هاتو جیا نەبوونەوە ئەویش دیسان شتێکی طبیعی نی یە بە بەئارەزوی خۆیانە ....) .

(جیمۆبێ ناو) ئەم نوسینەی بەپارچە شیعرێك دوای ئەهێنێت ئەمەش چ نموونەیەکیتی :

**گەر نەکەی دەرمانی دەردت تۆبزانە ئەی خومار :**
**زۆر بە دەستی دینو پێ بەندت ئەکا ئەنجامی کار**
**تۆبە نەکۆر ئەو بە ئاغا . تۆ حەماڵ و ئەو توجار :**
**هەر بڵێ (بەختم رەشە جاچی بکەم) ئەی شەرمەسار**

* * *

**هەڵدرە بەرگی نێکاری. مەستی بەسیە دەردەدار :**
**مەستی زانین بە بەبڕهۆش وەرە مەیدانی کار**
**مردنی خۆشت لەبۆ ئەم نیشمانە بێتە کار:**
**راپەرە وەك (جیمۆبێ ناو)مەگرە تۆ دەرکی کەنار**

هەر وەها جیمۆبێ ناو بە ناونیشانی (بەربەرەکانی ژیان) لەژمارە (١٢ ساڵی ١٩٤٣دای گۆڤاری (گەلاوێژ)دا نوسینێکی بڵاوکردوەتەوەو شیعرانە کۆتایی پێ هێناوە :

**بۆ فرێدە بەرگی بێکاری بڵێ وا هەڵدەسم :**
**دەسد ەشمێری مەعارف پەیکە دوژمن سەر بەسەر**
**گەر بمێنێ هەر لە تاریکی نەزاندن وەکو کوێر :**
**چەندە چاڵت بۆ دەکەن گەر تێکەوی نایەیتە دەر**
**حەز دەکەم زۆر من ببینم شیوەی خۆباشی تو :**
**تیشکی زانستت بکاتن دوژمنانت کوێرو کەر**
**جا دەبینی (جیمۆبێ ناو) خۆی لەپێش گشت کەسێ :**

سینەکەی بۆ تیری دوژمن دائەنێتن وەك سوپەر جەمیلی حاجی ؛ (جیمۆبێ ناو)لەپەنجاکاندا بەمەلایەتی نەقلێ سلێمانی کرا . لەوێ بەجارێك سەرم لێ ئەداو هانم ئەدایە سەرنووسین . بینیم چەند کتێبێ مێژوی بە دەستەوەیە لەوانە مێژوی (شەری ئەهلی صەلیب) ئەوەند پێ نەچوو توانی بەرگی یەکەمی ئەوکتێبە لە ساڵی ١٩٥٩ لەچاپ بد

کتێبەکە بریتی‌یە لە (١٦٨) لاپەرەو بەناونیشانی (مێژوی) شەری ئەهلی صەلیبو قارەمانی کورد صلاح الدین ئەیوبی) دانەری (محمد جمیل نعمانی)مدرسی مزگەوتی (علی نظامی) .

دوای ئەوەی (مەلاجەلالی‌مەلائەحمەد) کتێبە کە پێشکەش ئەکات شاعیری بەناوبانگ (کامەران) ئەم‌چوارینەی لەسەر نوسیوە:

**بۆ کورد بەرزی‌یە صلاح الدینی**
**بوو بە سەرکردەی لەشکری خەبات**
**نەك هەر بۆ کوردو خاکی شیرینی**
**(بۆ هەمو گەل‌و خاکی رۆژ هەڵات)**

ئنجا مەلا (محمد جمیل عوثمانی - جیمۆیی‌ناو) بەم پێشەکیە کتێبەکەمان پێ ئەناسێنێت کە تیادا ئەڵێت : (لەخوێندەواران نەشاراوەتەوە ئەوروپا لەپێش جەنگی صەلیبی تەواو نەزان بوون . لە کاروباری زانایی جەنگو پیشەسازی‌و هەڵسورانی کاروباری دەوڵەتو لەهەموو زانایی‌یەکی عەقڵی‌و عەمەلی بێ بەش بوون روناکی هیچ چەشنە زانستی‌یەك نەکەوتە ئەوروپاوە تاوەکو تێکەڵ ئیسلامەکان نەبوون — بە بونەی جەنگی صەلیبی‌یەوە . ئەم وتارەم وەنەبێ لە گیرفانی خۆمەوە دەرهێناوە بەڵکو هەموو مێژوو زاناکانی ئەوروپا وتویانەو پێی لێ‌ئەنێن‌و ئەنێن‌و لەنوسراوە مێژوویی‌یەکانیانا باسی جەنگی صەلیبی هاتوە سەرەتای باسەوە وتویانە جەنگی صەلیبی هەرچەندە زۆر بە گران نشتە سەر ئەوروپا هەرچەندە گیانو ماڵێکی زۆری تیا فەتارەت چوو بە بێ ئەوەی بە ئامانج بگا بە بێ ئەوەی لە خاکی ئیسلام بستێ داگیر بکات کەڵکێکی زۆری بوو . چونکە ئەوروپا بە بۆنەی ئەم جەنگەوە تێکەڵ موسوڵمانەکان بوون‌و لەوانەوە فێری پیشەسازی‌و بازرگانی‌و کشت‌و کاڵ‌و هەموو چەشنە زانستی رەوشتی باش بوون‌و لەم بابەتەوە دەسیان کرد بە نووسینەوەی‌هەموو خویەکی خراپیان وەکو کراسە کۆن لەبەر داکەن‌و فرێیان‌داو گۆری‌یان بە رەوشتی باش وفێری هەموو چەشنە زانستی‌یەك بوون. ئەوروپا هەربەم چەشنە وڵاتی ئەندلس بووبە چرای دیوی رۆژ ئاوای ئەم دیوەی ئەوروپا لەئەندەلسی ئیسلامی چەشنە زانستی‌یەکی پەنهانی ئەوتۆیان چنگ کەوت کە هێشتا مەلۆتکە بوو بە بۆنەی شەرو شۆری ناوخۆوە دەرنەکەوتبو بڵاو نەبوەوە کە وەختێك گەیشتە ئەوروپا لە کاتێکی زۆر کەم بوو بە لاوێکی دەست‌و بازوو ئەستورو بوو بە هێزێکی ئەوتۆ جیهانی هێنایە لەرزە)

محمد جمیل عثمانی لەکتێبەکەیدا بەدوورودرێژی باسی پەیدا بوونی ئەهلی صەلیبو کاروانەکانیان بەرەو رۆژهەڵاتو داگیرکردنی شاری (قودس)و تا رزگارکردنی بەهۆی قارەمانێتی (صلاح الدین ئەیوبی)یەوە بەدورو درێژی‌و بە خەست‌و خوڵی تیادایە .

لەم لاو لەو لاوە هەندێك لەنوسەرانی غەیرە کورد ویستویانە (صلاح الدین ئەیوبی) نە کوردێتی دەربکەن لەم دوایی‌یەدا مەلایەکی سامەرانی لەبەغداد لە نامیکلەیەکدا نەك هەر صلاح الدین بەڵکو زوربەی نبەماڵە کوردەکانیشی بۆ خۆی برد بوو لەکاتی خوێندا وەڵامی درایەوە . لەناو خوشماندا برێك لە رۆشنبیرانمان ئەڵێن جا صلاح الدین چی بۆئێمە کردوە ؟ ئەوە نازانن کە لەو سەردەمە هەستی نەتەوایەتی نەبوە. ئاینی مۆسوڵمانێتی پاڵی بە صلاح الدینەوە ناوە کەموسوڵمانە کان لەژێر بەیداخی خۆیدا کۆبکاتەوەو دوژمنی داگیرکەری پێ دەربکات ، لەکاتی بیرەوەری چل ساڵەی مێژوونوسی بەناوبانگ محمدئەمین زەکی بەگ کە لەرۆژی ١٩٨٨/٧/٩ لەسلێمانی گیرا هەمان ووتەووت سەری هەڵدا . ئەوەبو (د - عزالدین مصطفی رەسوڵ)شێرانە هەستاو لەناو ئەو هۆڵەدا دەنگی بەرزکردەوەو ووتی (بۆ ئێمە شانازی‌یە لەو سەردەمەدا صلاح‌الدینێکمان لێ هەڵکەوت بەربەستی لێشاوی داگیرکەران بگری‌و نەیەڵی لەکەناری دەریا بەملاوە پێ دابنێن) .

بابزانین (جیمۆیی‌ناو)ی لەمەر خۆمان چ بەڵگەیەکی بۆ کورد بوونی (صلاح الدین)ی هێناوەتەوە . لەلاپەرە (٣٩)ی کتێبەکەیدا ئەڵێت :

(... هەموو مێژوە باوەرپێکراوەکان دانیان بە کوردێتی ئەم زاتەدا ناوە . وەك تأریخی (الکامل) کە هی (ابن الاثیر)ە کە خۆی حازری شەرەکانی صلاح الدین بوە لەگەڵ فەرەنگدا . (أبو الفدا) سلطانی شاری حەما خۆی لەنەتەوەی صلاح الدینە ئەویش لەتألیفەکەی - المختصر في أحوال البشر - نەسەبی صلاح الدینی بەکورد دەربریوە کاتبی بە ناوبانگی تورك - نامق کمال - لە کتێبی - أوراق پریشان - اعترافی بە کوردێتی ئەم زاتەکردوە جگە لەمانە شاهیدی بە قوەترمان هەیە :

١- باپیری صلاح الدین ناوی (شادی)یە ئەمە کەلیمەیەکی کوردی‌یە

٢- مامی صلاح الدین ناوی (شێرکۆ) یانی (شێری کێو) دوو کلیمەی کوردی‌یە .

٣ (اعتمادی صلاح الدین بەسەربازە کوردەکان بووە ...)

ئەمەبوو چەند لاپەرەیەك لەسەر یەکێك لە ئەدیبو نووسەرانی کفری‌و دەوروپشتی نووسی کە تا ئێستا هیچی لەسەر نەنوسراوەو خەریك بوو ناویشی بکوژێتەوە .






# زانای گەورە تۆفیق وەهبی

## یادی پێنج ساڵەی کۆچی دوایی



تۆفیق وەهبی
لە ساڵی ١٩٥٦

مارف خەزنەدار

**پێشەکی**

لەرۆژگارێك دا سەردەمی لاوێتیم بەخۆمەوە دی، بیرو رای دەروون و مێشك سرکەری وا لە ناوەوەبوو هەر چەندە ئێستا ئەو کاتەم دێتەوە یاد خۆم بە خۆم پێ‌دەکەنم. ئێمە وامان دەزانی ئەوەی وەکو ئێمە بیرنەکاتەوە ئادەمیزادێکە تەواو نی‌یە، کەموکووری‌ی هەیە: خۆمان ماندوو نەدەکرد، وورد نەدەبووینەوە، بە قووڵی سەرنجمان نەدەدا یە رووداو، نەمان دەویست بیر لەماوەی نێوان ئادەمزادی نیاندرتاڵ (چل و پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا)و پەیدابوونی کارل مارکس بکەینەوە، پرسیارمان لەخۆمان نەدەکرد ئایا لەم ماوەیەدا سڤیلیزاسیۆن هەبوو یا نا!؟ کوردایەتیمان لەگەڵ هەڵسوکەوتی رۆژگارو سەردەم رێك نەدەکەوت، بەڵام وێنەی لە دڵ و دەروونمان دا نەخشی کێشابوو و نەدەچووەوە.

زۆربەی خەڵکەکە لە دژی ئینگلیز بوو، چونکە هەندێك تورکی عوسمانی‌یان خۆش دەویست، ئینگلیزو تورکیش رێك نەبوون، برێکیش ئەڵەمانیان خۆش دەویست چونکە لە دژی ئینگلیز بوو. لەپاش جەنگی دووەمەوە پێوانەو ترازوو گۆررا، یا دەبوو ئینگلیزت خۆش بوێ، یاسۆڤیەت (رووس). ئەگەر لاتەریکیش بوویتایە، ئەوا هیچ حسێبێکت بۆ نەدەکرا، هەر کەسێکیش بیویستایە و نەیویستایە بەپێی هەڵویست و خووو رەووشت و بیرو باوەری رۆژانەی، یا بە ئینگلیز پەرست دەژمێررا یا بە سۆڤیەت پەرست، لە دووایی‌دا ئەمەریکا بوو بە هاوبەش یا جێگری ئینگلیز. ئیتر دوو زاراوەی «کۆنەپەرست = رجعی» و «پێشکەوتنخواز = تقدمی» کەوتە ناوەوە. کاری هەرە قورسیش دۆزینەوەی بابایێك بوو کە لە یەکێ لەمانە نەبێ!

لەپاش ئازاد بوونم لەبەندیخانە، لە ناوەراستی تەمووزی ١٩٤٩، کەوتمە هێنانەدی هەموو ئەو ئەنجامە راستی‌یانەی گەیشبوومێ بۆ دیاری‌کردنی هەڵوێستم لە ژیان دا لەرووی کارکردن لەناو پارتی‌و رێکخراوێك یا لە دەرەوەی ئەمانە، تا پلەیێك خۆم ناسی‌یەوە، یا خۆم دۆزی‌یەوە. دەبێ بۆ راستیش ئەوە بڵێم ئەو ماوە کەمەی کە بەتەواوی بریتی‌یە لە دوو مانگ و بیست و یەك رۆژی دەرەوەی بەندیخانەو شەش مانگی ناو بەندیخانە رۆژگارێکی نائاسایی بوو لە ژیانم دا. چەپ رەوی‌یێکی نامەنتیقی‌یانە بوو، نە لەگەڵ بیرو باوەری قووڵ و داهێنان رێك دەکەوت و نە بۆ رەووشت و و ژیانی رۆژانەشم دەستی دەدا. هەر لەو سەردەمە هەرزەیی‌یەدا بۆم دەرکەوت، کە ناتووانم بیرو هۆش و مێشکم بدەم بە هیچ کەسێك. ئیتر ئازایانە ئەگەر گەورەو مەزنێکی وەکو تۆفیق وەهبی بیووتایە:

مارف! دەمووت: بەڵێ!

چاوو گوێی دەسەڵاتی ئەو سەردەمە، زۆرباش دەیانزانی یەکێکی وەك من جڵەوی ئەسپی بەدەست خۆیەتی‌و لەناو هیچ رێکخراوێك دا نی‌یە، بەڵام ترسی زۆری ئەو دەسەڵاتە لەبیرو باوەری کوردایەتی بوو، کەچی چەپ رەوەکان بەهەڵە وایان دەردەبری کە ترس تەنیا لە «سوسیالیزم» ە و



توفیق وەهبی لەگەڵ کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیرانی کورد لە یانەی سەرکەوتنی کوردان لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٦

«کوردایەتی» لەناو خۆیدا تواندوتەوە . ئیتر دەسەلات بۆ بەربەرەکانی‌ی گیانی کوردایەتی خوێندەواری کوردی بەناوی هەڵگری «ئیدیۆلۆجی سوسیالیزمی» تاوانبار دەکرد. من لە رۆژنامەی [هەولێر = أربیل» لەسەر ئەدەبی کوردی‌و خوێندەواری‌ی کوردم دەنووسی، ئەمە بووە هۆی توورەیی هەندێ لە هەتیوەکانی دەسەلاتی عوسمانی رزیوو چەند بێگانەیێکی دوور لە کۆمەڵی هەولێر. وا بوو وەزیفە بچوکەکەی کارگێری‌ی زانیاریم گوێزرایەوە شاری کووت لە خوارووی عیراق. بێ گومان ئەگەر مانم بگرتایەو بەرەو کووت نەچوومایە، لەوەزیفەی میری دوور دەخرامەوەو هەر کووتیش دەبوو بە مەڵبەندی تازەی ئاوارەییم بەفەرمانی دەسەلات .

ساڵێکی تەواو لە کووت ژیانم بردەسەر، بەلام هەستم بە ئاوارەیی نەدەکرد. رەفیق حیلمی کارگێری زانیاری بوو لە شاری عەمارە، پەیتا پەیتا تەلەفۆنی بۆ کاربەدەستانی کووت دەکرد کە ئاگایان لێم بێ لەنامە جوانەکانی جەمیلی رۆژبەیانی بێ بەش نەبووم، ئابوونەی «ژین»م هەبوو گۆران بۆی رەوانە دەکردم، نووری سدیق شاوێس و ناهیدە شێخ سەلام لەوێ بوون و یەکتریمان دەدی، پارەم بە پۆستە بۆ کرینی کتێبی کوردی دەنارده بەغدا، بەم جۆرە مێژووی ئەدەبی کوردیم چنگ کەوت، لە پاشانا کە عەلائەدین سەجادیم ناسی ووتی : ئەوە یەك بەپۆستە پارەم بۆ بێ‌و داوای کتێبم لێ بکرێ .

نامەکانی جەمیلی رۆژبەیانی کە بۆ کووت بۆی رەوانە دەکردم زیاتر ئەومیان بۆ روون دەکردمەوە کە توفیق وەهبی چەند جارێك لەمنی پرسیوە، لەرێی ئەو ووتارانەی بە کوردی‌و عەرەبی لە رۆژنامەی «هەولێر» بلاوم دەکردنەوە منی ناسیوەو نووسینەکانمی بە دڵ بووە، لەبەر ئەوە بە کوڵ ئارەزوو دەکا چاوی پێم بکەوێ .

بەم جۆرە بەغدا تەنیا لەبەر خوێندنی زانستگا نەبوو بە پەرستگا بۆ من، بەڵکو رۆژنامەگەری‌و چاپەمەنی‌و توفیق وەهبی‌و گەلێ شتی تریش، ئەمانە هەموویان لە بەغدا نەبووایە لەجێی‌تر چنگ نەدەکەوتن .

ئەگەر رەفیق حیلمی هەوڵ و تەقەلای نەدابایە، وەزیفەی میری‌یەکەم لە کووتەوە نەدەگوێزرایەوە بۆ بەغدا، بەلام وەرگرتنم لە کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدا بە کۆششی خۆم بوو.

کۆمەڵی کۆلیجی ئەدەبیات گیتی‌یێکی تازەی بۆژیانی بەغدام دروست کرد، ناسینی بەدر شاکیر سەییاب و حوسێن مەردان و عەبدولقادر رەشید ئەلناسری‌و جەواهیری‌و عەبدولرەزاق عەبدولواحید و عەبدولوەهاب بەیاتی‌و هی‌تر ئاسۆی بیریان فراوان کردم . ئەنجامی مەشقی رۆژنامەگەری لەسەر لاپەرەکانی رۆژنامەی «هەولێر» لەلاپەرەی رۆژنامە عەرەبی‌یەکانی بەغدا خۆی نواند، لەنزیکەوە شارەزایی پەیداکردن لەچاپ و چاپخانە، بەتایبەتی چاپی ئەو کتێبانەی لەلایەن منەوە سەرپەرشتی‌ی چاپیان کرابوو لەماوەی چووار ساڵ خوێندن لە کۆلیجی ئەدەبیات، ئەمە هەمووی قۆناغی گواستنەوە بوو لەژیانی من دا .

## بینینی توفیق وەهبی

بەلام لەهەمووی گرنگتر ناسینی توفیق وەهبی بوو. ئەوەی راستی بێ مووچرکێکی یەکجار نەرم و سووك بە دەروونم دا هات کە بریاری دووایم دا ئارەزووی توفیق وەهبی بینمەدی، بەوەی بچم خۆمی پێ‌بناسێنم و ببم بە قوتابی ئاشنای ماوەی ژیانی کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدام و لە پاشانا بە هاورێی هەمیشەیی، ئنجا مام و برازا وەکو خۆی دەیووت. مووچرکەکە لەبەر ئەوە بوو، چونکە توفیق وەهبی بە کۆنەپەرست (رجعی) لەلایەن هەندێ کەسەوە ناسرابوو، وەکو کەسێکی سەر بە ئینگلیز لە قەڵەم درابوو، بەلام زوو بە زوو ئەم گرێ‌یەش لە دەروونم دا کرایەوەو خۆم بە پیاو چاك و راستی‌پەرست هاتە بەر چاو، لەدووایی‌دا بۆم دەرکەوت کە کارێکی باشم کردووە، مێژووش ئەمەی روون و ئاشکرا کردەوە، ئەوانەی توفیق وەهبی‌یان بەکۆنەپەرست لە قەڵەم دەدابا درەنگتریش بێ ئەوەی من لە سەرەتای پەنجاکانا کردم ئەوان لەپاش ماوەیێکی زۆر کردیان، ئەمە جێگەی بەختیاری‌ی گیانی بوو بۆ من .



△ بەشێك لە دەستنووسە هەرە بە نرخەکانی
تۆفیق وەهبی لە نامەخانەی ماڵی وەزیریەی بەغدا

جەمیل رۆژبەیانیی ماموستاو هاوڕێو دۆستی دێرینی بنەماڵە لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٢ لە بەغدا بوو، بێگومان بەڵێنـی بەتـۆفـیـق وەهبی دابـووو پێی ووت بوو کە من گوێـزراومەتەوە بەغداو لە کۆلیجی ئەدەبیات وەرگیراووم و بە زووترین کات بە یەکتریمان دەناسێنی .

سەردەمی پاییـزی جوانی بەغـدا بوو، رۆژ تازە ئاوا بووبوو، بۆنی شەونم هەموو لایێکی گەڕەکی وەزیریەی هێمنی گوڵاوپـڕژێن کردبـوو، رووناکیی کزی بەر دەرگای باڵەخانەو پەنجەرەکان لەگەڵ ئاوازی مۆسیقای نەرم و نیان دەستیان لە مل یەکتری کردبوو و هارمۆنیاییێکی رۆمانتیکییانەیان دروست کردبوو. لە دەرگای ماڵە گەورە چووینە ژوورەوە. مام نەجمی بەسـاڵاچـووی پیاوی تۆفیق وەهبیبەگ، پۆشتەی شەرواڵ و مرادخانی، پێشوازیێکی گەرمی کردین. نەجم لەگەڵ هەموو کەسێـك دا بە کوردی قسـەی دەکـرد، لەگـەڵ ئەوەی زمانی عەرەبیشی دەزانی، بەڵام عەرەبیـیـەکـەی فۆنێتیـك ئامێزێکی کوردی بوو. دیارە ماڵەگەورە ئێمەی بە خۆیی دانابوو، لەبەر ئەوە لە دەرگـای بچـووکەوە پێشمان کەوت و ئێمەی بردە ناو ژووری یەکەمی نامەخانە. ژوورەکە لە کتێب زیاتر هیچی تێدا نەبوو. لەئەرزەوە تا نیو مەترەیێك خوارووی بن میچەکە دۆڵاب و دەلاقە بوو کتێبی لێ ریز کرابوو، لەسەر دۆڵابەکانیشەوە تا بن میـچ پەیکـەری لە گەچ دروست کراوی گۆڕرانی ئادەمیـزاد دانـرابـوو لە مەیمـوون و مرۆڤی نیاندرتالەوە تا ئادەمیزادی سەردەمی ئێمە .

تۆفیق وەهبی پێشـوازیێکی گەرمی کردین، سوپاسی جەمیلی رۆژبەیانی کرد بەوەی کە داواکەی هێنایە دیو منی پێ ناساند، ئیتر رۆژبەیانی کەوتە گاڵتەو گەپ و لەهەموو کەسیش زیـاتـر تۆفیق وەهبی هێنـابـووە بزەو پێکـەنین. هەر لەم چاو پێکەوتنی یەکەمە بوو تۆفیق وەهبی زیاتر گفتوگۆی لەگەڵ من دا دەکرد، ئەوەی بۆ روون کردمەوە کە بەختیارە بەوەی کە من وەکـو مامـۆستـاییێکی خۆم هاوڕێیـەتی بکـەم، سوود لە نامـەخـانەکەی وەربگرم، نامەخانە هەمیشە کراوەیە بۆ من و دەتـووانم بیکـەم بە مەڵبەندی کۆششی قوتابیەتیم لە کۆلیجی ئەدەبیـاتی بەغـدا. باسی رۆژنامەی «هەولێر» و ووتارەکانیش کردم، ووتی هەر لەبەر ئەوەیە حەز دەکەم یارمەتیت بدەم، بەڵکو خوێندنی بەرزیش لە دوواڕۆژدا لە هەندەران دا تەواو بکەی.

بەراستی توفیق وەهبیو نامـەخـانـەو ئەم پێشوازییە گەرمـە بەختیـاریـان کردم، ئەو رۆژە وام هەست دەکـرد کە گەنجینـەیێکم دۆزیوەتەوە. ئیتر کاڕو کۆشش کردن لەناو ئەم نامەخانە نایاب و بێهاوتایەدا بەشێکی زۆری لە وەخت و کاتم وەرگـرت بوو. هەنـدێ جار ئەو سەرچـاوانـەی لەوێ دەست نەکـەوتنـایـە لەنامەخانەی کۆلیجی ئەدەبیات وەرم دەگرتن و کۆششەکەم دەکەوتە نامەخانەی تۆفیق وەهبی. کارکردن لەبەر دەست زانایێکی وا مەشقێکی گرنگ بوو بۆ من. ئەگەر ووتارێك یا هەر نووسینێکی تری بوایـە بۆم پاکنووس دەکرد، ئیتر من خەریکی کاری خۆم دەبووم و ئەویش خەریکی نووسینی خۆی دەبوو. جاری وا دەبوو بۆ ماوەیێکی زۆر لە نامەخانەکەدا هەر قسـەشمـان لەگـەڵ یەکتـری نەدەکـرد، هەندێ جاریش من

## زانای رەسەن

تۆفیق وەهبی گێتییێکی گەورەو تایبەتی بوو، لە ئەدگارە ـەرە گرنگـەکـانی دەستووری بیرکدنەوەو لێکۆڵینەوەی زانای دـەن ئەوە بوو کە باوەڕێکی تەواوی بە تیۆریی «گومان = ـ»ی دیکارت هەبوو، لای وابوو «موتلەق» دەست ناکەوێ یا

بە دەگمەن دەست دەکەوێ، لەبەر ئەوە لەهەموو بیرو راو نووسینێک دا دوو دڵ بوو، جاری وا هەبوو بیرو راێکی لە فورمەیێک دا چاپیش دەکرا بەڵام هەڵی دەوەشاندەوەو ئەو فۆرمەیەی لادەداو دووبارە چاپی دەکردەوە. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٩٥٧ کە کتێبی «إبعاد معنى اليحمور عن اسم الملك بهرام گور» لەژێر چاودێری‌ی من لە بەغدا چاپ دەکرا، هەمووی تەواو بوو، بەڵام دروون و برین و کردنی بە کتێب لەسەر داوای تۆفیق وەهبی راگیرا، بۆ ئەوەی دووبارە بەسەر زانیاری‌یەکان دا بچێتەوە، لەو خوێندنەوەیەدا هەندێ شتی تازەی دۆزی‌یەوە کەوتبووە فۆرمەی دوایی، ناچار ئەو فۆرمەیەی لابردو دووبارە چاپ کرایەوە.

بەم جۆرە زانین و زانیاری‌ی ئەم زانا گەورەیە لەبزووتنەوە و گۆران دا بوو، هەرگیز وەستانی بۆ نەبوو، لە جێگەی خۆشی‌دا مارشی نەدەکرد. ئەم خووو رەووشتە کردبووی بە زانای راستەقینەو کردەوە زانستی‌یەکانی نموونەی لێکدانەوەی قووڵ و شێوازی زانستیانەو مێتۆدی ئەکادیمیانەیان وەرگرت بوو، لەبەر ئەوە شێوەی جیهانی‌یان دەنووانەو دوور بوون لە چووارچێوەی ئیدیۆلۆجی‌ی چینایەتی‌و بیرو باوەری نەتەوایەتی و هونەری هەڵسوکەوتی دیبلوماسی‌و پرۆپاگەندەی‌یەك ئاخوری .

گەلێ جار بۆ پێکەنینی هەندێ زمانیشی خواردەکردەوەو پێ‌ی دەووتم : ئێوەی هەولێری بۆ ئەم «ئەکەم»ە ناسکە ئەکەن بە «دەکەم»ی گوێ تۆقێنەر! منیش دەمووت: مامۆستای بەگم من قەت نەمووتووە «دەکەم». لەوەراما دەیووت: من مەبەسم تۆنی‌یە بە گشتی ناوچەی سۆرانە. کەچی لەپاش ماوەیێك بیرو رای گۆری‌و هاتە سەر ئەو رایەی کە لە زمانی یەکگرتووی نووسینی‌دا هەرگیز دەبێ بنووسین «دەکەم» نەوەکو «ئەکەم» .

ئەم «گومان» و «دودڵی»یە بووبووە هۆی ئەوەی هەمیشە بەرهەمی بڵاونەکراوەی زۆر زیاتر بێ لە بەرهەمی بڵاوکراوە، ئەرشیفی دەسنووسی کارەکانی خۆی گەلێ گەورەترە لە کتێب و ووتارو باسی چاپ کراو لە نامەخانە تایبەتی‌یەکەی‌دا. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کاری زانستی‌ی گەورەی بۆ نەکرێ (مەبەس لەگەورە قەوارەیە) لە دەستووری زمانی کوردی زیاتر.

بۆیە زۆربەی بەرهەمی بریتی‌یە لە باس و لێکۆڵینەوە لە پرسێك، بەڵام یەکجار یەکجار بە قووڵی بۆی دەچووو زانستی‌یانە ساغی دەکردەوە، ئیتر ئەم بەرهەمانە بوون بە سەرچاوەی بنچینەیی بۆ هەموو کارێکی گەورەی‌تر، وەکو نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی، یا مێژووی نەتەوەی کورد یا مێژووی زمان و کولتووری کوردی.

## مێرخاس و دیموکراتی

تۆفیق وەهبی ئەگەرچی ژیانی ماڵەوەی ئورستوکراتیانە بوو، بەڵام خووو رەووشتی گەلێ ساکارو میللی‌یانە بوو. چاوتێربوو، زیاتر لە سووارچاکەکانی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵی ئەورووپای سەدەکانی ناوەراستی دەکرد، بۆیە لەبەر دەرگای ماڵەکەی‌دا پێشوازی‌ی هەموو میوانێکی دەکرد، بەڵام بۆ بەرێ‌کردن و خوداحافیزی هەموو میوانێکی تا دەرگای دەرەوەی باغی ماڵەکەی بەرێ‌ی دەکرد. ئەم رەووشتە وای لێکردبوو کەتێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکی‌دا بکا، ئەگەرچی بە ساڵاچووبووو هەر وەها هەندێ لەنگیش بووو نەیدەتووانی زۆر بروا یا لەسەر پێ بوەستێ، بەڵام پیاسەی کۆڵانەکانی گەرەکی وەزیریەی دەکرد، هەندێ جار پیاسەی ناو بازاریشی دەکرد.

جارێکیان ئێوارە بوو دەیویست پێکەوە پیاسەیێکی شەقامی رەشید بکەین، سزای کورە گەورەی کە لەو کاتەدا قوتابی‌ی کۆلیجی پزیشکی بوو، خۆی ئۆتۆمۆبیلی لێ‌دەخوری، سوواری کردین تا گۆرەپانی مەیدان لەوێ تۆفیق وەهبی‌و من هاتینە خووارەوە، ئیتر بەسزای ووت کە لەپاش دوو سەعاتی‌تر لە پێش دەرگای مزگەوتی سەید سوڵتان عەلی چاوەرووانیمان بکا .

لە مەیدانەوە بە پێ کەوتینە رێ، گەلێ کەس لە رێبواران دەستی رێزیان دەخستە سەر سنگیان و سڵاویان لەم کەلە پیاوە دانایە دەکرد. بە درێژایی رێگە یادداشت و بیرەوری‌یەکانی بەغداو شەقامی رەشیدی بۆ دەگێرامەوە، تا گەیشتینە بەرامبەر مزگەوتی حەیدەرخانە، وەستا بەشێر موشێر بە پێوە وەستابوو، مەترە ئاسنەکەی بە دەستەوە بوو، سەری لە

TELEPHONE: 01-748 8330

7 FERRY ROAD.
BARNES.
LONDON, S.W.13.

١٩٧٢/١/٢١

خۆشەویستەکەم د. مەعروف خەزنەدار،
سپاستان دەکەم بۆ کاغەزەکەتان کە بە تاریخی ١/١/١٩٧١ نوسرابو، وە بۆ گوڤارەکانیش.
داخم ناچێ کە نەم توانی زووتر جوابی بنوسمەوە، چونکە ئەوەی داواتان کردبو، هەر
ئێستا کەوتە دەستم. ئەوا ناردم بۆتان. هیوام وایە کە شاگردی تریشمان هەبێ کە
لەم شوێنە بڕۆن. ئیحتیاجمان زۆرە بەم جۆرە پێگەیشتوانە.
ئیتر ئاواتەخوازی سەرکەوتنی ئێوە و ئەدیبە دڵسۆزەکانی ترم لە خزمەتی پێشکەوتنی زمانە
ئەدبیەکەی پەنجاوسێ ساڵیماندا، تا دەستی ئەهریمەن کە لە فەعالیەتدایە نەی شێوێنێ.
هامتان

وێنەی نامەیێک لە نامە تایبەتی‌یەکانی تۆفیق وەهبی بۆ نووسەری ئەم ووتارە

دوکـانـەکـەیـەوە دەرهێنـابووو بە تەمابوو لەگەڵ مێرمندالێك قسەبکا، کە چاوی بە تۆفیق وەهبی کەوت مەترمکەی دەستی فرێدایـە ژوورەوەو دەست بەجێ رێـزو حورمەتی پێشکێش کردو لەدوکان هاتە دەرەوەو دوو خانەنشینی کوردیش دانیشت بوون، ئەوانیش هەڵسانە سەر پێ و بەتەمابوون بێنە دەرەوەی دوکانەکە بۆ ئەوەی رێگە بۆ توفیق بەگ خۆش بکەن بەڵکو بچێتە ناو دوکـان و تاوێك لەگەڵیان دا بکەوێتە گفتوگۆو دەمەتەقێ. بەڵام دیـاربـوو تۆفیق وەهبی دەیویست تەنیا چاك و چۆنیان لەگەڵ دا بکاو زیاتریش خەریکی وەستا بەشیربوو.تۆفیق وەهبی لای وابوو پیشەی بەرگ دروویەتی‌یەکە قازانجی زیاتر بوو بۆ بەشـیرمـوشیر لەعەتاری‌و ووردەفرۆشی. وەستا بەشیر لەمەدا لەگـەڵ وەهبی بەگابوو، بەڵام لەکاتێك دا وەستا بەشیر سوور هەڵگـەرا کە تۆفیق وەهبی لێ‌ی‌پـرسی لەسـەردەمی لاویەتی‌دا خوێندنی قوتابخانەی قەلاچوکردنی نەخوێندەواری‌ی شەوانی گەیـانـدە کامـە پۆل! بەشیر بڵمە بڵمێکی لێوەهات، پێم وایە ئێستاو ئەوساش نەخۆی و نە تۆفیق وەهبی‌و نەکەسی‌تریش لە وەرامـەکـەی نەگـەیـشتن ئایـا لە کامـە پۆل دا وازی لە خوێندنەکەی هێنا!

لەپاش ئەمە هەر وا بە پیاسە شۆربووینەوە تا گەیشتینە ئۆروزدی باك، دیاربوو هەموو فرۆشیارەکانی ئەم کۆگا گەورەیە تۆفیق بەگیـان دەنـاسی، گفتـوگـۆیان لەگەڵ دا دەکرد، شتی تازەیان پێ‌پیشان دەدا، بەتایبەتی لەبەشی فرۆشتنی کۆڵۆنیاو گوڵاودا. کە گەیشتینـە بەر دەزگـای مزگەوتی سەید سوڵتان عەلی، سزا لە خزمت باوکی‌دا وەستابوو. پاش ئەوەی گەرانێکی ناوشاری بەغدای کۆنی پێ‌کردین رووی‌کردە ماڵەوەی گەرەکی وەزیریە.

## ئەدمۆندسی هاوڕێی

یەکێ لەو زاناو کورد ناسانەی کە تۆفیق وەهبی بە چاوی شانازی‌یەوە تەماشای دەکردن کورد ناسی ناودار سی. جەی. ئەدمۆندس بوو. ئەمە موستەشاری وەزارەتی ناوەوەی عیراق بوو

لەنێوان ساڵانی (١٩٣٥ ـ ١٩٤٥)، لەپاش خانەنشینیبوونی لە لەنـدەن دادەنیشت، خەریکی لێکـۆڵینـەوەی زانستی بوو لەبابەت کوردەوە، مامۆستای کوردناسیش بوو لەقوتابخانەی رۆژهـەڵاتنـاسی و لێکـۆڵینەوە لە ئەفەریقا (سەر بەزانستگای لەندەن) پێوەندی لەنێوان ئەم دوو زانایەدا لە کۆنەوە هەبوو، لەهەموو مەسەلەو بیرو رایێکی زانستیو زانیاری پرسیان بە یەکتری دەکرد. بە تایبەتی ئەدمۆندس کە کتێبی «کورد و تورك و عەرەب»ە نایابەکەی بە زمانی ئینگلیزی لە لەندەن لەژێر چاپ دابـوو هەندێ لە فۆرمەکانی کە هێشتا پرۆڤە بوون بۆ تۆفیق وەهبی ناردبووە بەغدا بۆ ئەوەی بژاریان بکاو هەڵەکانیان راست بکاتەوەو بیرو باوەری خۆی بەرامبەریان دەربرێ. ئەدمۆندس هەمیشە ناوی تۆفیق وەهبی وەکو هاورێیێکی ئازیزو زانایێکی کورد دەبرد. لەو ماوەیەدا من تازە کتێبی «أغاني کردستان»م چاپ کردبـوو، پارچـە پەخشـانێکی کوردی تۆفیق وەهبیشم گۆریبـووە سەر زمـانی عەرەبیو لەکتێبـەکـەم دا بڵاووم کردبووەوە، ئەو پەخشانە ماتەمنامەیێك بوو بۆ کۆچی دوایی مێـژوو نووسی کورد ئەمـین زەکی نووسیبوویەوە، ئیتر تۆفیق وەهبی پێشنیـاری بۆ کردم کە دانـەیێـك لەکتێبەکەم بەناوی دیاری پێشکێش بە ئەدمۆندسی بکەم. ئەوی راستی بێ من لەم مەسـەلەیە دوو دڵ بووم، تەنیا لەبەر ئەوەی ئەدمۆندس م نە دەنـاسی تامردیش هەر چاوم پێی نەکەوت، ئەگینا ئەدمۆنس یەکێکە لەو رۆژهەڵاتناسانەی کە دڵسۆزییان بۆ نەتەوەی کورد لە پلەیێکی بەرزدا بووە، وا بوو تۆفیق وەهبی ووتی تۆ دانەیێکی پێشکێش بکـە من لەگەڵ فۆرمەکانی کتێبەکەی خۆی «کوردو تورك و عەرەب» بۆی رەوانـە دەکەم. ئەوەی ئاشکرایە تۆفیق وەهبی زیـاتریش ئەم پێشنیارەی بۆ ئەوە بوو کە ئەدمۆندس چاوی بە پەخشـانـە کوردییـەکـەی خۆی بکەوێ کە من لە «أغاني کردستان»دا کردبووم بە عەرەبی. ئێستاو ئەوساش من شانـازی بەو دوو ووشـەیـە دەکەم کە بۆ ئەدمۆندسم نووسی لەسەر دانەیێك لە کتێبەکەم، ئەگەر لەو سەردەمەدا ئەدمۆندس وەکو کوردناسێك لە پلەیێکی دیاریکراو بوو بێ لەناو دڵی من دا، ئێستا لە پلەیێکی بەرزتردایەو لەرێزی هارتمان و بیتنەرو هەدەنگ و لوکۆك و سۆن و لیسکۆو مینۆرسکیو نیکیتین و ژاباو ئابۆڤیان و خالفین و لازاریف و هیتر دەوەستێ، نەك ئەوانەی گێرەشێـوێنی لەرینیسـانسی رۆشنبـیری کوردی دەکەن وەکو مەکەنزیو تابوولۆڤ و ئاکووبیان و کیراکۆسیان هیتر.

ئێمـە تێکـرا کە رێز لەم زاناو خوێندەوارانەی گێتیی رۆژهـەلاتنـاسی ئەورووپـا دەنێـین لەبـەر ئەوەیـە کە بە گشتیراستیان لەسەر ئێمە نووسیوە، بەراستی لەسەر ئێمەیان کردوێتـەوە، بەمێشکی خۆیـان بیریـان لەئێمـە کردوێتـەوە نەك بەمێشکی ئێمـە، ئەگینـا ومنـەبێ هەموویان بە تەواویو بێ کەمـوکـووری هەرچی نووسیـویانەبەلای ئێمەوە راست بێ. ئەوانـەی خراپـەشیان لەگەڵ ئێمەدا کردووە، دەبێ لەوانیتر جیابکرێنەوە، جا ئەمانە سەر بەو لابن ، یا بەم لا بن گرنگ نییە

دەبێ ئەوەش بۆراستی بخەمە روو کە من لە ناوەراستی پەنجاکانەوە بەئاواتەوەبووم لەنزیکەوە ئەو سێ زانایە بناسم کە تۆفیق وەهبی زۆر رێزو حورمەتیانی دەگرت و ناویان هەمیشە لەسەر زاری بوو: پوور داوود، مینۆرسکی، ئەدمۆندس، ئاواتی بینینی پوور داوودو مینـۆرسکی لەدووایی‌دا هاتە دی، بەلام ئاواتی بینینی ئەدمۆندس بە ئەنجام نەگەیشت .

هاورێیـەتیو دۆستـایـەتیی نێـوان تۆفیق وەهبیو ئەدمۆندس لە بیست و پێنج ساڵەی دووایی ژیانی کە لەندەنی کردە نیشتەجێی خۆی گەیشتە پۆپەو بەری ئەم دۆستایەتییە لەنێـوان ئەم دوو زانـایەدا گەلێ کاری زانستیبوو بۆ کورد، لەسـەرووی هەمـووشیـانـەوە فەرهـەنگـە نایاب و بێ وێنەو رەنگینـەکـەی ئینگلیـزی ـ کوردی بوو کە لە شەستەکان دا (١٩٦٦) لە لەندەن بلاویان کردەوە .

## دوور لە سیاسەت بۆ خوێندەواری

هەر چەنـدە تۆفیق وەهبی گەیشتـە پلەی وەزیـریو تا شۆرشی ١٤ی ئەمووزیش ئەندامی ئەنجوومەنی سینات (عەین = شێخ) بوو لە پەرلەمانی عیراقیو لەماوەیێکیش دا دەستی خستبووە ناو دەستی ئەوانەی (پارتی نەتەوەیی سوسیالیستی = حزب الامـة الاشتـراکی)یـان دامـەزرانـدو کردیـانـە

نوێنەریخۆیان لە کوردستانی عیراق دا بەڵام تۆفیق وەهبی پیاوی سیاسەت نەبووو بۆ ئەم کارە دەستی نەدەدا، لەپێشانا پیاوی ستراتیجی سوپایی‌بوو، ئنجا بوو بە پیاوی زانستی کە بەشوێن راستیدا دەگەرا، بەڵام شانازی بە کۆمەڵی‌پێشکەوتووی ئینگلیز دەکرد، بیروباوەری لیبیرالی هەبوو، ئەمەی لەپەرلەمانی ئینگلیزی بەدی دەکردو ئارەزووی ئەوەی هەبوو کە لە کۆمەڵێکی وادا بژی، بۆیە هەرەوەزیو هاوکاری لەگەڵ دامودەزگا زانستیو رۆشنبیری‌یەکانی بەریتانیا دەکردو هەوڵی دەدا لەپاڵ ئەو دامودەزگایانە خزمەتی زمان و ئەدەب و رۆشنبیری کوردی بکا. جا بەم هۆیەوە دەبینین مەبەسی‌کاتی ئەو دامو دەزگایانە چی بووبێ جێی باسی نی‌یە، ئەوەی قازانجە ئەوەیە کە کردەوەکە بووەتە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵ. بۆ بەڵگە بزووتنەوەی رۆژهەڵاتناسی بۆ ئامانجێکی ئەمپریالیزمیو داگیرکردن کەوتە ناوەوە کەچی کردەوەکەی بوو بە سەرچاوەیێکی یەکجار گرنگ و لەبن نەهاتوو بۆ پێشکەوتنی ئەو ئادەمیزادانەی کە ئەمپریالیستەکان باپیرە گەورەکانیان دەچەوساندنەوە.

## ئێسگەی رۆژهەڵاتی نزیك

تۆفیق وەهبی دەستێکی باڵای هەبوو لە دەسنیشان کردنی کادیری کوردی بۆ «ئێسگەی بێ‌تەلی رۆژهەڵاتی نزیك» لەیافای فەلەستین لە رۆژگارانی جەنگی گێتی‌ی دووەم. ئەم ئێسگەیە زمان و ئۆرگانی سوێند خۆران بوو لەدژی ئەلەمانیای نازیو ئیتالیای فاشی، بەڵام لەژێر چاودێریو رێبەریی بەریتانیادا بوو. جگە لە بەرنامە سیاسیو دیبلۆماسیو ستراتیجی‌یە جەنگی‌یەکانی ئەم ئێسگەیە بایەخێکی تایبەتی بە مێژووو شیعرو ئەدەبیات و رۆژهەڵاتناسیو کوردناسیو زمانی کوردی دەدا، دەسنیشانی تۆفیق وەهبیو هەڵبژاردنی شاعیرێکی وەکو عەبدللا گۆران و نووسەرو هونەروەرێکی وەکو رەفیق چالاك لە جێی خۆیدا بوو. گەلێ جار تۆفیق وەهبی باسی لەبەرهەمو توانایی گۆران و چالاك دەکردو شانازی‌ی بەوەوە دەکرد کە لەم هەڵبژاردنەیدا سەرکەوتوو بووە. گۆرانیش هەمیشە خۆی بە قەرزاری پیاوەتی تۆفیق وەهبی دەزانی، ئەمەو بەشێك لەبەرهەمە جوان و رەنگینەکانی لەشیعری لیریکی کوردی زادەی ژیانی سەردەمی «ئێسگەی بێ‌تەلی رۆژهەڵاتی نزیك» بوون لەیافا. ئەوەی ئاشکراشە لەم لایەنەوە ئەوەیە کە ئیلهامی شیعری «جوانی بێ ناو» (قژکاڵ، لیوئاڵ...) لەنازەنینێکی ئەو ناوەی وەرگرتووە، ئەو شیعرە لە دواییدا بوو بەرەمز لەبەرهەمی شیعری گۆران دا.

## دەنگی گێتی‌ی تازە

تۆفیق وەهبی دامەزرێنەری کۆواری «دەنگی گێتی‌ی تازە» بوو، بێ گومان بە پێشنیاری‌ی ئەوەوە ئەم چاپەمەنی‌یە کەوتە ناوەوە، ئەمە کۆوارێکی مانگانە بوو لە لایەن بەشی پێوەندی‌ی گشتی‌یەوە لە بالیۆزخانەی بەریتانی‌دا لە بەغدا دەردەهێنرا، بەڵام سەرۆکی نووسین و بەرێوەبەری هونەریو تەکنیکی تۆفیق وەهبی بوو. زۆر شانازی‌ی بەوەوە دەکرد کە رۆژێ لەرۆژان سەرنووسەری دەنگی گێتی‌ی تازە بووە. هەموو هەوڵ و کۆششەکانی لەبابەت زمان و مێژووو ئەدەبی کوردی‌یەوە لەسەر لاپەرەکانی ئەم کۆوارە رەنگی دابووەوە. بۆ بەڵگە هەشت بابەتی ژمارە یەکەمی (تشرینی یەکەم ١٩٤٣) لەلایەن تۆفیق وەهبی خۆیەوە نووسراوەتەوە، جگە لەوەی کە شێوازی تۆفیق وەهبی لەسەرانسەری هەموو ووتارو هەواڵەکانی‌دا دیارو ئاشکرایە.

گەلێ جار لە تۆفیق وەهبیم بیستووە دەیووت: لەبەر ئەوە حوسێن حوزنی‌ی موکریانیو حەسەنی شێخ حەمە مارفم دانابوو کە لەدەنگی گێتی‌ی تازەدا ئیش بکەن، چونکە یەکەمیان خوێندەوار بوو و کوردی‌یەکەی باش بوو، لەو ماوەیەدا بێ کاریش بوو بەوەی چاپخانەکەی رواندزو هەولێری لە کار وەستێنرابوو، دووەمیان کوردی دەزانیو توانایی ئەوەی هەبوو پلەی زانینی بەرزتریش بکاتەوە.

گەلێ لە ووشەو زاراوەو لێکسیکۆنی کە ئێستا لە زمانی کوردی‌دا بەکاری دەهێنین بەتایبەتی ئەوەی لەمەر سیاسەت و دیبلوماسیەت و ئەدەب و هونەروەیە ئەوانەن کە تۆفیق وەهبی پێشنیاری کردوون و لاپەرەکانی دەنگی گێتی‌ی تازە بوون بە

مەیدانی مەشق و پراکتیك بۆ بلاوبوونەوەی ئەو ووشەو زاراوەو لێکسیکۆنانەی کە بوون بەهۆی گۆڕران و پێشکەوتن و دەوڵەمەند بوونی زمانی کوردی. ئەوەی لێرەدا پێویستە بووترێ ئەوەیە کە کتێبی ئاڤێستا سەرچاوەی بنچینەیی بوو بۆ دروست کردنی ئەو ووشە تازانە بۆ نووسینی کوردی پەتی .

## پەیام

لە پەنجاکان دا دەزگای کارو باری ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری لە بالیوزخانەی ئەمەریکا لە بەغدادا گۆواری «پەیام»ی دەردەکرد، لەپێش ئەویشا گۆوارەکە لەژێر ناوی «ئاگاو رووداوی هەفتەیی»دا دەردەچوو. ئەم چاپەمەنی‌یە ڕاستەوخۆ لەژێر چاودێری‌ی تۆفیق وەهبی نەبوو، بەڵام بێگومان پرسی پێدەکرا، هەر بە پێشنیاری ئەویش بەکر دلێر کرابوو بە لێپرسراوی گۆوارەکە، گەلێ جار لە نامەخانەکەی تۆفیق وەهبی‌دا چاووم پێی دەکەوت، پرسی پێدەکرد، بیرو ڕای وەردەگرت، ئامۆژگاری لێداوا دەکرد، هەر لە دیوەخانی نامەخانەی تۆفیق وەهبیشەوە ناسیاویم لەگەڵ بەکردلێر پەیدا کرد.

ئێوارەییێکیان دیوەخانەی نامەخانەی تۆفیق وەهبی گەلێ کەسی لێبوو، جەمیلی ڕۆژبەیانی‌و بەکردلێریش لەوێ بوون . دیاربوو بەکردلێر هەندێ پرس و سۆراغی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسیبووەوەو یەکە یەکە لە تۆفیق وەهبی دەپرسی، هەمووشی پێوەندی بە ووشەو ڕستەو زاراوەی زمانی کوردی‌یەوە هەبوو بۆ پەیام. دیار بوو دەزگای پەیام دەیویست سیپارەی «التحدی الاکبر» کە بەزمانی عەرەبی پێشتر بلاوکرابووەوە بیکا بە کوردی‌و وەکو بلاوکراوەیێکی پەیام لەناو کوردانا بلاو بکرێتەوە . بەکر دلێر تکای لەتۆفیق وەهبی دەکرد کە ناوی سیپارەکەی بۆ بکا بە کوردی، گەلێ قسە لەم بارەیەوە کرا، دانیشتووان هەموویان قسەو گفتوگۆو پێشنیاریان کرد، بەڵام هیچ یەکێکیان بە دڵی تۆفیق وەهبی نەبوو، خۆشی شتێکی وای بۆ نە دەهات کە لێی ڕازی بێ، تا جەمیلی ڕۆژبەیانی وەکو تۆپێك بتەقێنی ووتی : «التحدی الاکبر» بە کوردی دەبێتە «گەورەترین چوونە مەیدان» تۆفیق وەهبی دەسخۆشی پێووت و سیپارەکەش لەدوواییدا هەر بەو ناوەوە بەزمانی کوردی دەرچوو .

ئەوی ڕاستی بێ لەو ڕۆژگارەدا گۆواری «پەیام» لەلایەن ئەوانەی خۆیان بە پێشکەتنخواز دەزانی ئێسکی قورس بوو، بەڵام من دەربەستی ئەوە نەبووم، مێشکم هی خۆم بوو، بۆیە نووسراوەکانی ناو چاپەمەنی‌یەکەم کردبوو بەدوو بەشەوە: بەشە پرۆپاگەندەکەی کە بۆ چاکەی کۆمەڵی سەرمایەداری بوو بەکارێکی خراپم دەزانی، ئێستاش هەر بە خراپی دەزانم، بەڵام بەشەکە ی تری کە بۆ پەرەسەندن و پێشخستنی ڕۆشنبیری‌ی کوردی تەرخان کرابوو بەکارێکی چاکم دەزانی، ئێستاش هەر بە چاکی دەزانم، لەبەر ئەوە هەندێ جار نووسینی بچووك و شیعرم بۆ دەنارد .

لەدوواییدا تەنگوچەڵەمەییێکی قووڵ بۆ بەکردلێری بەڕێوەبەری دروست بوو، بەوەی کە ڕەفیق چالاك و جەمال نەبەز بە نازناو هەندێ نووسینیان لەپەیام دا بلاوکردەوە بۆنی پێشکەوتنخوازی و دژی چاکەی ئەمەریکای، لێ دەهات ئیتر بالوێزخانەی ئەمەریکا کەوتە فریای چاپەمەنی‌یەکەی بەڵام هەرگیز نەیتووانی بزانێ نووسەری نووسینەکا کێبوون ! بۆیە چالاك و نەبەز بەر هیچ جۆرە زیانێك نەکەوتن، تۆفیق وەهبی دەورێکی باڵای هەبوو بۆ داخستنی مەسەلەکە .

## شەفەق

چاپ و چاپخانەو بلاوکردنەوەی چاپەمەنی‌ی کوردی بەلای تۆفیق وەهبی‌یەوە بەردی بناغەی پێشکەوتنی نەتەوەی کوردبوو، لەبەر ئەوە هەموو لاوێکی کوردی هان دەدا کە قۆڵی هەڵماڵێ بۆ ئەم کارە.

لە هاوینی ساڵی ١٩٥٧ کە کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدام تەواوکرد، پێشنیاری تۆفیق وەهبی ئەوە بوو کەداوا بکەم و لە کەرکووك دامەزرێم و یەك دوو ساڵ لەوێ بمێنمەوە ئنجا بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرز ڕوو بکەمە ئەورووپای ڕۆژئاوا یا ئەمەریکا. لەو ماوەیەدا خاڵە شێخ قادری بەرزنجی خەریکی وەرگرتنی ئیمتیازی گۆواری «شەفەق» ی کوردی‌و عەرەبی بوو،

دیاربوو توفیق وەهبیش هەوڵێکی بێووچانی بۆ دەدا بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی گۆوارەکە، وا بوو ئارەزووی ماموستای خۆشەویستم هێنایە دی، بەمە لەگەڵ هیواو ئامانجێکی گیانیی تریشم شاد بووم، یادی دە ساڵ لەمەوبەری ئەو کاتە کە هەر لەو مەڵبەنەدا خوێندنی قوتابخانەی ئامادەییشم وەرگرت بوو . ئیتر لەگەڵ تاقمێك رۆشنبیری کوردی خوێندەواری دڵسۆز خۆشترین ماوەیێکی ژیانم بردەسەر، بەلام داخم ناچێ ماوەکە کورت بوو !

بۆ دەربرینی دڵسۆزیی تایبەتی بەرامبەر بە «شەفەق» توفیق وەهبی گەلێ تێبینیو سەرنجی ووردی لەبابەت ووشەی «شەفەق» موە دەربڕیوە لەو گفتوگۆیە زانستییەی کە لەگەڵ پەیامنێری شەفەق لەبەغدا جەمال خەزنەداری کردبوو، وەکو لە ژمارە دووەمی شەفەق (١٥ی شوباتی ١٩٥٨)دا دەردەکەوێ .

## چاوتێر و جوامێری

توفیق وەهبی زۆر بە ئاسانی کتێبی دەبەخشیو بەدیاری پێشکێش بە هاورێو دۆست و قوتابیانی دەکرد . ئەمە دیاردەیێکی سەیربوو، لام وایە ئەوەی هەوەسی کۆکردنەوەی شتێکی هەبێ ئەو شتە بە دیاری نادا بە کەس. خۆی هەمیشە دەیووت من دیاری لە هیچ کەس وەرناگرم، تەنیا لە خزم و کەس و کارو دۆستە هەرە نزیکەکان نەبێ، ئەمانەش خۆم داوای ماست و پەنیرو هەنگوین و ترخێنەو گوێزو گەزۆو شتیتریان لێ دەکەم . دەیووت هەموو کەسێك دەزانێ من تەنیا کتێب بە دیاری وەردەگرم. بەڵێ کتێبی بە دیاری وەردەگرت، هەر لەو کاتەش دا کتێبی بە دیاری دەبەخشی، چونکە زانایێکی دانابوو، زانستی بۆ هەموو کەسێك دەویویست، دانایی بۆ هەموو کەسێك بە رەوا دەبینی .

رۆژێکیان پێی ووتم پێویستە رۆژانی پێنج شەمووو هەینی داهاتوو پێکەوە تەرخان بکەین بۆ هەڵگێرو وەرگێر کردنی سەرتاپای نامەخانەکە، بەشێکی زۆر لە کتێبەکان بخەینە لاوە، چونکە دەیەوێ هەندێکیان بکا بە دیاری بۆ نامەخانەی گشتیی سلێمانی، ئەمە ماندووبوونێکی ئەوەندە خۆش بوو کە هەرگیز لەبیر ناچێتەوە . کتێب جیا کرایەوە، لیستەی بۆ کرا، خرایە چەند سندووقێکەوە، ئنجا ئێوارەیێکیان سندووقەکان برانە ئێسگەی شەمەندەفەری «باب المعظم» کە لە ماڵەکەیانەوە زۆر نزیك بوو بۆ کەرکوك، لەوێوە بە لۆری بۆ سلێمانی، هەواڵیشی بە نامەخانەی گشتیی سلێمانی گەیاندبوو کە سندووقەکان نەکرێنەوە تا من دەگەمە ئەوێ و لیستەی ناوی کتێبەکانیش لای من بوون .

لەپاش سێ رۆژ ئێوارەیێك هەر بە پیاسە توفیق وەهبی خۆیو هەر دوو کوڕیو نەجمی پیاویو عەبدولقادر حیشمەت لەگەڵم دا لە ماڵیانەوە کەوتینە رێ بۆ ئێسگەی شەمەندەفەر بۆ بەرێ کردنی من. ئەو دیارییانەی توفیق وەهبی بۆ نامەخانەی گشتیی سلێمانی تا ئێستاکە پارێزراوون ، بەلام دیارییەکانی بۆ مەجمەعی عیلمی کوردی کە لەوەی سلێمانی گەلێ زیاتر بوون کەس نازانێ چییان بەسەرا هات !! بەلام رەنگە قوربانە دەسنووسە نایابەکەی بنەماڵەی ئێمە کە لەکاتی خۆیدا پێشکێشی توفیق وەهبیم کردبوو مابێ، چونکە دەسنووسە ! دەسنووسیش بەپێی یاسای دەوڵەت نادزرێ !

جگە لەمە توفیق وەهبی رەچاوی ئارەزووی نزیکەکانی دەکرد کە دیاریی پێشکەش دەکردن، هەر کەسەو حەز لەچی دەکاو هەوەسی چی هەیە، بۆ بەڵگە کە خوێندنی کۆلێجی ئەدەبیاتم تەواو کردو پێش خواحافیزی دووایم لە بەغداوە بۆ کەرکوك کۆمەڵێك کتێبی کوردیو عەرەبی کۆنی یەکجار نایاب و بەنرخی پێشکێش کردم، ئەمانە یادگارێکی هەمیشەیی بێ هاوتان و شانازییان پێوە دەکەم .

دەرگای دیوەخانی توفیق وەهبی هەر دەم کراوە بوو، خوانی نان خواردنی هەمیشە رازاوە بوو، ئەوەی ئێواران وا بوی رێك بکەوتایە کە تا سەعات هەشت لە دیوەخانی توفیق وەهبی بمێنێتەوە، دەبوو نانی ئێوارە لەگەڵ ئەودا بخوا. خۆی لە خواری خوارەوە دادەنیشت، ئیتر میوان دەکشان و بەپێی زۆرییو کەمی تا دەگەیشتنە ئەوپەری خوانەکە . ساڵی یەك دوو ئاهەنگی گەورەی نان خواردنی دەکرد، ئەگەر میوانێکی ئازیزیشی بهاتایە هەرە نزیکەکانی خۆی بانگ دەکرد. جارێکیان پیاوێکی پیری بە ساڵاچووی تورك بۆ سەردان هاتبووە بەغدا،

• ئەمە لەکاتی خۆیدا لە کۆلیجی ئەرکانی ئەستەموول لە قوتابیان و هاورێی تۆفیق بەگ بوو، دیاربوو، هەر لای خۆشی لەماڵەوە دابەزی بوو. ئیتر ئێوارەیێکیان کۆمەڵێك هاورێو دۆست و قوتابیی خۆی بانگ کردن، لەمانە رەفیق حیلمیو ئەنوەر سائیب و عەبدولقادر حیشمەت و عەبدولجەبار رێزەلی و عەبدولرەحمان مفتی هەرە دیارترینیان بوون. پرۆتۆکۆلی میواندارییەکە ئەوەی دەخوواست کە لەبەر میوانی ئازیز دەبوو هەموویان بە تورکی قسە بکەن، چونکە هەموویان تورکییان دەزانیو میوان کوردی نەدەزانی، بەڵام کەمترین قسەش بە تورکی کرا، ئەمە ئارەزووی میوانەکە بوو، سەربەستیی دابووە ئەوانیتر کە بە هەوەسی خۆیانە بە چی زمانێك قسە دەکەن.

مامۆستایانی زمان و ئەدەبیو عەرەبیو نووسەرانی عەرەب لەلای تۆفیق وەهبی دەبینران، لەمانە مستەفا جەواد، سەفاخەولووسی، ئەحمەد حامید سەرراف و هیتر. لە دیوەخانەی نامەخانەدا کۆری گفتوگۆی ئەکادیمییان دەبەست. بە زۆری هەڵسوکەوتی سەفا خەولووسی ئەوە بوو وەکو کوردێك خۆی پیشان دەدا، جارجارە بە تورکیش قسەی دەکرد، ئیتر نازانم بوچ! رەنگە لەو کاتەدا ئەمەی لەبەر تۆفیق وەهبی بووبێ.

بەدەگمەن رێك دەکەوت دیوەخانە یا دیوەخانەی نامەخانەی تۆفیق وەهبی چۆڵ بێ، میوانەکانی سێ بابەت بوون، بابەتێکیان وەزیرو نوێنەری پەرلەمان و دیبلوماسیو سوپاسی گەورە بوون؛ ئەویتریان ئەو کەسانە بوون کە دەهاتنە لایو داوایان لێ دەکرد کە یاریدەیان بدا لەدامەزراندنی وەزیفەی میری، یا گوێزانەوەی وەزیفە، یا مووچە زیادکردن، یا قوبوول کردن لە کۆلێج و قوتابخانە بەرزەکان، یا هەر هەڵسوکەوتێکیتری پێویستیی بە یارمەتی هەبێ، زۆربەی زۆری ئەمانەش کورد بوون؛ بابەتی سێیەمیان نووسەرو خوێندەوارو رۆشنبیرو رۆژنامەنووسی کورد بوون، لەبەرئەوە بوو کەسانی وەکو شاعیری رەندی کورد ئەورەحمان بەگی بابان (نفووس) و شاعیری بەدیمەنی کورد شێخ سەلام و رۆژنامەنووس محەمەد بریفکانی عەبدولرەحمان مفتی و کەریم زانستیو فەتحوڵلا ئەسعەدو کامیل کاکەمین و سدیق قادرییو هیتریش بەدی دەکران.

## زانستی و راستی

**تۆفیق وەهبی وەکو زانایێکی ژیر کە هەمیشە بە شوێن راستیدا دەگەرا، بە چاوێکی رەخنەیی زانستیانە تەماشای هەموو بەرهەمێکیدەکرد، ماڤ تەواوی دەدایە بەرهەمەکە خۆی، جێگەی لە پلەی زانستیدا دیار دەکرد. ئەوەی من بۆم دەرکەوت لە ئەنجامی ژیانی چووار ساڵەم لەگەڵ ئەم زانایە ئەوە بوو کە رێزێکی یەکجار زۆری لە مینۆرسکیو ئەدمۆندس و پووردااود دەنا. ئەگەر ووردە مەسەلەیێکی زانستییەکێ لەم سێ زانایە بکەوتایە ژێر دەستی تۆفیق وەهبی گومانی لێ نەدەکردو بە باوەرێکی بتەوەوە زانیارییەکانی وەردەگرت، هۆی ئەمە بەلای ئەوەوە ئەوە بوو کە هەوەس و ئارەزوو وای لەم زانایانە کردووە کە خەریکی زانستیبن، لەبەر ئەوە بە گیانێکی سۆفیزمەوە چوونەتە ناو ئەم گێتییە بێ سنوورە پر لە تەنگو چەڵەمەیەو هەر سێکیشیان دووایی ژیانیان لە زانستگا بردۆتە سەر. ئەم دەزگایە جێی مشتوماڵ کردنی مێشك و گەران بە شوێن راستییە، لەبەر ئەوە باوەرێکی تەواوی بە بیرو راو لێکۆڵینەوەو بۆ چوونیان هەبوو.**

ئیتر وا بوو لە ساڵی ١٩٥٦، لە هاوین دا کەسەرێکی ئێرانم دا تۆفیق وەهبی نامەی بۆ پووردااود نووسیو کۆڵێك سڵاووریزی بۆ نارد، لەگەڵ سڵاوو رێزی مامۆستام ئەحمەد ناجی ئەلقەیسی هەمووم گەیاندە پووردااودو زاناکانیتری ئەو سەردەمەی ئێران. لەپووردااود ـ یشەوە کۆمەڵێك کتێب و چاپەمەنیم بە دیاری بۆ تۆفیق وەهبی هێنایەوە، جگە لە کۆمەڵێك فەرهەنگی دیالێکتەکانی ئێرانی ئەوانیشم بە پارەی خۆم کرییو بەناوی خۆمەوە پێشکێش بە تۆفیق وەهبیم کرد.

## فێرکردنی کوردی لە یانەی سەرکەوتن

هەر لەو ماوەیەدا بوو کە تۆفیق وەهبی خۆی لەیانەی سەرکەوتن نزیك کردەوە. ویستیان گیانێکی تازە بخەنە ناو لەشی

ئەم دەزگا خوێندەوارییە کوردییەی بەغدا کە لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە تا ئەو سەردەمە لە هەڵبەزین و بەزین دا بووە. کۆبوونەوەی خوێندەواریو زانیارییان ڕێك خست، پرۆژەی دەرکردنی کۆواری «هیوا» یان دانا، لە هەمووشیان گرنگتر کردنەوەی دەورەی فێرکردنی زمانی کوردی بوو. تۆفیق وەهبی ئەم کارەی خستە سەر شانی خۆی. هەفتەی دوو ڕۆژ کوردی فێری ئەو کەسانە دەکرد کە ئارەزووی فێربوونی ئەم زمانەیان هەبوو زۆر سەیربوو قوتابیان لەهەموو بابەتێك بوون، ئەوەی هەموویانی لە یەك شت کۆ دەکردەوە ئەوە بوو هەموویان پیاوی بە ساڵاچوو بوون، ڕەنگە هەندێکیان تەنیا لەبەر تۆفیق وەهبی خۆیان کردبێ بە قوتابی.

قوتابیی ئەم دەورەیە پیاوی وەکو فازیل جەماڵی تێدابوو کە ڕۆژێ لەڕۆژان سەرەك وەزیرانی عیراق بوو، هی وەکو گۆرانیبێژی بە ناوبانگ عەزیز عەلی تێدابوو. دەبێ بۆ ڕاستی ئەوەش بووترێ کە زیرەك ترین قوتابی عەزیز عەلی بوو، فێری قسەکردن بوو بوو، تاگەیشتە ئەوەی گۆرانیی «ئەی کوردینە! ئەی مەردینە» سروودی بەناوبانگ بەزمانی کوردی لە ئێستگەی بێتەلی ئەوسای بەغدادا ببێژێ. لەم دەرزانەدا من یاریدەدەری تۆفیق وەهبی بووم هەندێ جار ئەگەر ماندوو بووایە من دەرزەکەم بۆ تەواو دەکرد، هەموو بەڵگەکانیشی من لەسەر تەختەی ڕەش دەمنووسییەوە، هەندێ جاریش ئەگەر ئیش و کاری بووایە نەدەهاتە یانەی سەرکەوتن و ووتنەوەی دەرزەکەی بەمن دەسپارد.

## تیپ بۆ دەنگە خۆماڵییەکانی ئەلفوبێی کوردی

هەوڵ وکۆششی تۆفیق وەهبی بۆ ساغ کردنەوەی ئەلفوبێو ڕاست نووسینی کوردی لەبن نایە. لەپاش جەنگی گێتیی یەکەمەوە هەرگیز فەرامۆشی ئەمەی نەکردووە. لەگەڵ چاپخانەکان دا خەریك بووە، تا گەیشتۆتە ئەوەی پێوەندیی لەگەڵ کۆمپانیاکانی دروست کردنی ماکینەی چاپ و دارشتنی تیپی چاپ پەیدا بکا. لە ساڵی ١٩٥٦ پێش ئەوەی گەشتی بێرووت بکا من هەر دوو بەشی «قواعد اللغة الكردية»م بۆ پاکنووس کرد، لەوێ لە چاپخانە هەموو تیپ و دەنگە تایبەتییەکانی زمانی کوردی دانابوو ڕێکی خست بووو ئامادەی کردبوو بۆ بەکارهێنان، کتێبەکەی خۆی پێ چاپ کرد. لەپێش ئەوەش دا، لەوکاتەی کەلاینۆتایپ لە بەغدا پەیدابوو و جێی تیپ چنینی گرتەوە، تۆفیق وەهبی کەوتەخۆ، بۆ ئەم مەبەسە بە یارمەتیی من و بەکردلێر داوای لە هونەروەری کورد بەدیع باباجان کرد کە تیپە تایبەتییەکانی زمانی کوردی هەر یەکەی لەسەر مقەبایێکی گەورە بنووسێتەوەو لە پاشانا میکرۆفیلم بکرێ بۆ ئەوەی خاوەن چاپخانەکانی بەغدا بینێرن بۆ ئەڵەمانیا بۆ دروست کردنی قالبی ئەو تیپانەی تایبەتین بە ئەلفوبێی زمانی کوردی، بەم جۆرە لەپاشانا چاپخانەکان کەوتنە چاپی کتێبی کوردی بە لاینۆتایپ.

## دوور وولاتی

لەپاییزی ساڵی ١٩٥٧ کە بەغدام بەجێهێشت بۆ کەرکوك، پێوەندیم لەگەڵ تۆفیق وەهبی لە جاران بەهێزتر بوو. لەهەموو گەشتێکی بەغدام سەرم لێدەدا، جارجارە تەلەفۆنم بۆ دەکرد، لەو ماوەیەدا جەمال خەزنەدار لەپێشان زیاتر سەری دەدا لەسەر ئارەزووی تۆفیق وەهبی خۆی، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی من بە جێم هێشتووە ئەو پری بکاتەوە. لەناوەراستی ساڵی ١٩٥٨ کە بڕیاری گەشتی بەریتانیایدا پێویست بوو من بچم بۆ بەرێ کردنی، پێش ئەوەی ڕووبکەمە بەغدا تەلەفۆنم بۆ کرد، تۆفیق وەهبیی جوامێر تەلەفۆنەکەی بە بەرێکردن حسێب کردو ووتی لەپاش ماوەیێکیتر دەگەڕێمەوەو چاومان بە یەکتری دەکەوێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا جەمال خەزنەدارو کۆمەڵێك دۆست و برادەرو قوتابیانیتری تۆفیق وەهبی ئایینی بەرێکردنیان بەجێهێناو لە ڕۆژی ١١ی تەمووزی ١٩٥٨ بە فرۆکە بەرەو ئەستەمووڵ کەوتە ڕێو بە هیوای ئەوەی ماوەیێك لەوێ بمێنێتەوە ئنجا ڕوو بکاتە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا. بەم جۆرە ئەو ڕۆژەی تۆفیق وەهبی نە

بەغداوە رووی‌کردە ئەستەموول، من لەکەرکووکەوە بەرەو سلێمانی کەوتمە رێ. لەوێوە بۆ پرۆژەی دوکان و بەیانیی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ من و کۆمەڵێك لە شاعیرو نووسەرو ئەدەب دۆست لە دوکان بووین، تۆفیق وەهبیش ئەو رۆژە هێشتا هەر لە ئەستەموول بوو.

## لە لەندەن

رۆژگارو سەردەمێکی سەیر بوو، بێگومان کاری چاك کرابوو، بەڵام نالەباری لەوەدابوو هەندێ لەو کەسانەی کە تۆفیق وەهبی چاکەی بۆ کردبوون کەوتبوونە هێرش بردن، بەدنمەکی وا بیرو هۆشی پیاو دەپووکێنێتەوە. ئێمە ناڵێن دەبوو ئەو کەسانە لە سەر تۆفیق وەهبی بکەنەوە، بەڵکو دەڵێن دەبوو بێدەنگ بن و بەس .

ژیانی لەندەنی تۆفیق وەهبی بە پیت بوو بۆ رۆشنبیریی کوردی، ماوەیێکی زۆر لە نزیکەوە لەگەڵ مینۆرسکیو ئەدمۆندس دا ژیا، کاری چاکی کرد. کەس نەبوو لێی نەپرسێتەوە، کەسیش نەبوو لە خوێندەواری کورد بچێ بۆ لەندەن و سەری نەدا، رۆژگار راستی‌دەردەخا، ئەگەر هەندێ جار بشارڕێتەوەش هەمیشەیی نی‌یە، تۆفیق وەهبی راست بوو رەسەن بوو، بە توواناو زانابوو، بۆیە لە دووایی‌دا ئەوانەی خۆشیشیان نەدەویست لێیان دەپرسی‌یەوە، لەمانە سەیر نەبوو هەندێ کەس لە پەنجاکان دا گلەیی‌یان لەمن دەکرد کە بۆچ لە تۆفیق وەهبی نزیك بوومەتەوە، کەچی هەر ئەمانە لە دووایی‌دا داوای ناونیشان و تەلەفۆنی ماڵی وەهبی بەگیان دەکرد، لە لەندەن، هەندێکیش داوای نامەی تایبەتیشیان لێ دەکردم بۆ تۆفیق وەهبی .

پێوەندیم لەگەڵ تۆفیق وەهبی نەپچرا تا کۆچی دووایی، لە قوتابیەتی‌و هاورێیەتی دەرچووبوو، بە تەواوی بووبوو بە مام و برازا. هەموو هیواو ئامانجم ئەوەبوو، دووسێ مانگ لە تەکیەوە بم، بە تایبەتی لە ماوەی نەخۆشی‌یە کوشندەکەی هەرە دووایی. بێگومان بەشێکی بریاردانی چوونم بۆ جەزائیر بۆ مەبەسی بینینی تۆفیق وەهبی بوو. بەم جۆرە لە پاییزی ساڵی ١٩٨٣ بەرەو جەزائیر کەوتمە رێ، بە ئومێدی ئەوەی هاوینی ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ تۆفیق وەهبی ببەمە سەر، نەوەکو تەنیا خۆم بەڵکو بریار وا بوو سەعدیە خەزنەدار ـ کە بە بووکێنی تۆفیق وەهبی دیبووی ـ و بنیادی نۆ ساڵیش بە بینینی ئەم فرزەندە گەورەیە شاد ببن، بەڵام ئەم ئاواتە نەهاتە دی. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ ئەو رۆژەی لە نووسینەوەی یادداشتەکانم بوومەوە بە ناوی «رەفیق حیلمیو من لەدەفتەری بیرەوەری‌دا» لەسەر داوای دۆستم عەبدوڵلا مەردۆخی دانیشتووی پاریس، ئەو رۆژە قوتابی‌ی دڵسۆزم عەبدوڵلا حەداد لە پاریسەوەو هاورێی نووسەرم حەمە رەسووڵی هاوار لە لەندەنەوە هەواڵی کۆچی دووایی تۆفیق وەهبی‌یان پێگەیاندم . بەم رەنگە ئاواتی بینینی تۆفیق وەهبی لەگەڵ خۆی‌دا چووە گڵەوە. پیرەمەگروون دەبێ شانازی بە پیر وەهبی، یا پیرە وەهبی‌یەوە بکا .

## لەندەن بەبێ تۆفیق وەهبی

لەهاوینی ساڵی ١٩٨٤ خۆم و ماڵ و منداڵ چووین بۆ مەڵبەندی زیندەگانی بیست و پێنج ساڵەی ژیانی دووایی تۆفیق وەهبی. ماڵ و ژووری نامەخانەو ژیانی هەر ئەوە بوو کە وێنەی لە مێشکم دا کێشرابوو پێش ئەوەی چاوم پێی بکەوێ. تەماشای ئەرشیف و کاغەزو دەسنووس و کتێبم کرد، گەلێ شتم هاتەوە یاد، هەندێ لەو کتێب و نووسراوانە پێش سی ساڵ لەنامەخانەکەی ماڵی‌وەزیریەی لە بەغدا چاووم پێیان کەووت بوو. سزا دەیووت: باوکم هەمیشە یادی تۆی دەکردەوە؛ سرووش دەیووت: باوکم لەکەس رازی نەبووە باسی تۆ بەخراپە بکا.

بیبلۆگرافیای کتێبەکانی لەندەنی ئامادەکرابوو، هەندێکی خرابوونە ناو سندووقەکەوە، هی‌تریش هێشتا لەناو دەلاقەکانی نامەخانەکەدا بوون. نیازوا بوو خانوێك لە لەندەن بە کرێ بگرن و ناوی بنێن «مۆزەخانەو نامەخانەی تۆفیق وەهبی» و بیکەنە دەزگایێکی لێکۆڵینەوەی کوردی. بەڵام دیار بوو ئەم پرۆژەیە سەری نەگرت .

## تۆفیق وەهبی کێیە !

ـ تۆفیق وەهبی‌بەگ کوری مەعرووف کوری محەمەمەدە، دایکی عاسمەی کچی رەسوول مەستی ئەفەندی‌یە. لە سالی ١٨٩٢ لە سلێمانی لە دایك بووەو لە سالی ١٩٨٤ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی هێنراوەتەوە نیشتمان و لەتەك پیرەمەگروون نێژراوە.

ـ لە حوجرە خوێندوویەتی، لەپاشانا قوتابخانەی روشدیەو ئامادەیی سوپایی تەواو کردووە، ئنجا لە قوتابخانەی جەنگی بەغدا بە لیفتینانت دەرچووە .

ـ بۆ تەواو کردنی خوێندنی چووە بۆ قوتابخانەی ئەرکانی جەنگ لە ئەستەموول، لە جەنگەکانی بەلقان بەشداری‌ی کردووە. لەگەل کۆتایی جەنگی یەکەم خوێندنی تیوری‌و پراکتیکی سوپایی تەواو کردووە.

ـ لە سالی ١٩١٩ گەراوەتەوە سلێمانی‌و یەکێك بووە لە نزیکەکانی شێخ مەحموود .

ـ لە سالی ١٩٢١ هاوبەشی کردووە لەدروست کردنی سوپای عیراق، لە سالی ١٩٢٣ بووە بە ئامیری قوتابخانەی سوپای عیراق و لەپلەی سوپاییش دا گەیشتۆتە کۆلۆنێلی (عەقید). گەلێ شانازی بەم پلە سوپایی‌یەوە دەکردو لەسەر هەندێ لە کتێبەکانی‌دا دەینووسی «کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی»

ـ بۆ ماوەیێك موتەسەریفی سلێمانی بووە، بەلام پێش هەلسانەکەی ئەیلوولی ١٩٣٠ (شەش رەشی ئەیلوول) دەستی لە وەزیفە هەلگیراوەو لە وولات دوورخراوەتەوەو زیاتر لە لبنان ژیانی ئاوارەیی بردوتە سەر .

ـ لە سالی ١٩٣٥ گەراوەتەوە وولات و بووە بە بەرێوەبەری گشتی‌ی کارو باری رێگەو بان، ئنجا بووە بە بەرێوەبەری گشتی‌ی تۆپۆگرافی (مساحة) .

ـ چەند جارێك بووە بە وەزیر، بەلام وەزیری‌ی زانیاری (معارف)ی لە هەموویان زیاتری پێ‌خۆش بووە. لەپاشانا وازی لەوەزیفە هێناوەو بووە بە ئەندامی سینات (عین) لە پەرلەمانی عیراق دا.

ـ لە ناوەراستی سالی ١٩٥٨ چووە بۆ بەریتانیاو لە لەندەن ژیاوە تا کۆچی دوایی لەسەرەتای سالی ١٩٨٤ .

ـ کۆمەلێك کتێب و ووتارو باسی زمانەوانی‌و مێژوویی‌و ئەرکیۆلۆجی‌و فۆنۆلۆجی‌و ئەنتۆلۆجی‌و ئەدەبی بەزمانانی کوردی‌و عەرەبی‌و ئینگلیزی بلاوکردۆتەوە .

## تۆفیق وەهبی کوری پیرەمەگروون

لەپاش کۆچی دوایی زاناودانای گەورەمان هەندێ نووسین لە بابەتیەوە بلاوکرایەوە، لەناوەوەی وولات و لەدەرەوەی، دیارترینیان ئەو لێکۆلینەوە زانستی‌یەیە کە هاورێم کەمال رەئووف محەمەد بەناوی «تۆفیق وەهبی کوری پیرەمەگروون» بلاوی کردۆتەوە. بنوارە (کۆواری «کاروان» ژ ١٨، ئازاری سالی ١٩٨٤ ، ل ٢ ـ ١٦) .

### ئەنجام

**تۆفیق وەهبی زاناو دانا بوو، مامۆستاییکی چاك بوو، رێزی لە زانای رەسەن دەنا، قوتابی‌ی زیرەکی خۆش دەویست، سوپای‌یێکی گەورەبوو، بەلام نەیدەویست دیمەنی خوێن ببینێ، دلسۆزی‌ی بەرامبەر دۆست و هاورێیانی بێ‌سنوور بوو، چاوتێربوو، هەلسوکەوتی پیاوانەبوو، لەپێوەندی‌ی کۆمەلایەتی‌دا دیمۆکراتیانەبوو. لەگوران و جوولانەوەدا بوو، باوەری بەوەستان نەبوو. رقی لەکەس نەبوو. سۆزی بەرامبەر رۆژهەلاتناسانی ئەوروپا بەنەتەوایەتی‌و رژێمی وولاتەکانیانەوە نەدەبەستەوە. چەندە ئەدەمۆندسی ئینگلیزی خۆش دەویست ئەوەندە گلەیی لە قوتابیەکەی دەکرد کە مەکەنزی‌یە .**

**تۆفیق وەهبی بە کوردی ژیاو بە کوردی مرد، پیرەمەگروون بە لای ئەوەوە دروشمی «ناهید» و «میترا» بوو، لەبەر ئەوە بوو ئەوەندەی من ناسیوەمەو دیومە، ناوی پیرەمەگروون لەسەر دەمی نەکەوتووە، بۆیە بوو بەیارو یاوەری هەمیشەیی پیرەمەگروون .**



# زانیاری زمان و مێژووی زمانی کوردی

پروفیسۆر . پاکیزە رفیق حلمی
مامۆستای زانستی بەراوردی زمان
کولیجی : ئاداب زانکۆی صلاح الدین

ئەڵقەی (٤) لەم زنجیرە وتارە

---

لە وتاری پێشودا وتمان کە (کورتی وازا)ی میتانی بە یارمەتی . خاتیەکان گەرایەوە سەر تەختی میتانی یەکان لە (واششوگانی) پایتەختە کۆنەکەی ئیمپراتۆریەتی میتانی سەدەی چواردەدا . لە راستیدا سەدەی چواردەی پ . ز چەرخێکی پر لە کارەساتی گرنگ بو ، ولە مێژودا لە هەموو چەرخەکان رونترو ئاشکراتر بو ، بە هۆی ئەو هەموو نوسراوەی لە پاش نەتەوەو دەوڵەتەکانی کارەساتی ئەو چەرخەیان دەگێرا ـ ماوەتەوە ، هەتا دەتوانین ناوی بنێین چەرخی ئارشیفیو ساڵ نامە ، ساڵ نامەش ئەو نوسراوانە بو کە ساڵ بە ساڵ دەنوسرانەوەو لە ئارشیفی خانەی شایانەدا دەپارێزران . ئەم نەریتەش لە زەمانی خاتی و خوری و میتانییەکاندا داهات ، کە هەرچی روداوێك ببوایە دەبو بە فەرمانی شا بنوسریتەوەو بخرێتە ناو ئارشیفەوە .

دوای خاتیەکان ئاشوری یەکان ئەم ساڵنامەیان نوسیەوە بەڵام زۆری روداوەکان دەشێواو دەکرا بە ئەفسانەو راست و ناراستی لەیەك جیانەدەکرایەوە وەك ساڵنامەکانی خاتیو متیانی یەکان . جگە لەو ساڵنامانە نامەکانی (گردی عەمارنە)یە کە نزیك سێ سەد نامەی شاکانی ئەو چەرخە لە میسر دۆزرانەوەو زۆریان هی میتانیو خوری و کاشیو خاتیەکان بو بە تایبەتی نامەکانی (توشراتا) و (شوتارنا)ی میتانی.ئەم ساڵنامەو نوسراوانە زۆریان بە خەتی میخی و زمانی ئەکەدی کە زمانی دبلوماسیەتی ئەو چەرخە بو ، نوسراون ، و هەندێکیشیان بە زمانی خاتیو میتانیو خوری دیسان بە خەتی میخی وێنەی خۆماڵی ، وهەموی باسی کارەساتی ئەو چەرخە دەکات .

میتانی یەکان لەو چەرخەدا ، دەورێکی یەکجار بەرزو دیاریان هەبو لە ناو دەوڵەتەکانی دراوسێدا بە تایبەتی لەگەڵ (میسر) کەلە ئەو پەری دۆستایەتیو رێکی دابون ، هەتا (شوتارنا)ی شای میتانیا کچەکەی خۆی تا دو خەپا (Tadukhepa)یدا بە (ئەمنوفیس)ی سێیەم لە ١٣٨٥ ب .ز دا ئەم کچە میتانیە بە ناوی (نەفرەتینی)یەوە لە مێژووی میسردا ناسرا پێش کچەکەی ، خوشکەکەی (گیلوخەپا ـ Gilw khepa )ی دابویە ، هەر لەو چەرخەدا (کادشمان ئنلیل) مەلیکی کاردونیاشی کاشی کچێك و خوشکێکی دابو بە فرعەونەکانی میسر . کە ئەمە نیشانەی ئەوەیە ، ئیمپراتۆریەتی کاشوەکان و میتانییەکان لە تواناد ا لە ریزی میسر بون ، هەروەها دۆستایەتیان لەگەڵ فرعەونەکانی میسردا زۆر توندو قوڵ بوو گەیشتبووە پلەی خزمایەتی و ژن خواستن .

ـ خاتیەکان . لەم چەرخەدا بوژانەوە لە زەمانی ئیمپراتۆرە بە ناو بانگەکەیان (شوپیلو لیحوش) کە زۆر درو شەر کەر بوو دەمێك بو چاوی لە وڵاتی میتانیو خوری بو کە هاوسنور بو لە لای رۆژهەڵات و خوارووەوە لە گەڵیان دای بە سەر شاری حەلەب دا کە میرایەتیەك بو لە ئیمپراتۆریەتی میتانیدا ، و لە وێوە بە خۆی و لە شکرەکەیەوە پەرینەوە لای رۆژهەڵاتی (فورات) نزیك شاری (مەلاطیە)و داخلی وڵاتی میتانی بون و دایان بەسەرا (واشوگانی) پایتەختەکەی میتانی دوبارە پەرینەوە لە (فورات) و بەرەو حەلەب بە (قارچەمیش ـ طەرابلس) دا ئەمجارە (حەلەب) یان داگیر کردو ، لەوێ ، لەگەڵ خوریەکانی (سوریا) رێك کەوت و پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ گرتن ، لەو کاتەدا میتانی یەکان لەگەڵ خوریەکان تێك چوبون و لەیەك جیابوبونەوە. ئەم هێرشەی خایتەکان ، کارێکی زۆری کردە سەر سیاسەتی ئەو رۆژەو بە تایبەتی بە لای میسرەوە کە تا ئەو رۆژە تواناترین دەوڵەتی ئەو چەرخە بو شوێنی لە سوریادا لێژکرد کە پەیوەندیەکی زۆری هەبوو پێوەی باسی ئەو روداوانەی کە بە سەر وڵاتی سوریادا هاتوە ، لە نامەکانی

گردی عەمارنەدا ماوە کە میرەکانی ناردویانە بۆ فرعەونەکانی دوستیـان داوای یارمـەتیان کردوە بەلام وادیارە فرعەونەکان نەیـان توانیـوە بەرامبـەر خاتیـەکـان بوەستن و وەلامی ئەو نامانەیان نەداوەتەوە چونکە لەو کاتەدا کە ئەمنۆفیسی سێیەم مێردی (تـادو خەپـا)ی میتـانی (نـەفـرەتیتی) بو پیربوەو لە تواناىدا نەماوە یارمەتی وولاتی خوریو میتانی بدا .

ئیمپراتۆریەتی میتانی دوای ئەم هێرشە ئیتر خۆی نەگرتۆتەوە چونکە ولاتەکە خۆی پێش ئەوە لە ئاشوب دا بوەو میتانیەکان لەگەل خوریەکان تێك چوبون ولاتەکە بەش کرابو . (توشراتا)ی میتانی هەر خۆی برا گەورەکەی خۆی کوشتبوو هاتبوە سەر تەخت لە شوێنی ، دوایی خزمەکانی تەنگیان پێ هەل چنیبوو یەکێك لە براکانی لێی جیا بوەوەو چو بوە سەر تەختی خوری لە سوریـا لەگـەل ئاشوریەکان پەیمانی دۆستایەتی گرتبو دژی براکەی . و لە دوایدا توشراتا بە دەستی یەکێك لە کورەکانی لە سالی ١٣٦٠ پ . ز کوژرا . و کورە گەورەکەی کە (کورتی وازا) بوو رای کردە لای شای کاردونیاش ( بورنا بورباش ) لە بابل بەلام دالدەی نەداو ناچـار رای کردە لای خانیـەکـان کە بۆ هەلێکی وادەگەران ، یارمەتیان دا وەك باسمان کرد .

تاگـەیشتـەوە ( واشوگانی ) پایتەخت و چووەوە سەر تەختی حوکم . بەلام زۆری پێ نەچوو ( ئاشور ـ ئوبالیت ) ئاشوری لە سالی ١٣٣٠ پ . ز ولاتی ئاشوریای لە دەس میتانیەکان سەندەوە ، و ( کورتی وازا ) ئیتر ناوی نەماو کەس نازانێ چی لێهات . دوای ئەوە خاتیەکان ولاتی خوریەکانیان داگیرکرد لە سوریـا و لەگـەل ئاشوریەکان ریك کەوتن و هەر دوکیان لەو رۆژەوە بون بە تواناترین دوو دەولەتی ئەو کاتە لە ١٣٣٠ پ .ز. وە دوای فەوتـانی خاتیەکان لە ١٢٠٠پ . ز بە فەلاکەتێکی سامناك کە هەموو ولاتەکەی تیا سوتاو وێران بوو . ئاشوریەکان پەلاماری ولاتی خوریەکانیان دا لە زەمانی ( شەلوم نەسر ) ی یەکەم دا و داگیریان کرد کە لە سالی ـ١٢٧٤ ـ ١٢٤٥ پ .ز دا لەســەر حوکم بوو. وەبـەمـە دوای حوکمی ( میتـانیـا ) و (خوریا)کۆتایی هات وەك دەولەتێکی گەورە وولاتی ( خانی گال پات ) پارچـە پارچـە کراو هەر پارچەیەکی یا بەشێکی بو بە میرایەتیەکی بچوك .

ولاتی ( خانی گال پات ) ناوی ولاتی میتانیای کۆن بو، لە پاشـاکە میتانیەکان لەگەل خوریەکان خزمیان بون بە یەك ناوی ئیمپـراتـۆریـەتـەکـەی پێکـەو ە دایـان مەزراند بو بە ئیمپراتۆریەتی ( میتانی ) و پایتەختەکەی ( وا شوگانی ) بو . خوری میتـانی لە راستیدا کۆمەلە ئیلاتی یەك نەتەوە بون و زمـانـەکەشیان دو شێوە زمانی یەك ریشە بو وەك سورانی و کرمانجی ئێستە یا کرمانجی سەرو و خوارو . کۆنترین نمونەی ئەم دو زمـانـە کە بەزمانی ( خوری ) (khurri ) یە ، نوسراوە مێخیەکانی ( تیشاری ـTishari ) بە مەلیکی ناوچەی ( ئۆرکیش و نەوارـurkish – Nawar ) کە بەشێك بوە لە ولاتی خوریەکان ، ئەم نوسراوە لە هەزارەی دوهـەمـدا نوسراوە ، کە لە کۆتـایی دەوری ئەکەدی دا تیشاری ژیاوە . دوای ئەوە کۆمەلێ نوسراو لە ئارشیفەکەی دەولەتی ( ماریـ Mari ) دا بە زمانی خوری دۆزراوەتەوە ، دیسان هی هەزارەی دوهەم دەولەتی ماری نزیك ئاوی خاپور لە سالی ١٧٩٢ پ . ز دامەزراوە. کۆمەلێ تێکستی تری نوسراو بە خەتی مێخی و زمانی خوری لە ( حەلەب ) و ئوغـاریت ) و گەلی شوێنی تر لە سوریـا ، هەمو لە هەزارەی دوهەمدا نوسراون یەکەم جار نمونەی زمانی میتانی لە نامەکانی (گـردی عەمـارنـە) لە میسر دوزرایـەوە کە لەشـاکـانـی ئیمپراتۆریەتی میتانیەوە (توشراتا – Tushrata )و (شوتارناـ Shutarna )وە نوسراون بۆ (ئەمنوفیس Amenophis )ی سێیەم و چوارەم ، فەرعەونی میسر یەکێك لەو نامانە کە لە سەر خشتێکی گەورە نوسراوە بە خەتی مێخی و پێشـەکیـەکی بە زمـانـی ئەکـەدی ـ بە زمـانی میتـانی نوسراوە لە ( توشراتـا ) وە بو ئەمنـوفیسی سێیـەم . کە بە دورو درێژی باسی دۆستایەتی و خزمایەتی دەکا بە بۆنەی گواستنەوەی ( تادو خەپا ) ی کچی (توشراتا) بو ( ئەمنوفیس ) سێیەم فرعەونی میسر .

بەمەدا دیارە کە زمانی (خوریو میتانی) کە بەیەك زمان دادەنرێن ، زمانێکی رەسمی ئیمپراتۆریەتی (میتانی) بووە و لە ناوچـەیـەکی زۆر فراواندا بەکار هاتووەو لەگەل ئەوەشدا کە زمانی ئەکەدی لە هەزارەی دوهەمدا زمانی دبلوماسیەتی هەمو دەولەتـەکـانی ئەو چەرخانە بووە، بەلام زمانی میتانی بەکار هاتـووە لە لایـەن شاکـانی (میتـانیـا) لە نوسراوە سیـاسیو

دبلوماسیەکانیانداو لە کاروباری تایبەتیو خۆیشداو . زمانی رەسمی ناوچەیەکی گەلێك فراوان بووە کە لە ئەراراتەوە هەتا دەریای سپی گرتۆتەوە ، بە پانی، ولەئەنادۆڵەوە هەتا خوار زێی بچوك بەدرێژی . هەر لە زەمانی سۆمەریەکانەوە خوریەکان لە وڵاتی بابل ـ ئەگەدەدا ژیاون بەمەدا دیارە کە میتانی بە ئاریەکان و خوریەکان لە ناوچەی ژوروی میزۆپۆتامیاو سوریادا هەد هەبوون ، وئەو ناوچەیە پێش ئەوان هیچ نەتەوەیەکی تری غەیرە ئاری تیانەبووە . هەروا ئەو نەتەوە ئاریانەی کە لە هەزارەی دوهەم دا بە ناوی میتانیو خوری لەو ناوەدا ژیاون باپیرانی ئەم نەتەوانەی ئێستەن کە لەم ناوچەیەدا دەژین بەناوی (کورد) ەوە وەزمانی

میتانیو خوری بێگومان دایکی زمانی کوردین ئەگەر بۆ خزمایەتی بگەرێین ، واتە زمانی کوردی شێوەی زمانی میتانییە لە هەزارەی یەکەمەوە تا ئێستە، وئەبێ زمانی (ماد) کە لە دواییدا لەوتاری ئایندەدا باسی دەکەین هەر شیوەیەکی زمانی میتانی بێ پاش لێکدانەوەی ئەو کۆمەڵە نوسراوانە لەم چل پەنجا ساڵەی دواییدا، توانرا بە تەواوی زمانی (میتانی) بناسریتەوەو بزانرێ کە زمانێکی (ئاری) سافە، وخزماتیەکی زوری هەیە لەگەڵ زمانی خاتیو سۆمەری،و سانسکریتی ئاڤێستای، ونمونەی زمانە ئاریەکانی هەزارەی دوهەمە کە بەشتا هەر لە مەڵبەندەکەی خۆیدا (وڵاتی ئاریان)دا بوون . و نەگەیشتبوتە هندستان یا ئەوروپاو هەر کاتەدا خۆیان میتانیو خوریەکان بە خۆیان دەوت (ئاری) دیارە وشەی ئاری زۆر کۆنترە لەو مێژووەی کە بۆی دانرابو واتا هەزارەی دوهەم . چونکە دەرکەوت کە سۆمەریەکان بە وڵاتەکەی خۆیان دەوت (ئوریکی ـ uriki ) یا (Ariki)واتا وڵاتی ئوری ـ ئاری . هەروەها وشەی (ur) کە ناوی شاری (ئور ـ ur )ە کە شارێکی سۆمەری بو لەوەوە هاتوە (ئورەك ـuruk ) دیسان ناوی شارێکی تری سومەریە ، ناوی (عـراق IRak ) کە بێگومان ناوی (ئـوروك ـ uruk ) خۆیەتی، بە لادانێکی فۆنەتیکیەوە کە زۆر تەبیعیە، روبد لە ماوەی سێ تا چوار هەزار ساڵ بەکارهێنانی وشە کە لە چەند زمانێکی بێگانە بە یەك لەو وڵاتێکدا . لە یەك چونی ئەم ناوانە لە لایەکەوەو ساغ بونەوەی ئەوە کە سۆمەریەکان ئاری بون لە لایەکی ترەوە هەروەها نەتەوەکانی تری ئاری کە لە هەزارەی چوارەمەوە لە زاگرۆسەوەو لای رۆژهەڵاتی دجلەوە، تێکەڵ بە سۆمەریو ئەکەدی بون و نسبەتێکی گەورەی خەڵقی وڵاتەکەیان دروست کردووە وەك کاشوەکان کە لە چوار سەد ساڵ زیاتر هەموو وڵاتی بابلیان بە دەس بووەو پێش ئەوەش هەر لەو ناوەدا بون و دورنییە لەگەڵ سۆمەریەکان پێکەوە لە میزوپوتامیای ژورو لە زاگرۆسەوە هاتبن ئەم راستیانە کە هەمو بە بەڵگەی ئارکیۆلۆجیو ئەنثروپۆلوجیو فیلولوجییەوە پتەو کراون و ساغ بونەتەوە ئیتر گومان لەوەدا نەماوە کە ئاریەکان لە هەزارەی سێیەمەوە هەتا خواروی مێزۆپۆتامیا هاتون و لە پێشدا هەر لە ژوروی وڵاتەکەدا بون لە مەڵبەندی پەیدابونیاندا، لە یەك چونی ئەم وشانەش وەك ئوریکی ـ وڵاتی سۆمەر ئور شارێکی سۆمەری (ئوروك ـ ئیرك) شارێکی تری سۆمەری . (ئاریانی ـ میتانی) (عیراق ـ ئیراك) دیارە بێ هۆ نییەو ئەبێ پەیوەندیەکی زمانی هەبێ لە بەینیاندا کە زۆر ئاشکرایە هەیە بە تایبەتی کەساغ بووە نەتەوەکانی (سومەری، کاشو، میتانی، خوری، خاتی) هەمو، وەچەی یەك خێزانی زمانن و لەیەك ناوچەدا پەروەردە بون و لەوێوە بڵاوبونەتەوە .

ئەم زانستە بەرامبەر ئەم نەتەوانەو زمانەکانیان وەك وتم تا چل پەنجا ساڵ لەمەوپێش بە ئەفسانەدا دەنرا، ئێستە بیرو باوەرە کۆنەکانی پێش ئەمە بوو بە ئەفسانە ! بە بەراوردکردنی ئەو زمانانەی باسم کردن هەمو زمانی لکێن وکەرتەی بن وشەکانیان لە سەرەتادا لە کەرتە ـ برگەیەك یا زیاتر پەیدا دەبیو دوای بەهۆی مورفیمی لکێنەوە وشەی تری لێپەیدا دەبی بۆ مەبەسی تازە، ئەم مورفیمە لکێنانە ئەشێ پێشگر ، پاش گر، ناوگر بن هەمو جۆرە وشەیەك مورفیمی لکێنی خۆی هەیە کە لە مورفیمە سەرەکیەکە جیا دەکرێتەوە بەئاسانی جگە لەوەش لەم زمانانەدا بەهۆی دارشتنی پێوانەشەوە وشەی تازە لە وشەی سەرەکی دادەرێژرێ کە هەردو جۆرەکە دەبن بە هۆی پەرەسەندنی زمانەکەو دەوڵەمەندی .

نزیکی ئەم زمانانە لەیەك ، هەر بەجۆری دارشتنی وشەدا دەرناکەوێت، گەلێ تایبەتیەتی تری، جەوهەری هەیە کە وەك رۆژ دیارەو ئینکار ناکرێت ، وەك شێوەی بیرو باوەری (دین)

که یەکێکە لە تایبەتیەتی هاونەژادی، جۆری بیرو باوەر بە تایبەتی ئاین و خوا پەرستن نشانەی یەك یەتی دەرونی‌یە ئەم یەکیەتی‌یەی دەرون بە هۆی یەکیەتی ژیانێکی کۆمەڵایەتی‌یەوە پەیدا دەبێ، کە زمانیش نشانەی ئەو یەکیەتی کۆمەڵایەتیەیە .کەوابو کۆمەڵێك کە ژیانێکی یەك گرتوی تایبەتی تیا هەڵ کەوێ زمان و ئاین ی ئەو کۆمەڵە یەك دەبن و ئەمانەش دەبن بە کۆڵەکەی بناغەی نەتەوایەتی کە یەکەم کۆڵەکەی ئەو خاکەیە ئەو کۆمەڵەی تیا پەروەردە بوە ئینجا نەژاد ، کەوابو- مایەی یەکیەتی ئینسان و خاکە لە مێژوودا ، **بێ گومان نەتەوە** ناوبراوەکانی سەرەوە یەك نەژادن **بە هۆی یەکیەتی خاك و** ئینسان و بیرو باوەر و زمانیان .

تەرزی بیرو باوەری ئاینی ئەو نەتەوانە ( **ئاریەکان ) تارادەیەکی** زۆر وەك یەك بووە ، لە پێش هەمو شتێکدا ، **زۆر باوەریان بە** هێزی ئاسمانی هەبووە کەلە هەموویان **گرنگتر ( رۆژ) بووە کە** بە زمانی سومەری ناوی ( ئوتو- utu )**بووەو پێویست نی‌یە** **بڵێم ئەم وشەیە زۆر نزیکە لەوشەی ( هەتاو ) لە کوردیدا و** **دەنگی ( هـ ) و ( د ) لەیەك سازگەن و زۆر جێ گۆرکێ دەکەن** **وەك ( هەو - ئەو ) ( هەسپ - ئەسپ ) ( هێستر - ئێستر ) نەك** لە کوردیدا لە هەمو زمانێکی تردا وەك لە **عەرەبیدا** ( اراق - هراق ) ( ال ) نشانەی پێ ناسین ئەبێ بە ( هل ) لە زمانە سامیەکانی تردا . نموونەی ئەمە زۆرەو پێویست بە درێژکردنەوە ، نی‌یە وشەی ( utu )کە ناوی خودای روناکی‌و رۆژی ئاریەکان بووە لە زەمانی سومەریەکانەوە هەبووە ، هەروەها لە ناوی خوداو شار وولاتی ( ئاشوریا ) دا هەیە کە یەکەم کەرتی وشەی ئاشور پەیدا دەکا وە وشەکە لێك دراوە لە دو وشە ئاتو - ئاشو - ئوتو کە ئەبێ لە ( ئوتو - utu ) یەوە وەرگێرابێ و ئور - ئوری - ئاری) کەئەبێ لە (ئاری)یەوە وەرگیرابێ‌و پێکەوە بوبن بە ( ئاثور - ئاشور ) واتا ( رۆژی ئاری ) ئەمە بە سەرنجێکی ورد دەردەکەوێ کە بە ئختزالێکی کەم و گورینی ڤاوڵی ئوتو بووە بە ( ئات - ئاث و ) ئاری - ئوری بووە بە سور بۆ مەبەس لێك دان و هەردو وشەکە بون بە ( ئاثور - ئاشور ) کەمانای نور - روناکیش دەدا لێرەدا ئەوی سەیرە بە زمانی عیراقی وشەی ( نور ) روناکی عەرەبی ( ئورە ) ! کە ئەوەش رەنگە لە زمانی خاتی ، کە ئەویش ( ئاریە ) ئەبێ وەرگێرابێ چونکە جاری یەکەم خوریەکان ماوەیەکی زۆر لە فەلەستیندا بون ، دوهەم عبرانیەکان زۆر تێکەڵ بون لەگەڵ خاتیەکان ، سێیەم عبرانیەکان هەمە رەنگن نەژادێکی یەك رەسەن نیین و دور نی‌یە هەندێکیان خاتی‌و خوری بوبن ( ئاری ) کە مانای ( پاڵەوان ) ە دوریش نی‌یە مانای رۆژو رۆژهەلاتیش تێدابێ! ناوی‌خوداکانی تری **ئاریەکان وەك یەك بون** و تا رادەیەکیش ناوەکانیان ماوە لە ئاین **براهمانی هندستاندا** وەك ( ڤایا- با - توندەبا ) کە خوایەکی زۆر **بە رێزی ئاریەکانەو ( مێ )** یە ، و وەك ( دێڤا - deva ) دیو بە **کوردی و**dyaos به ئاڤستای . وزیوس بە یونانی و دیو بەلاتینی **خودای ئاسمان و** گەورەی هەمو خواکان بووە لەناو نەتەوە **ئاریەکاندا** ، دیو- کە ئێستە لە زمانە لاتینیەکاندا لە شێوەی ( **دیو - dyo** ) دا ماوەتەوەو ناوی خودای‌یەکانەیە ، لە زمانی **کوردیدا** ناوی **هێزێکی** نادیارە کە دو تەبیعەتی هەیە، یا دو جۆر **دیو هەن** لە میثولوجی کوردیدا دێوی خێر و دێوی شەر کە **ئەمەش رەنگە پاشماوەی** ئاینی دو هێزی = ( ثنائیة - duelism)

بەلام لە فکری ئێستەی کوردی مسڵماندا لە پلەی خوایەتی هاتۆتە خواری تەنها وەك هێزێکی ترسناك باس دەکری . ئەمەش بێ گومان بە هۆی کاری ئاینی ئیسلامەوەیە. و گەلێ خودای تر کە لە نوسراوەکانی میتانی و خوری‌دا ناویان هاتووەو لە ڤیداکانی هندی سانسکریتی دا دوایی لە هەزارەی یەکەمدا دا ناسراون وەك ( میثرا ) و ( ئندرا ) و ( ڤارونا ) کە دیارە هەمو خوای ئاریەکان بون بە گشتی لە کۆنەوە . نەك هەر ئەمە بەڵکو زمانی میتانی ئەوەندە نزیکە لە زمانی سانسکریتی‌یەوە کە دەتوانین هەندێ لە نوسراوە میتانی‌یەکان تێبگەین بە هۆی بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی سانسکریتی‌دا ، بە تایبەتی ئەو وشە تەکنیکی‌یانە کە پەیوەندیان بەهەندێ زانستەوە هەیە وەك ئەو زاراوانە پەیوەندیان بە پەروەردەکردنی ولاخەوە هەیە کە هەمودەزانین ولاخ پەروەردەکردن و سواری ، نەتەوە ئاریەکان دایان هێناوە ولە هەمو ناوچەکانی ولاتی ئاری ئەم پیشەیە رەسەن بووە و ئاریەکان هەمو بەسواری و سوار چاکی ناویان دەرکردووە هەتا چینێکی تایبەتی سوارە هەڵ کەوتووە کە زۆر بە

ریز بووە لە وڵاتی ئاریاندا ناوی ماریانا ـ Maryanna بووە کە بە زمانی میتانیی‌یە ئەم وشەیە و لە سانسکریتیدا بووە بە Mary و لە کوردیدا ( سوارە ) ئەم چینە بەرزو بە زۆر ئەرستوکراتی بووە و گەلێ جار هاتۆتە سەر تەختی دەوڵەت وەك میتانیی‌یەکان کە شاکانیان لەو چینە بووە .

خوریـەکـان لەسەدەی شازدەدا گەیشتونەتە ئەو پەری هێزو توانا لە سوریاداو بو ن بە سەرکردەو حوکمدار لە وڵاتەکەدا و تەنگیان بە خاتیەکان هەڵ چنیوە کە تا ئەو کاتە بە دەستەڵات بون لە سوریادا ، وەگەلێ نوسراو لە ئەرشیفی ساڵ نامەکانی خاتیـدا باسی روداوەکانی ئەو کاتە دەکاو دەوری خوریەکان رون دەکاتەوە لە سوریادا ، ئەو نوسراوانە لەسەدەکانی هەژدەو حەڤـدەو شازدەدا نوسراون یەکـێـك لەو نوسراوانــە ناوی ( ئەفسانەی کانی پاڵ ) ی ناوە ، کە باسی چوار میری خوری دەکا چۆن چون بۆ لای میری ( ئیلان ـ سورە ) و خەڵاتیان بۆ بردووە ، ئەفسـانەیەکی تر باسی کورەکانی خوای ( توندەبا ـ رەشـــەبـا ـ Strong God ) دەکـا کە لە جەنگـدان لەســەر سەرۆکـایەتی وڵاتی خوری دیارە لەسەرەتادا وڵاتی خوری و میتانی وڵاتێکی یەك گرتونە بووە وەك دەوڵەتەکانی ئەو کاتە کە لە پێشدا لە چەند دەوڵەتێکی یەك شار پەیدا بووەو دوای یەکیان گرتـووەو دەوڵەتی کونفـدراڵـیـان دروست کردووە ، میتانی و خوریـەکـانیش بەو چەشنـە ئیمپـراتـوریـەتـەکـەی خۆیان دامەزراندووە کە بەشی میتانی لە ئاراراتەوە تا ئاوی خابوری گرتۆتەوەو بەشی خوری لە ئاوی خابورەوە تا گوێ دەریای سپی ، وهــەردو دەوڵەتە یەك شاریەکانی ئەو ناوەکە یەکیان گرتووە ئیمپـراتـوریـەتی میتـانی لێ پەیـدا بووە ، لەو دەوڵەتــە یەك شاریانەی سوریا ، دەوڵەتی (ئالالاخ) و (حەڵەب)و(ماری ) و ( ئوغاریت ) بون کە بەناوی میرەکان و خواکانیاندا دیارە خوری بون ، و گەلێ نوسراو بە زمـانی خوری لە ساڵ نامــەکـانیادا دۆزراوەتــەوە کە بەزمـانی خوری و خەتی مێخی نوسراون ، یەکێك لەو نوسراوانە لە میری شاری ( تونیپ ـ Tunip )ەوە بۆ فرعـەونی مسری ناردووە و لە ئەرشیفی ( گردی عەمــارنــە ) دۆزراوەتەوە کە دیارە زمانی خوری بەکار هاتووە بەرەسمی لە بەینی دەوڵەت و شارەکانی میتانی و دەوڵەتەکانی دراوسێیان ، لەگەڵ ئەوەدا کە زمانی ( ئەکەدی ) لەو چەرخەدا و لە هەزارەی دوهــەمدا زمانی رەسمی دیپلوماسیەتی ناو هەمو دەوڵەتەکانی ئەو رۆژانە بووە خوریەکان خەتی مێخی تایبەتی خۆماڵی خۆیان هەبووە و تارادەیەك بەکار هاتووە بۆ زمانی تر وەك ( ئوگەریتی کە لە سوریادا بووە خەڵکی ( ئوگاریتی ـ ugarit دوزمان بون) ، کەنعانی و خوری ، خەتە مێخیە خوریەکەیان بەکار هێناوە بۆ هەردو زمانەکە .

هەندێك لە نوسراوی خوریەکان بە دوزمان نوسراوە ، خوریو ئەکەدی لەبەر ئەوە ( نامە نوسەرەکان ـ Scyibe ) دەبو هەردو زمـانەکە بزانن . لەپاڵ ئەوەشدا چەندەها فەرهەنگ بە هەردو زمـانـەکـە خوری و ئەکـەدی ئامادە کرا بوە سەرەرای ئەوە دەستوری نوسین و لەگەڵ ئەوەش مەکتەبی فێرکردن لە هەموو شارێکدا هەبووە بەلام دیسان زۆری نوسراوەکان پڕن لە هەڵەی نوســین و رێـزمـانی ئەکـەدی چونکـە زۆری نوسەرەکان خوری بون و زمانی ئەکەدیان باش نەزانیوە میتانی و خوریـەکـان بە پیچــەوانــەی ئەو بیروبـاوەرە نارەوایـەی بڵاوکراوەتەوە دەربارەیان و دەڵێ کە هیچ هونەرێکیان نەبووە و نوسراو بەدەستــەوە نیـیە بەزمانەکەیان ، چەند ناوی ( میر ) وشوێن نەبێ ، گەلێك نوسراویان لە ئارشیف و ساڵ نامەکانی (ماری ) و ( حەڵەب ) و( ئالالاخ ) و( ئوگاریت ) دا بەجێ ماوە، هەروەهـا لە ئارشیف و ساڵ نامەی خاتیەکان ، لەبان ئەوانە شەوە نامەکانی ( گردی عەمارنە ) ی سەدەی چواردەو سیانزە! و گەلی لە ئەفسـانەو ئاین نامەو ئەدەبیاتی سومەری لەرێی خوریـەکـانــەوە و بە زمــانی خوری گەیشتونەتە خاتیەکان و مسریـەکان هەروەها ئەو زاراوە و نوسراوانەی دەربارەی وڵاخ پەروەردە کردن و سواری هەمـو هی خوریـەکـانەو بە زمانی خوری نوسراون .

فرعەونەکانی میسر لە خوریەکانەوە فێری سواری و ( عەرەبانە ـ Chariot ) بەکارهێنان بون ، کە هێریشیان بردۆتە سەر وڵاتی خوری ـ سوریـاو ئەو چینە سوارە یەیان ناسیوە هەندێکیان لەگـەڵ خۆیـان بردووە بۆ مسر بە ئەوپەری رێزەوە بۆ ئەوەی مسریـەکـان فێری سواری ووڵاخ پەروەردە کردن بکەن ، ئەو تاقمە (سوارە ـ Maryanna ) یە دەورێکی‌زۆربەرێزو دیاریان

گیراوه له کۆشکی فرعه‌ونه‌کاندا که کاریکی گرنگی کردوته سه‌ر بیرو فکری مسر ، وپیشه‌و نه‌ریتی کۆمه‌لایه‌تی‌یان، دوایی که گه‌راونه‌ته‌وه ولاتی خۆیان دیسان به ئه‌و په‌ری ریزه‌وه ره‌وانه‌کراون ، ئه‌وانیش گه‌لێ نه‌ریت و پیشه‌ی مسری‌یان له‌گه‌ل خۆیان بردوته‌وه بۆ شاره‌کانی خۆیان .

زمانی خوری‌و میتانی ئه‌وه‌نده له گه‌ردا بون له‌و ده‌وره‌دا هه‌تا ولاته‌کانی که به نه‌ژاد خوری نه‌بون خوداکانی خوریه‌کانیان ده‌په‌رست و ناوه‌کانیان به‌کار ده‌هێنا بۆ پیرۆزی وه‌ك ئێسته له زمانی عه‌ره‌بیدا ناوی تایبه‌تی له‌ناویك و ناوی خودا لێك ده‌دری‌و ده‌لێن ( عبدالله ) ئه‌وسا ناوی ( خه‌پا ـ خه‌پات ) که ناوی دایکه خودای خوریه‌کان بو به‌و شێوه‌یه به‌کار ده‌هات ، و ناوی تایبه‌تی شای شاری ( قودس ) ( عه‌بدی خه‌پا ) بووه مسری‌یه‌کان به ولاتی ( سوریا و فه‌له‌ستین ) یان ده‌وت ولاتی خوریه‌کان که مه‌به‌س ته‌نیا له نه‌ژاده‌که بووه ، دوایی بووه به ناوی جوغـراف ( خاك ) و مه‌به‌س له ولاتی خوری ، خاکی خوریه‌کان بووه .

خه‌تی مێخی خوری تایبه‌تی نه‌ك مێخی ئه‌که‌دی ، به‌کار ده‌هات بۆ نوسینی هه‌مو زمانه‌کانی ئه‌و ده‌وره ، که جیابو له‌گه‌ل مێخی ئه‌که‌دی چونکه وێنه‌ی ده‌نگی ( بزوێن ) ی تیا بو ، وهه‌مو ده‌نگێکی [ ئاوازدار ـ consonant ] ئه‌بو له‌گه‌ل ده‌نگی بزوێنه‌که‌ی بنوسرێ و وه‌ك ( ب ) به ته‌نیا نه‌ده‌نوسرا ئه‌بو ( بێ ) ( با ) ( بو ) ( بۆ ) ( بی ) بنوسرێ و ئه‌مه‌ش له زمانی سۆمه‌ریه‌کانیشدا هه‌بووه، به‌لام که‌نه‌ته‌وه سامیه‌کان که‌وتنه ولاتی میزوپۆتامیاو له سۆمه‌ریه‌کانه‌وه فێری نوسین بون ده‌نگی بزوێنه‌کانیان له نوسینه‌که‌دا ( قرتاند ) له‌به‌ر ئه‌وه ژماره‌ی وێنه‌کانیان که‌م کردوه تا بو به (١٨) دانه ، به‌لام خوریه‌کان ژماره‌ی ده‌نگه‌کانیان بو به (٣١) دانه ، ئه‌م ژماره‌یه جاری سێ ده‌نگی بزوێن خرایه سه‌ر که (و) (ی) (ا) بون ، ئینجا هه‌مو ده‌نگێك به سێ جۆر ده‌نوسرا به‌گوێره‌ی بزوێنه‌که‌ی ، له‌سه‌ر ئه‌مه‌دا هه‌ندێ وێنه‌ی (١) تریان خسته سه‌ر که ده‌نگیان نه‌بو له زمانه ئه‌که‌دی‌یه‌کاندا وه‌ك (ژ) که ئێستاش له شێوه‌ی عه‌ره‌بی سوریاو لبنان دا ماوه که (ج) ده‌گۆرنه‌وه به (ژ) وه جه‌مه‌ل ده‌بێ به (ژه‌مه‌ل) و جبن ده‌بێ به ( ژبن ) خوریه‌کان نه‌ك هه‌تا گوێ

ده‌ریای سپی به‌ره‌و رۆژئاوا رۆیشتون، هه‌تا شاری که‌رکوکیش به‌ره‌و خوار ولاتی خوری بووه که له پێشدا ، ناوی (ئاراب خا ) بووه و گۆرپویانه به ( نوزی ) ئه‌م شاره له زه‌مانی ئه‌که‌دیه‌کاندا ناوێکی ئاری‌و کوردی هه‌بوو که ( گاسور ) هو دیاره شارێکی گه‌وره‌و ئاوه‌دان بووه کۆنینه‌کانی پله‌ی ( ته‌په‌گه‌وره ) و (گردی بله) یه . و له‌سه‌ده‌ی شازده‌دا ئه‌م شاره به‌شێك بووه له ئیمپراتۆریه‌تی (میتانی خوری) .

به‌داخه‌وه شاری ( که‌رکوك ) خۆی تا ئێسته کۆنینه‌کانی نه پشکنراوه ، نازانم بۆچی ؟ چونکه باوه‌ر ناکه‌م ئارکیولۆجی و زانایانی زمان بیریان لێ نه‌کردبێته‌وه ! چونکه ئه‌و ناوچه‌یه نرخێکی زۆر زۆر گرنگی هه‌یه له ساغ کردنه‌وه‌ی مێژوی نه‌ته‌وه‌کانی ولاتی میزوپۆتامیا به‌گشتی ، وپله‌ی شارستانی دوای چه‌رمو به تایبه‌تی که ئه‌بێ پێش ( حه‌سونه) و (تل الصوان ) بێت . ئومێد ئه‌که‌ین ، به‌رێوه‌به‌رایه‌تی ئه‌نتیکه‌خانه که ئه‌رکی لێ کۆلینه‌وه‌ی کۆنینه به ده‌سته‌وه‌یه له‌م لایه‌نه‌وه ئیتر بێ ده‌نگ نه‌بێ ودرێغی نه‌کا له رون کردنه‌وه‌ی مێژووی ئه‌و ده‌وره !

به‌لام له‌گه‌ل ئه‌وه‌شدا له ( یورغان ته‌په) که نزیك هه‌شت میل له رۆژئاوای که‌رکوك ، هه‌ندێ کۆنینه دۆزراوه‌ته‌وه‌که به ته‌واوی ئاشکرای ئه‌کا ئه‌و ناوه به‌شێك بووه له ولاتی (میتانیا) هه‌ندێ نوسراوی مێخی به زمانی ئه‌که‌دی لێ دۆزراوه‌ته‌وه له یه‌کێکیاندا ده‌لێ: خه‌لقی شاره‌که خوری بون و شاکه‌یان ناوی (پارات تارنا ـ) ( Parat Tarna ) بووه .(٢)

١ـ بروانه‌ره سه‌رچاوه (١)

(٢) بروانه‌ره سه‌رچاوه (٩)

ولاتی میتانی هه‌مو ژوروی مێزۆپۆتامیا بوه‌که له شاخه‌کانی (ئارارات) و زاگرۆسه‌وه ده‌سی پێ کردووه هه‌تا ئاوی خاپورو له خابوره‌وه تا ده‌ریای سپی ولاتی خوری بووه وه‌ك وتم و سنوری ئیمپراتوریه‌تی ( میتانی و خوری ) داویه له سنوری بابل له زه‌مانی ئه‌که‌دی و کاشوه‌کاندا . له سال نامه‌کانی ( ئاشوریا ) دا به‌م ولاته‌یان وتووه (Khanigal bet ـ خانی گال بات ) و پانی ته‌خته‌که‌ی ناوی (Wash shuganni ـ واشوگانی ) بووه نزیك

سەرچاوەکانی ( خاپور) کە ئەبێ برگەی یەکەمی لەو شەی کە ( خەپات ) خودای خوریەکان وەرگیرابێ ( پور ) یش بە زمانە ئاریانەکان (نەوەی) نێرە (کور) بە کوردی کە دیارە ناوی ئاوەکە ئەبێ ( کوری خەپا ) بێ بە خوری و بووە بە ( خاپور ) ، یەکەم شای میتانی نوسراوی لە پاش بە جێ مابێ ( ساوستانار ) (Saustatar )ە کە بە زمانی ئەکەدی نوسراوە بە ولاتەکەی خۆی وتـووە (خـانی گاڵ پات) ( ولاتـی میتـانـی ) . لە نوسراوە خوریەکاندا خۆیان دەڵێن (خورە ـ Khurrhe )میری ( ئالالاخ ) کە ولاتەکەی بەشێك بووە لە ولاتی خوری بە شای خوریەکانی وتووە ( شای خوریە جەنگاوەرەکان ) .

بەلام ئاشکرایە کە ئیلاتی میتانی لەبەشی رۆژهەلاتی ولاتەکەدا بون و ئیلاتی خوریەکان لە رۆژئاوای دا . کە هەردو بەشەکە یەکیان گرتووە ناویان ناوە ئیمپراتۆریەتی میتانیو (واشوگانی) بووە بە پانی تەختی هەمـو ولاتـەکـە . لە نامەکانی ( گردی عەمارنە ) کە لە مسر گەلێ نامەی شاکانی میتانی کە لە سەدەی چواردە نوسراون و بۆ فرعـەونـەکـانی مسریان ناردووە وتازە دۆزراونەتەوە دیارە پەیوەندیەکی توند نەك هەر سیاسی ، بەلکو خۆییو خزمایەتی هەبووە لە بەینی هەردو ولاتەکەدا گەیشتۆتە دۆستایەتی و ژن خواستن و لەو نامانەدا ئاشکرایە ، هەردولا گەلێ مەراسیمی ئەو پەیـوەنـدیەیان بەجێ هێناوە لە خۆشی و ناخۆشیدا وەك تازیە نامە و پیروزبایی ، وسکالا کردن بۆ یەك بە نامەی دورو درێژ ئەم نامانەش بە پۆستەی تایبەتیدا لەرێی کاروانەوە هاتووە و چووە ، پۆستەچیش ، گورج و وریا بووە و زمـانی میتانی و ئەکەدی زانیوە و شارەزای مسری بووە . بۆ ئەوەی بتوانی پۆستەکە بە ئاسانی بگەیەنێت و لە ناوچەکەی پیا دەروا وریـابێ ، پۆستـەش نامـەی شاهانە بووە لەگەڵ گەلێ خەلات و دیـاری کە لە کیسـەیەکی چەرمدا کردویەتە ملی تا گەیشتـۆتـە جێ . خۆشی دیـاری و خەلاتی باشی لە هەردولا وەرگرتووە .

دۆستایەتی میتانی فرعەونەکانی مسر زۆر توندو خۆش بووە ، بە تایبـەتی لە زەمانی ( توشراتا )ی میتانی و ئەمنوفیسی سێیەم فرعەونی مسر .

لە یەکێـك لە نامەکانی ( توشراتا ) بۆ ئەمنوفیس سکالایەکی دورو درێژ دەکا لە حاڵ و ئەحوالی ولاتەکە تا خۆی هاتۆتە سەر تەخت پاش کوشتنی براکـەی و چۆن خاتیـەکـان هێرشیـان هێنانەوەتە سەر ولاتەکەیو چۆن ولاتەکەی لە چنگ دەرهێناو ـ نەتەوە و چی دەس کەوتووەو هەندێ لەو دەس کەوتانەی بە خەلات ناردووە بۆ فرعـەون و بەشێـك لەو خەلاتـانـە پارچە خشلێکی زێرینی جوانە بۆ ( گیلوخەبا ) ی خوشکی ناردووە کە ژنی فرعەونی مسر بووە . زۆری پێ نەچوو فرعەون خوازبێنی کچەکەی ( تواشراتا ) (تادوخەبا)ی کردوە ئەمجارە (توشراتا) وەك خەزور وەلامی فرعەونی داوەتەوە و لە نامەکەی دادەلێ [برا ، چەند لەوە زیاتر کە بۆم ناردی ، ئارەزودەکەی دەقاتت بۆ دەنـێرم!( ماڵ ماڵی خۆتە.و ولات ولاتی خۆتە!) ئینجا توشراتا داوای ئالتونێکی زۆر ئەکا بۆ مارەیی و جیازی ( تادو خەبا) کە بەناوی ( نەفرەتیتی ) یەوە ناسرا لە مێژوی مسردا ، و دەورێکی روناك و بەرز بینی لەوچەرخەدا ، لەو نامە یەدا ( توشراتا ) یەکە یەکە ناوی ئەو خشڵ و جل و بەرگانە بە زمانی میتانی دەنوسی و ماوەیەکی زۆری پێ دەچێ تا رێك دەکەون لەسەر خوازبێنی لەگەڵ ئەمنوفیسی سێیەم . لە نامەیەکی تردا ( تو شراتا ) باسی ئەو خەلاتـانـە دەکـات بۆ (تـادوخەبای) کچی ناردووە پاش گواستنەوەی بۆ فرعەون لە مسر . نامەیەکی تر باسی هەیکەلی عەشتـار دەکا کە ناردویەتی بە ئەمانەت بۆ فرعەون لە کاتی نەخـۆشیدا بە تەبەرۆك ، و فرعەون نەی ناردۆتەوە پاش چاك بونـەوە ، لێرەدا ( تۆشراتـا ) گلەیی لە فرعەون دەکاو داوای هەیکەلەکە دەکاتەوە .

نامەکانی میتانیەکان کە دۆزراونەتەوە زۆرن و کلاو رۆژنەیەکی یەکجـار بە نرخی بۆ رون کردنـەوەی مێـژوی میتـانییەکان لەسەدەی چواردەدا کە لە ئەو پەری بەرزیدا بون .

بەلام ئەم زانستە هیچ باس نەکراوەو ناوی نەهاتووە تا ئەم چل پەنجـا ساڵەی دوایی و مێـژونـاسـان بە تایبـەتی ئاشوری ناسـەکان نەیان ویستووە ئەو پەردە تاریکەی داویانە بەسەر مێژوی نەتەوە ئاریەکاندا لە روژ هەلات هەڵ دەنەوەو بیخەنە بەر رۆژ .

لەسەدەی سێنزەدا (١٣٠٠ ب ز ) ئیمپراتوریەتی میتانی دێتە کزی . بەهـۆی شەرو شۆری ناوخـۆیـی بەینی میتـانی و

خوریەکان خۆیان لە لایەکەوە ، و بەهۆی هێرشی ئاشوریەکان کە هەلیان لەو کزیە وەرگرت و خۆشیان هێزیان پەیاکرد بو . چاویان دەمێك بو بری بووە وڵاتی خانی گەڵ پات ) ی بەپیت و بەرەکەت و فراوان . هەر لەو کاتـەشـدا ئیمپـراتـوریـەتی خاتی کە ئاشوریەکان زۆریان لێدەترسان کزبو بوو ئاشوریەکان ترسیان شکـابـو لێی لەبـەر ئەم هۆیانە لەلایەکی ترەوە ئاشوریەکان دەستیان کرد بە شەر فرۆشتن بە میتانیەکان و دایان بە سەریا ، وشار بەشارو ، شوێن بە شوێن بە گژیانا چون ، لە زەمانی ( ئاداد بزاری ) یەوە کە لە ١٣٠٧ ـ ١٢٧٥ ب ز دا حوکمـی کردووە ودوای ئەو کورەکەی ( شەلوم نەسر ) ی یەکەم کە لە ( ١٢٧٥ ـ ١٢٤٥ ) ب ز حوکمی کردووە و دوای ئەویش لە زەمانی کورەکـەی (تـوکولتی نینورتا) کە لە ١٢٤٤ ـ ١٢٠٨ ب ز دا حوکمی کردووە واتا لە ماوەی هەشتا ساڵ دا ، ئاشوریا بو بە گەورەترین و بە هێزترین دەوڵەت لە رۆژهەلاتدا بێ پەروایی ئەم ئیمپراتۆریەتە کە بەسەر گەلێە نەتەوەکانی دەورو پشتیا هەڵ گەرا ، وپێش کەوت و لە لافاوی خوێندا کەوتە مەلە لە یەکێك لە ساڵ نامەکانی ( ئاداد نیرای ) دا دەڵێ ! لەشکری

**کاشـوەکـان گوتی، لولو ، شوبـاری ، م تەفـرو تونـا کرد، شارەکانیانم دابێژا ، لە شاری ( لویدو ) نزیك ( کەرکوك ) تا ئیلوخات ـ (تورعابدین ) تا گەیشتمە ( لولوی ) هەموم داگیرکرد و لەوێدا سنوری ئاشوریام کێشا** ، ئەم شەرەش لە ( کِلـزی ) نزیـك هەولێر دەسی پێ کردووە کە لە پێشـدا سنوری بەینی ( کاردونیاش ـ بابل ) و ( ئاشوریا ) بووە . بەلام ئەنجامی شەر لەگـەڵ ( گوتی ) و ( لولوبـو ) زۆر ئاشکرانییە هەرچەند لە ( قاتمۆخی ) نزیك شاخی گودی بەرنگاری ( ئاداد نیراری ) بون و لە شکرەکەیان شکاندووە .

بەلام ئیـتـر لەو رۆژەوە باسی شـەری نەکـردووە لەگـەڵ (سـوبـاری) هەرچـەندە هێرشی بردۆتە سەرولاتی میتانی کە (سوربای) بەشێکی بووە .

دوژمنایەتی ئاشوریەکان لەگەڵ میتانیەکان کۆن بووەو دەمێك بووە چاویان لە خێرو بەرەکەتی بریوە ، و هەلیان لە بێ هێزی خاتیـەکـانی دۆستی میتـانیو میتـانیەکان خۆیان لە کیس خۆیـان نەداوە، ( ئەداد نیراری ) داویـە بەسەر وڵاتەکەدا و توانیویەتی (واساشاتا)ی ئیمپراتۆری میتانی بشکێنێ . ناچار (واساشاتا) فیراربکا بۆ وڵاتی ( ئیریتی ـ IRRiti ) کە لە بەینی (حەران ) و ( قارچەمیش ـ طرابلس ) دایە ، بەلام ئاشوریەکان دوای کەوتون و بە خۆی و ماڵ و ژن و مندالەوە ، بەدیل گرتونیان و زنجـیر بەستیـان کردون و رەوانـەیـان کردون بۆ شاری ( ئاشور ) بەلام ( ئاداد نیراری ) نەی توانیوە وڵاتی (میتانیا) داگیرکا! لەبەر ئەوە ( واساشاتا ) ی ناردۆتەوە بە دەس بەسەری وڵاتـەکـەی بۆ دابین کاو هەلی سورێنی بە ناوی ژێر دەستی ئاشـوریـاوە ، ئیـنـجـا ئاداد نیراری ناوی خۆی دەنـێ (سـەرکیشـانی) (شـای شاییان) یا ( سەری شایان ) و بە تەواوی خۆی لەخۆی بایی دەبی و دەستی ( هاو ـ سەری ) بۆ شای خاتیەکان دەباو نامەیەکی بۆدەنێری دەڵێ [ برا، ئارەزوی سەردانی شاخی ( ئامانوس ) دەکەم و چاو بێ کەوتنتان ) . (خاتـوشیلیـاش ) ی شای خاتیـەکان ئەمەی لابە دڵ نابێ و بەتوندی وەلامی دەداتەوە دەڵێ برایەتی چی ، بۆ تۆ لە دایك و باوکی من بوی ، داوای برایەتیم لێ دەکەی !؟ ئینجا خاتیەکان لەگەڵ کاشوەکان پەیمان دەگرن و هەر لەو کاتەشدا میتانیەکان خۆیـان دەکـەنەوە ، بەشی رۆژ ئاوای میتانیا لە چنگ (ئاداد نیراری) رزگـار دەکەن و ئیتر دەسەلاتی ( ئاداد نیراری ) لە وێدا نابێ بەلام میتانیەکانیش ئیمپراتۆریەتەکەیان دوای ئەوە تیك دەچێ میتانی و خوری لەیەك جیا ئەبنەوە وڵاتەکە دابەش ئەکرێ بەسەر چەند میرایەتیەکی بچوکدا . دوای ( ئادا نیرادی(

( شەلم نەسر ) ی کوری شەری بەو میراتیانە فرۆشتووەو یەکە یەکە داویە بە سەریانا ودیارە زۆر سەر نەکەوتووە لە سەرەتادا کەداویە بە سەر وڵاتی ( موشری ) کە ئەبێ ( موکری ) بێو بەنـاوی وڵاتی ( ئارینی ـ ARini ) یەو ناسراوە کە بێ گومان (ئاریان)ە بەلام لە دواییدا و لەگەڵ ئەوەی کە ئەم ئاریانە زۆر بە چالاکـی شەریـان کردووە ، ( شەلم نەسر ) لە ئەنجـامـدا توانیویەتی بیان شکێنێ ( شاتووارا ) ی شای میتانی توانیویە لە دەسیـان دەرچێ و روبکاتە ئیلاتی خوری رۆژئاوا . بەلام (شەلم نەسر) پانزە هەزار میتانی گرتووەو چاوی هەڵکۆڵیون !و (نۆ) دانە شاری گەورەی وێران کردووە ! و ١٨٠ شارو دێی تری سوتـانـدووە! و هەمـوو وڵاتی میتانیای داگیرکردود ئەم

کارەساتە گرنگترین و خوێناوی ترین کارەساتی سەدەی سێنزەیە ( ١٣٠٠ ) پ . ز .

دوای (شەلم نەسر) (توکولتی ـ نینورتا) کوری کە لە باوکی درترەوە لەسەر ئەو سیاسەتە ڕۆیشتووەو بەهەمو لەونێك بەگژ میتانی و خوریەکاندا چووە و شارەکانیانی یەك بە یەك وێران کردووە لە یەکێك لە ساڵ نامەکانیدا باسی ئەو شارانەی کردووە و ناوەکان نوسیوە . وەك ( شارتیدا ) کە ئەبێ شانیدەر بێ و (میتحرو) کە ئەبێ ( موکری ) بێ و ( مادانی ) کە ئەبێ ( مادای ) وڵاتی ( ماد ) بێ . و گەلێ شارو وولاتی تر کە ئەگەر لە ناوی شارو دێ و خێلاتی کوردستاندا بۆیان بگەرێین بێ گومان گەلێکی لە ناوەکانی ئیستەدا دەدۆزینەوە ! ئەوەش هونەرێکە دەبێ بزوێنرێ !

توکولتی نینورتا ، وەك باوکی گەیشتونە هەر شارێکی میتانی وێرانی کردووە پاش تاڵان و ئاگری تێ بەرداوە ( میرەکان ) ی بە خۆیان و ماڵ و منداڵەوە کێش کردووە بۆ ( ئاشور ) . و هەرچی خێرو بەرەکەتی وڵاتەکەشە کۆی کردۆتەوە و بردویەتی هەر لە ( خاپورەوە ) هەتا ( بابل ) ئینجا ناوی خۆی ناوە شای شایان ( شای کاردۆنیاش و سۆمەر و ئەکەدو بابل و هەر چوار گۆشەی دنیا (١).

لە دواییدا وەك هەموو زۆر دارێك خەڵقی ( ئاشور)یی هەستاون و لەسەر تەختیان هێناوەتە خوارێ و هەر لە قەلاکەی خۆیدا کورەکەی بە دەستی خۆی سەری بریوە ! لە ساڵی ١٢٠٨ پ.ز.

ئەوی پێویستە لێرەدا لەسەری بوەستین و سەرەنجی بدەینێ ئەوەیە کە لەزەمانی ( توکولتی نینورتا ) کە لە ساڵی ١٢٤٤ ـ ١٢٠٨ ب . ز دا حوکمی کردووە ناوی ( مادان ) یەکەم جار هاتووە لە مێژوودا و دوای ئەوە لە تەوراتدا باسی ( مادان ) کراوە . و ئەم مادانە بەبەشێك لە میتانیەکان ناسراون ئەم روداوە لەو کاتەدا بووە کە ئیمپراتۆریەتی میتانی کۆتایی هاتووەو دیارە ئەوی لە چنگ ئاشوریەکان رزگاریان بووە نیراریان کردووە وبێ گومان داڵدەیان بردۆتە بەر هاو نەژادەکانیان بەرەو رۆژهەلات و ئەو دیوی زاگرۆس بە لای ئێراندا هەندێکیان و هەندێك بەرەو رۆژئاوای فورات بۆلای

خوریەکان کە ئەمەش دیارە تاقمی سوارەو ئەرستوقراتی بون ، وکە گەیشتونە لای ( دەریاچەی ) ( ورمێ ) لە وێدا سرەوتون ، وپاش بەینێك ئیمپراتوریەتی ( ماد ) یان دامەزراندووە ، بەمەدا دەبێ کە میتانی و خوریە ئاریەکان دوای فەوتانی ئیمپراتوریەتە گەورەکەی میتانی هەر ماون و بە ناوی شارەکان یا ئێلەکانیانەوە چەند میرایەتیەکیان هەر هەبووە هەتا ئێستەش لە ناوچەکانی خۆیاندا ماون و ئەوی سوارە و توانا بووە بەرەو رۆژهەلاتی وڵاتەکە چووەو لە پێشیدا لەگەڵ خزمەکانیان لەو دیوی زاگروس لای رۆژ ئاوای بانی ئێران چەند میراتیەکی یەك شاریان دروست کردووەو لە دواییدا یەکیان گرتووە ، لەسەرەتای هەزارەی یەکەمدا و ئیمپراتوریەتی ( ماد ) یان دامەزراندووە ناوی ( ماد ـ مید ) بێ گومان پەیوەندە بە ناوی ( مات ـ میت ) و لە شێوەی ( کۆ ـ جەمع ) دابووە بە مادان ـ ماتان یا میدین ـ میتانین ) ، و ئاشکرایە کە ( د ) ( ت ) دو دەنگی یەك سازگەن تەنیا یەکێکیان کپ ـ مهموس و ئەوی تر دلێر مجهورە کە زۆر سروشتییە لە فۆنۆلۆجیدا جێ گۆرکێ بکەن لە زمانە ئاریا ئەو روپایەکاندا وەك لە بەینی ئینگلیزی و ئەڵمانی دا لەم وشانەدا .

| ئینگلیزی | ئەڵمانی | کوردی |
|---|---|---|
| day | tag | رۆژ |
| dead | tot | مردو |
| dance | Tanz | دانس |
| deep | Tiel | قوڵ |

ئینجا جێ گورکێی ( ت ) و ( د ) لەوشەی ( ماد ) و ( مات ) دا شتێکە لەم بابەتە ( ١ ) کە دیارە لە بەینی زمانی مادەکان و میتانیەکاندا هەبووەو ئەمە زیاتر رون دەکەینەوە لە کاتی بەراوردکردنی زمانەکاندا.

وەك دەرکەوت کە شانۆی مێژو لە هەزارەی سێیەمدا بەنەتەوە ئاریەکان پربوتەوە . لە هەزارەی دوهەم بێ گومان شای شانۆگەران بون ، تازە نەتەوە سامیەکان دەسیان کرد بۆ بە بڵاوبونەوە لە مێزو پوتامیای خواروداو هاتبونە وڵاتی ئەگەدە بەلام بۆ ماوەیەکی کەم کە لە

١) بروانە سەرچاوەی ( ١٤ )

(۲٤٠٠ ـ ۲۲٠٠ پ . ز ) بەناوی ئەکەدیەوە حوکمیان کرد پاش سۆمەریەکان کە لە (۲۷۵٠ ـ ۲٤٠٠ ) پ . ز دا وڵاتی (ســومەرو / ئەکەد) یان بەدەست بوو بە هەمو بەڵگەیەکەوە ساغ بۆتەوە کە سۆمەریەکان ( ئاری ) بون دوای ئەکەدیەکان سولالەیەکی تری سامی هاتە سەر حوکمی بابل لە ( ۱۹٠٠ ـ ۱۷۵٠ ) پ . ز ودوای ئەوان کاشوەکان کە دیسان ( ئاری ) بون وەك سۆمەریەکان لە ( ۱۷٤٦ ـ ۱۲٠٠) پ . ز مانەوەو هەمو وڵاتی میزوپوتامیای خوارو هەتا هەولێر بە دەستیان بو کە پێنج سەدساڵ زیاتری خایاند . خاتیەکان لە ژووروی مێزوپوتامیا و ئەنادۆڵ لە ( ۱۸۵٠ ـ ۱۲٠٠ ) پ . ز و ئەوانیش ( ئاری ) بون . هەر لەو کاتەدا خوری و میتانیەکان لە میزوپوتامیای ژوورو تا دەریای سپییان بە دەست بوو ، ئیمپراتوریەتێکی گەورەیان لە (۱۸٠٠ ـ ۱۳٠٠ ) پ . ز دامەزراند و هەمو رۆژهەڵات لە ژێر حوکمیاندا بوو . و یەکەم نەتەوە کە بەناوی ( ئاری ) یەوە ناوی خۆی هێنــابێ میتانیو خوریەکان ، ئاشوریەکان کە لە (۱۸٠٠ـ۶۵٠) پ . ز لەسەر شانۆکە بون ، بەڵام لە پێشدا زۆر بێ دەسەڵات و کز بون و لە ژێر حوکمی میتانیەکاندا بون هەتا ( ۱۳۵٠ پ .ز ) لە ( ۱۳٠٠ پ .ز ) لە زەمانی ( ئاداد ـ نیراری) کە لە پێشدا باسمان کرد دەسەڵاتیان پەیدا کردووەو هێرشیان بردۆتــە سەر میتــانیەکان و لە ( ۱۲۵٠ پ . ز ) کۆتاییان بە ئیمپــراتــۆریــەتی میتانی هێناوە ئاشوریەکان کە سامی بون تەنگیان بە ئاریەکان هەڵ چنیوەو پەراگەندەیان کردون و خۆیان ماونــەتەوە پاش داگیرکردنی وڵاتی میتانی و بون بە هێزترین دەوڵەت لەسەدەی دوانزەدا هەتا لە سەدەی حەوتەمدا ( ۷٠٠ پ .ز ) بە (دەس ) ( مادە ) ( ئاری ) یەکان شکاون و ئیتر ناویان لە مێژودا نەماوە . ئینجا بەمەدا دیارە کە ( ئاریەکان ) شانــۆگــەری بەشی زۆری هەزارەی سێیــەم و نزیــك هەمــوو هەزارەی دووەم بون لەبەشی زۆری مێژوی رۆژهەڵاتدا ئینجا بابچینەوە سەرباسی مەڵبەندی کۆنی ئاریەکان کە زۆر سەیرە هەندێ مێژو ناسی تائێستە بڵێین لە ناوەراستی ئاسیاوە هاتون، بۆ وڵاتی ئاریەکان و مەڵبەندی رەچەڵەکیان !! ولەوێوە بڵاوەیان کردووە ، و گەیشتوونەتە وڵاتی میزوپوتامیاو ئەنەدۆڵ و کەوانە بە بیت و ئێران و هندستان و دوایی لە ئەنادۆڵەوە بە دەریای (ئێجــە ـ AEgiansea )دا لە لایــەکــەوە و لەلایــەکی ترەوە لە شاخەکانی (ئەلپ ـALP )هو بەرەو ئەوروپا چون.

ئەم بیرو باوەرە لە راستیــدا هیچ پەسند ناکرێ بەرامبەر ئەم راستیانە :

۱) تا ئێستە هیچ کۆنینەیەکی ئینسانی دەوری بەرد بەدەستەوە نی‌یە کە سەرەتای ژیانی ئینسان دەرخا لەو ناوچانەدا

۲) هیــچ کۆنینــەیــەکی شارستــانی دەوری دێ نشــین لەو ناوچانەدا نەدۆزراوەتەوە پێش شارستانی زاگروس و مێزوپوتامیا.

۳) هیــچ نوسراوێــك نە بەزەمــانی ئاری نە بەزەمــانێکی تر بە دەستــەوە نی‌یە پێش نوسراوی سۆمەریەکان ، لە ناوەراستی ئاسیادا .

تەنهــا ئەو نوسراوانە نەبێ کە ناویان نا ( تۆخاری ) و کە لە ناوەراستی تورکستــانی چینی دا دوزراوەیــەوە و بە زمانێکی ئاری دانرا بەڵام هی سەدەی هەشتەمی پ . ز بەڵکو حەوتەم ئینجــا ئەبێ لە مێــزوپــۆتــامیــاوە چوبێتــە ئەو وڵاتــە وەك ( سانسکــریتی ) کە دەرکەوت لە وڵاتی میزوپۆتامیای ژورو لە میتــانیاوە و لە هەزارەی یەکەمدا بە ئەفغانستاندا لە ئێرانەوە چووە بۆ ژوروی هندستان ! ئەمە لە کاتێکدا کە :

۱ـ یەکەم مەڵبەندی ئینسانی دەوری بەردی کۆن لە شاخەکانی زاگــرۆســدا دۆزراوەتەوە ، کۆنینەکانی هەزار مێردو شانیدەر (۱۲٠) هەزار ساڵ پ . ز .

۲ـ دوەم مەڵبــەنــدی ئینســـانی دەوری بەردی نوێ هەر لە زاگــروســدا بو کە لە ۶٠ تا ۳٠ هەزار ساڵی پ . ز بۆ دانرا کۆنینەکانی چینی ژێرەوەی شانیدەر و چەرمۆ .

۳ـ یەکــەم پلەی شارستانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سرەوتن دێ نشین هەر لە دەشتەکانی دامێن زاگرۆس و گوێ روبارەکانی میزوپۆتامیای ژورو ، دجلە و فورات وزێی گەورە و بچوك و خابور بووە کۆنینەکانی چەرمو تەپەگەورە ، حەسونەو سامەرە بەڵگەن .

٤ـ یەکــەم نمــوونــەی نوســین لە دنیــادا لە دەشتــەکــانی میــزوپــوتــامیاداو بە خەتی میخی و زمانی سومەری بووەکە دەرکەوت زمانێکی ئاریەو سۆمەریەکان بە خۆیان وتووە ئاری و

ناوی وڵاتەکەیان Ariki (ئاریکی) بووە[1] .

٥ ـ دوەم زمان کە ئاری بووە زمانی میتانی لە میزوپۆتامیای ژورودا ، بووە ، هەروەها لە ( سوریا ) کەلەناوی بەشێکی تری ئاریەوە وەرگیراوە کە ( خوری ) یە چونکە ( س ) بە (خ) یا(H) دەگۆڕێتەوە لە زمانە ئاریەکاندا وەك ناوی ( سند ) بووە بە (هند ) و خوریاش ( خ ) بووە بە H هـ لە ناوی ( خاتیە ) کاندا ، هەروا بووە سوریا کە ئەبێ ( خوری ) خۆی ( ئوری ـ ئاری بێ و بووە بە ( س ) لە ناوی سیثیەکاندا کە لە ناوچەی قەفقاسیا دەژین. دیسان زمانی خاتیەکانی ئەنادوڵ هەر لەو بەرەیـەن کە میتـانیو خوریـیـان لێ کەوتـوتەوە و ( سیثی ) پاشمـاوەی (خـاتی ـ حیثی)ن ئینجـا چۆن ئیتر بەم هەموو بەڵگانەوە ئەتوانین بڵێین ئاریەکان لە ناوەراستی ئاسیاوە هاتون ، یاچـۆن ئەتـوانـین بڵێـین لە شوێنێکی‌تـر غەیری زاگروس ومیـزوپوتامیای ژوروەوە هاتون ! چ ئەقل و چ باوەڕێك ئەمە پەسند ئەکا !

بە کۆتـایی سەدەی دوانزە هێزو توانای ئاریەکان لە هەر سێ ناوچەدا ، مێزوپۆتامیای ژورو ئەنادوڵ سوریا ، نەماوە بە هۆی پەرەســەنـدنی توانـاو هێـزی ئاشـوریـەکـان لەم کاتـەوە . وداگیرکردنی گەلێ وڵاتی ، میتانی و خوری وخاتی لە کاتێکدا کە ئاشـوریـا لە سەدەی هەژدەوە هەتا پانزە هێزێکی ئەو تۆیان نەبووە و لە سەدەی پانزەوە لە ژێر حوکمی میتانیەکاندا بون هەتا سەدەی سێنزە ( ١٣٠٠ پ . ز ) دوای ئەوە توانایان پەیدا کردوە لە کاتی بێ هێـز بوونی میتـانی و خاتیەکاندا کە هەر دوولای بە ئاشوبی ناوخۆوە خەریك بون و ئاشوریەکان هەلیان لەوە وەرگـرتـووەو داویـانـە بەسـەر میتانیەکانداو بەرە بەرە وڵاتەکەیان کز کردووە و شکاندووە و دوای ئەوە دەسیان کردووە بە هێرشی بۆ سەر خاتیەکان . و لە سەدەی دوانزە دا لە دەریاوە لای رۆژ ئاواوە نەتەوەیەکی تا ئێستە نەناسراو داو بە بەسەر وڵاتی خاتیداو وێران کردووە و ئیتر شانۆی مێژوو چۆڵ بووە بۆ ئاشـوریـەکـان تا سەدەی حەوتـەم کە بەیەك جاری بەدەس مادەکان لە ناو براون و کۆتاییان هاتووە بەمە کۆتایی پلەی دوهـەمی مێژوی نەتەوە ئاریەکان دێ و زمانەکانیان دەچێتە پلەیەکی تازەوە کە بە ( مادی ) و سانسکریتی و ئاڤێستی دەس پێ دەکا لە هەزارەی یەکەمدا . وئەوە باسی وتاری ئاییندەمانە . هەر لەم کاتـەدا بەشێـك لە خاتیـەکان رودەکەنە دورگەکانی (یۆنان) و لەوێدا شارستانی ( گریك ـ یونان ) ئاری دەس پێ دەکاو ئیتر لەم کاتەوە دەتوانین بەم خیزانە گەورەیەی هاوزمان و هاونـەژادە بڵێـین خێـزانی زمـانـە ئاریا ئەوروپای‌یەکان و هەروەها نەژادەکەشیان کە تا هەزارەی یەکەم خۆی پاراستووە تارادەیەك لە تێ کەڵ بون بە بێگانە ، بەڵام لەم کاتەوە ، تێ کەڵ بەزمـانـانی تر بون بە تەواوی کە بووە بە هۆی پەیـدابـونی بەرەیەکی تازەی زمان . بەڵام هەر لە چوار چێوەی (ئاری) دا ماونـەتەوە و بون بە چەند بەشێك لە وتاری ئایندەدا باسیان دەکەین .

### سەرچاوەکانی ئەم وتارە


1- Acomparative grammar of the Hittite Languge . Prof. Sturtrant

2- La Langue d Lavesta Prof. De HarLez

3- Asummerian Reading book Prof gadd

4- the Dawn and twilight of zoroastrian Prof zaehner.

5-the Sans Krit languge Prof. Burrow

6- the cambridge Ancient History Vol 2. Part one.

7- the cambridge Ancient History VoL one Part 2

8- Ancient IRAQ Prof. george Roux.

9- the cambridge Anciet History VOL one Part one.

10- Indo European philology Prof.Lockwood.

11-Indosummerian seals Prof. waddell.

12- IRAN. prof. ghirshman.

13-ciVilization past and present prof. wallbank.

14- AnIntroduction to Descrption Linguistics. prof. Gleason.




# راستکردنەوەی مێژووی ژیانی خەلیل منەوەرو چەند شیعرێکی بڵاونەکراوەی



هەردەوێڵ کاکەیی

هەقخوازو هەقپەروەر . دۆستو یاوەری هەژارو کنارگیران . دژی زۆردارو چەوسێنەر . وریاو بلیمەتو زانا . بیرتیژو رووناکبیر . تەمیرەژەنی بێهاوتا . ئاوارەی هەردەو هەڵەتی ناوچەی گەرمیان . عاشقی دیمەنو سروشتی کوێستانەکان . مەستو مەدهوشی شاخە بەرزەکانی کوردستان . قەڵەم بە دەستی بەتوانا . شاعیری چینی چەوساوەکان (خەلیل کوری خضر کوری ئەحمەد کوری خەلیل)ە بە تیرە (گەرامی )یە بە خزمایەتی لەگەڵ بنەماڵەی یەسو ساوکی شاعیردا (١٨٣١ - ١٩٠٩ز) یەك دەگرنەوە .

ناوی راستەقینەی (محەمەد خەلیل)ە بەڵام هەر لە منداڵی‌یەوە بە (خەلیل) بانگ کراوە تا ناوی دووەم بە سەریا چەسپاوەو ناوە پێشوەکەشی فەرامۆش کراوە . وەك خۆی لەم تاکە خشتەدا وتویەتی :

**زار مەحجووبم جە لای خاسو عام**

**(محەمەد خەلیل) مەنشوور بە نغام**

شاعیری پایە بەرزمان لە ساڵی ١٨٧٨ی‌ز لە شاری (کەرکوك) گەرەکی (موسەڵلا) هاتوەتە رووی جیهان . . زانای ئاین پەروەری کەکەیی سەیید بورهان رەشید (١٩١١ - ١٩٧٦ز) دانشتووی شاری کەرکوك دەیوت : مەلا خەلیل لە دەورو بەری ساڵی ١٩٢٣ی‌ز لە تەمەنی (٦٨) ساڵیدا لە شاری (خانەقین) فەرمانی یەزدانی بەجێهێناوەو لە گۆرستانی (پاشا کۆپری) بە خاك سپێرراوە . واتە لە ساڵی (١٨٥٥ز) لە دایك بووە . مامۆستا (موسی زکی مصطفی) لە ژمارەی (٥ . ٦ - ٧) ی گوڤاری (قرداشلق - الأخاء)ی عەرەبی و تورکمانی ساڵی ١٩٧١ی‌ز دەڵێت : شاعیر لە ساڵی ١٢٨٠ی روومی = (١٨٦٣ز) هاتوەتە دنیاوە . ئێمەیش واتە من و

مامۆستا مستەفا نەریمان لەکاتی خۆیدا ئەم رایەمان بە راست زانیو لە دیوانەکەیدا بۆ لەدایك بوونی تۆمارمان کردنو دەست نیشانی مێژوو . پێشوەکەشیان کردووە . بەلاَم خەلیل منەوەر لە سالّی (١٣٢٦ك) بەرامبەر بە (١٩٠٨ی‌ز) لە شاری (کفری)دا تەمەنی خۆی دیاری دەکاتو دەلّێت :

**بەزات بێچوون (حي ذوالجلال)**
**تەئریخ عومرم یاوان وە (سی‌سالّ)**

* * * * *

بەگوێرەی ئەم خشتە شیعرە شاعیر لە سالّی ١٩٠٨ی‌ز لە تەمەنی (٣٠) سی سالّیدا بووە واتە لە سالّی ١٨٧٨ی‌ز هاتوەتە دنیاوە .
لە سالّی ١٩١٤ی‌ز لە پاش ئەوەی مەنیجی ژنی دەمرێ لە (کفری)دا دێتووە ناو هۆزەکەیو لە دێ (عەرەب کۆێی) لە ناوچەی (داقوق) نیشتەجێ دەبێ . لە سالّی ١٩١٧ی‌ز خاتوون نارنجی کچی تەلعەت کاکەیی دەهێنێو دەبێتە هاوسەری لە چارە کلۆلّی شاعیر لە پاش ماوەیەکی کەم ئەمیش دەمرێ جا لە پاش دانشتنی بە (٢١) بیستو یەك مانگ لە گوندی ناوبراودا واتە لە سەرەتای سالّی (١٩١٨ز) نزاو هاوار دەکاتو ژیانی پر نارەحەتی خۆی بۆ سەیید رۆستەم ئاغای کاکەیی (١٨٥٧ – ١٩١٩ز) دەردەبرێتو دەلّێت :

**(بیستو یەك ماهەن) هام چە خزمەتت**
**مەمنوون ئیحسان لوتفو شەفەقەتت**

ئینجا تەمەنی خۆی دەست نیشان دەکاتو دەلّێت :

**تەئریخ عومرت یاوا وە (چل) سالّ**
**دیت وە دیدەی وێت دوو ژەنو دوو مالّ**

* * * * *

جا بە گوێرەی قسەی خۆی بۆمان وا دەردەکەوێت شاعیر لە سالّی (١٨٧٨ز) لەدایك بووە نەك لەسالّی (١٨٦٣ز) یان (١٨٨٥ ز) .
بێ‌گومان ئەم مێژووە بۆ لە دایك بوونی لەوانی تر راست ترە چونکە ئەمە نەرای منەو نە هی کەسێکی ترە بەلّگەنامەو وتاری شاعیر خۆیەتی .
لەبەد بەختیو چارە کلۆلّی شاعیری نەمر هێشتا ساوا بووە باوکی مردووە (خانزاد) خانمی دایکی بە هەژاریو بێوەژن کۆشی بەسەر بەرزیو روو سپێتی بەخێوی کردووە . بەپێی دابو نەریتی ئەو رۆژگارە لە شاری کەرکووك لای مەلا نراوەتە بەر خوێندن . لە تەمەنی (١٠) دە سالّید دایکی دەمرێو خۆیو جەلیلو ئەلیاسی برای بێ‌کەسو باوان دەمێننەوەو ناچار دەبن لە سالّی ١٨٨٦ی ز سەری خۆیان هەلّدەگرنو دەچنە دێی (وەردەك)ی کاکەیی لە هەرێمی شاری (موسلّ) . جا شاعیر ئەو کاتەی دێتە یادو بەزەیی بە خۆیا دێتو لەسەر بێ‌کەسی خۆیان بەشیعرەوە بە خوای مەزن دەلّێت :

**ئەوەلّ مەحروم بیم جە سایەی تاتە**
**پەی دایەم کیانای یاس بەخەلاّتە**
**دووهەم مەئیوس بیم جە خزمەت دایە**
**بێ باوان مەندم هەر رۆ جە لایە**

* * * * *

خەلیل منەووەر لە سالّی ١٨٨٩ی‌ز دیسان مالّ دەگوێزێتەوە بۆ شاری کەرکووكو دەچێتە خزمەتی خوا لێ خۆش بوو زانای بایە بەرزی کاکەیی مەلا سەمەد (١٨٣٩ – ١٩١٥ز) کوری مام پیرەویس خوبیلە زادە نە شاری کەرکووك بۆ بەدەست هێنانی مانەی ئایینی. لە سالّی (١٨٩١ی‌ز) بەوە ئیتر لە کەرکووك نەماوەو چوەتە شاری (کفری) چونکە لە هۆزەکەی لەو شارەش هەن . دەبێتە دراوسێی باوە ئەحمەد . مەلا خەلیل پیاوێکی بالاّ درێژو لاواز بووە . ئەسمەر رەنگو خاوەن جووتێ سمێلّی درێژ بووە . کەواو سەلّتەی فەقیانەداری لەبەر کردووە . مشکی بەستوەتە سەرەوە .
شاعیر بە گەنجی دەکەوێتە ئەوینی مەینجەی کچی عەبدوڵ سەوزالی‌یەوە بەلاّم ئەم کچەی نابێتە نسیب جا لەگەلّ مەنیجەی کچی ئەحمەد یەسودا زەماوەندی کردووە . کاتێ مەینجەی بە بووکی بۆ دێت هۆنراوەیەکی دورو درێژی تەرو پاراوی بەسەردا هۆنیوەتەوە . ئەمەش چەند خشتێکە لەو شیعرە :–

**مەنیجە خانی ..**
**مەعلوومەن نە عام مەنیجە خانی**
**عاقلّو دانا هەم خۆش زوبانی**
**سەنگین سالار هام سام گرانی**

**تەشریف ئاوردی وەلای عەبداڵت**
**مەڵلاّ بێ حەیران شوعلەی جەماڵت**

* * * * *

بەرهەمی ئەم ژنەی کوڕێك و دووکچ بووە ، کورەکەی ناوی (نوری) بووە بەڵام ناوی کچەکانی دیار نین پارچە شیعرێکی غەزەلی هۆنیوەتەوە بە ناو نیشانی (لەیلێ گوڵنازەن) لە ناوەڕۆکی ئەم شیعرەدا وا بۆمان دەردەکەوێت شاعیرمان حەزی لە کچێکی تریش کردووە ناوی (گوڵناز) بووە . ، ئەمەش چەند خشتێکە لەو شیعرە :-

**لەیلێ گوڵنازەن . لەیلێ گوڵنازەن**
**ئیسم شەریفش ماچان گوڵنازەن**
**سەدای چون بولبول سوب خۆش ئاوازەن**
**پەی سەیران گوڵ هەر جە پەروازەن**
**کالاّی کراسش چیت نازنازەن**
**توحفەی قافڵەی شار شیرازەن**
**ڕەوشت و لەنجەش وەغەمزەو نازەن**
**شۆخەن سەرکەشەن وێنەی شاهبازەن**

* * * * *

لەکۆتاییدا دەڵێت :

**مەحبووبەی حەنین نازك دڵوازەن**
**سەر تا پا بێ عەیب حۆری مەجازەن**
**خەلیل دێوانەی شۆخ سەرئەفرازەن**
**پەی مەدح دڵبەر هەر لە پێشوازەن**

شاعیری بە ناوبانگی کورد فەقێ قادری هەمەوەندی (١٢٢٨ ١٣٢٤ی‌ك) گەلێ کاری لە دڵ و دەروونی شاعیر کردووە . جا بە بۆنەی ماتەمیيەوە شیعرێکی داناوەو تیایدا دەڵێت :

**دنیای بێ وەفا . دنیای بێ وەفا**
**فریادم جە دەست دنیای بێ وەفا**

**زەوقش زەقوومەن مەتاعش جەفا**
**کەس تا سەر نەکەرد جە سایەش سەفا**

* * * * * *

یان :

**ئاخر وەفات کەرد ئەو عالی جەناب**
**ئەو سۆفی مەرحوم (مؤلف الکتاب)**

**ڕۆح پڕ فتوح شوعەرای زەمان**
**پەرواز کەرد پەرێ دەروازەی جینان**

**بەرۆح مەغفور (فەقێ)ی ڕەحمەتی**
**((فادخلي في عبادي وأدخلي جنتي)**

* * * * *

لە پارچە شیعرێکی تردا کە بە ناونیشانی (هذا بیان شاعیرەهای کتاب) دایناوە تیایدا ناوی سی و پێنج شاعیر دێنێ و فەقێ قادریشی لە هەموویان بەرزترو زاناتر زانیوە وەکو لەم خشتانەی خوارەوەدا وتویەتی :

**(کاتب الحروف) خەلیل منەووەر**
**ئینە سی و پێنج بە وەجە دەفتەر**

**میزان کەردم دەرك وەعەین زاهیر**
**مەزموون فەردان سی و پێنج شاعیر**

**یەك یەك نامەوزوون نوسخەهای نادر**
**نمەبۆ هامتای فەقێ عەبدولقادر**

**فەریادم پەرێ شوعەرای زەمان**
**هاوارم پەرێ بەگزادەی وەنان**

**بێدادم پەرێ ساحێب تەئلیف**
**فیغانم پەی مەرگ ئوستاد تصنیف**

* * * * *

لە ساڵی ١٩١٩ی‌ز کاتێ ڕژێمی کۆنە پەرسێ ئینگلیز (شێخ مەحموود)ی نەمر لە سلێمانی دوور دەخاتەوەو ڕەهەنەی هیندستانی دەکەن شاعیر ئەم چوارینەیەی دژ بە ئینگلیزەکان وتووە :

ئارۆ زەمانەی دەور ئینگلیزەن
ئێکان وە بێزەن نانێك عەزیزەن

ئەعزای مەجلیسیان گشت .. فرۆش
هیچ ئەزانان مەخوران بەجۆش

دیسان بەئینگلیزەکان وتویەتی :
زەمانەی زەندیق دەور ئینگلیزەن
پارە لە پدەر یەك جار عەزیزەن

پارە لە فرزەند شیرینتر بییەن
بێ دینان وە پوول بێ دینتر بییەن

مەلا خەلیل جگە لەوەی شاعیرە لە تەمیرە ژەنینیشدا دەستێکی باڵای هەبوە . دەنگو ئاوازی گەلێ خۆش بووە . بە شەوان لە قاوەخانەکانو دیوانەکاندا بۆ خەڵکی شیعرو شانامەی کوردی بە ئاوازەوە

خوێندوەتەوە جار جارێکیش بە دەم شیعر خوێندنەوە تەمیرەی لێداوە .

شاعیرمان لە سەر دەمی رژێمی عوسمانی‌یەکاندا دووجار گیراوەو لە بەندیخانەدا بەندکراوە . یەکەمیان لە رۆژی ٢٤ی شەووال ١٣١٢ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی (١٨٩٤ز) بۆ ماوەی دوو رۆژ لە بەندیخانەی شاری (کفری) ماوەتەوە . لە بەندیخانەدا شیعرێکی نایابی هۆنیوەتەوە بە ناونیشانی (غەمبارەن ئیمشەو) ئەمەش چەند خشتێکە لە نموونەی ئەو هۆنراوەیە :

**غەمبارەن ئیمشەو ...**
**مورغ دڵ بێعەیش غەمبارەن ئیمشەو**

**رۆشنی چەشم غوبارەن ئیمشەو**
**عوشرەتم سەرتەوق زنارەن ئیمشەو**

**تەن مەحبووس‌بەند دیشوارەن ئیمشەو**
**مەسکەنم حوجرەی پر تارەن ئیمشەو**

**مەر خەلیل خوینو فەوارەن ئیمشەو**
**وەی تەورە زەلیلو زگارەن ئیمشەو**

**طەعام نە دەهەن چون ژارەن ئیمشەو**
**تەحقیق لە حەیات بێزارەن ئیمشەو**

* *

لە برپەی شیعرەکەیدا وا دەردەکەوێت هۆی گرتنی شاعیر ئەوە بووەدژی هێزی شەرو ستەمکاری راوەستاوە بۆیە ئەوانیش پیلانی نارەوایان بۆ دروست کردووەو رەوانەی بەندیخانەیان کردووە . لەم سێ خشتە شیعرەدا ئەم راستی‌یەمان بە جوانی بۆ دەردەکەوێت :
**وەکەردەی ئەڵەست جەببارەن ئیمشەو**
**بەواسیطەی قەوم بەدکارەن ئیمشەو**

**وە دەستی موفتی غەدارەن ئیمشەو**
**ئینتیقام جەی عەبد بێچارەن ئیمشەو**

**تاڵعم نە بورج شەرارەن ئیمشەو**
**ئەلەم نە جەستەم وە بارەن ئیمشەو**

**میرزا بەم خشتە شیعرە کۆتایی بە هۆنراوەکەی**

دەهێنێت :
**تەئریخ شەووال بیستو چارەن ئیمشەو**
**دوازدەو سێ سەدو هەزارەن ئیمشەو**

* *

بۆ جاری دووەم لە ساڵی (١٩١٤ز) لە کاتی سەفەربەردا لە گوندی (عەرەب کۆیی) لە هەرێمی (داقوق) بە دەست جەندرمە خوێری‌یەکانی رژێمی ئەو سەردەمە بەندکراوەو لەگەڵ دەیان بەندیدا رەوانەی بەندیخانەی (داقوق) کراوە لە پاشاندا بە تەقەلاو کۆشتی ئەم کەسانەی خوارەوە لە بەندیخانە رزگار کراوە : (سەید وەلەد کوری سەید محەمەد ئاغای کاکەیی . سەید خەلیل ئاغای کاکەیی . سەید رۆستەم ئاغای کاکەیی .فەرمانبەر رەمزی بەگ . فەرمانبەر مەجید ئەفەندی کوری

جمعەئەغ) . . جا خەڵیل منەووەر ڕووداوی (سەفەربەر)و گرتنەکەی خستوەتە قاڵبی داستانێکی جوانو ناڵاندوویەتی و دەڵێت :

**جە(عەرەب کۆنی) پەیدا بی مەحشەر**
**ئایل و ژەنان خاك مەكەرد وەسەر**

**ڕەشوەت و ڕەجا هیچ ناما وەکار**
**بەغەیر چە ڕۆ ڕۆی فریادو هاوار**

**زایەڵەی مەحبووس پەشێوی خەراو**
**کێشیا شەربەو کونەو جامو ئاو**

**نان ئاما پەریٚ (عیسا) ڕەشبگیر**
**تەندیری وساجی و هەلاٚتی و فەتیر**

**جە حەڵق هیچ مەرد نان نەلوا بە وار**
**مەگەر ئەدەبسز یەتیمچەی بێعار**

یان :

**من هەم پەریشان ئەحواڵ موکەڕەر**
**بێداد بیٚ ئیمداد بیٚ چارەی ئەفقەر**

**فیرار بیم چەنی چل و دوو نەفەر**
**زەلیل بیم وە دەست زابت و عەسکەر**

یان :

**تەمام مەحبووسان دەست بەستەی زەلیل**
**بەردن پەی (تاوغ) چون کۆرو سەفیل**

**ئەوەڵ وە سایەی پادشای جەبار**
**دووهەم جە فەیض زات هەشت و چوار**

**ثالث هەم چە فەیض ساحێب زولفەقار**
**داماد عەزیز ڕەسووڵ نازدار**

**رابع وەسایەی ئەفەندی جەشار**
**یەعنی (سەید وەڵەد) ئاغای بیٚ گدار**

**خامس جە نفووس میر شەوکەت‌دار**
**یەعنی (سەید خەلیل) ئاغای سایەدار**

**سادس چە هیممەت میر غیرەت‌دار**
**یەعنی (سەید ڕۆستەم) میر پڕ قەرار**
**سابع وە ڕەجای میر وەفادار**
**یەعنی (ڕەمزی بەگ) مودیر سالار**

**هەشتەم بە گوفتەی (مەجید ئەفەندی)**
**کاتب مە نشوور حوکمەت پەسەندی**

**(عیسا ئەفەندی) بەرلوا جە قار**
**(میرزا خەلیلش) جە بەند کەرد قورتار**

لەساڵی ۱۹۱٦ی‌ز مەنیجە خانمی ژنی لە شاری کفری‌دا دەمریٚ . شاعیریش ئەوە بە چاك دەزانێت بگەڕێتەوە بۆ ناو خزمو کەس و کارەکەی وەکو خۆی لە لاواندنەوەی ژنەکەی‌دا وتویەتی :

**بیٚ‌کەس خەدەنگیٚ پەی یانەم شانا**
**بڕیش جەرگ حەریم منش هاست تەنها**

**حەریم کۆچش کەرد کۆچی یەکجاری**
**چەمم کەرد لێلاٚو هوناو بی جاری**

**ئینجا دێتە سەر ئەم ڕایەو دەڵێت :**
جە مەئوای کفری هیچ کەسێم نییا
بەیۆ وە فریاد بکەرۆم ئەحیا

ئانەخاسترەن نەی شار کۆچ کەری
پەی نام کاکەئی‌یان زود هانا بەری

## فەرهەنگۆك

ئاب : ئاو

ئارۆ : ئەمڕۆ

ئانە : ئەوە

ئاوردی : هێنای

ئایل : منداڵ

ئی : ئەمە

ئینە : ئەمە

(ب)

بمانۆ : بمێنێ

بوانان : بخوێنن

بەرد : بردی

بەرئوا : دەرچوو

بەند : بەندیخانە

بەری : ببەم ؟

(پ)

پدەر : باوك

پەرواز : فڕین . باڵە فڕێی پەلەوەر .

پەریّ : بۆ

پەی : بۆ

(ت)

تاتە : باوك

تار : تاریك

تەن : لەش

تەور : جۆر . شێوە .

(ج)

جینان : بەهەشت

جە : لە . ژە .

(چ)

چەشم : چاو

چەم : چاو

چە = (جە): لە

(ح)

حەی : مار .

(خ)

خاسی : چاك

خوێش : خزم

خەدەنگ : تیر .

(د)

دامد : ئامۆزا

دما : دوا . پاش

دیشوار : ستەم . ناخۆشی .

دەروازە : بەردەرگا .

پێش‌دەرگاری

کۆشك‌و تەلار .

دەهەن : دەم

(ر)

رۆ : رۆژ

رەهروان دین : زانای ئاینی

(ز)

زایەڵە : هەوارو غەڵبە

غەڵب .

زگار : هەوار . فیغان

زنار– زینهار : ئازارو ناخۆش

زولفەقار : شیرەکەی حەزرەتی عەلیە (د . خ) .

(ژ)

ژەن : ژن .

(س)

سارا : سەحرا . دەشت .

سوب : بەرەبەیان .

سە : سێ . ژمارەی (٣)

سەدا : دەنگ

سەرکەش : بەتوانا . بەهێز . بەگوڕ .

(ف)

فرزەند : کوڕ . رۆڵە

فرێ : زۆر

(ق)

قورتار : رزگار بوون .

(ك)

کلاّ : کوتن . قومش

کنچە : کچ

کۆهسار : شاخەوی

کیان : ناردی

(ل)

لەب : لێو

(م)

مچون : دەڵێن

مە : مانگ

مورغ : پەلەوەر

(ن)

نمە : نەهات

نێت : خراپ

نەبۆ : نابێ

نەزانان : نازانن

نێك : چاك

نەتو : نەرۆیشت

نەوات : نەبێت . گەزۆ .

(و)

وارده : خواردەمەنی

(ه)

هاستی : هێشتی .

هەشت‌و چوار : دەست نیشانە بۆ دوانزە ئیمامی مەعصومین (٨ + ٤ = ١٢) .

(ی)

یاس : پرسە

یانە : ماڵ

یاوا : گەیشت

---

**سەرچاوەکان**

(١) شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەووەر .بەغدا ١٩٨٤ - هەردەوێلّ کاکەیی‌و مستەفا نەریمان .

(٢) درو دەست نووسی خەلیل منەووەر .

(٣) فەرهەنگی عەمید حەسەن عەمید

(٤) المعجم الذهبي (فارسی عەرەبی) د. محمد التونجی بیروت ١٩٨٠

o

چونکه قەومِ خویّش نەرووی تەنگانە
پەریّ نیّ قەومان براو باوانە

بەلیّ شاعیر دەگەریّتەوە ناو خزمو کەس و کارەکە ی لە پاش چەند مانگیّك لەویّ خاتوونّ (نازنجی کچی تەلعەت کاکەیی) دەهیّنیّو دەبیّتە هاوژیانی . باری نەگبەتی لە کۆلّی نابیّتەوە لە پاش چەند مانگیّك ئەمیش دەمریّ . ئافرەتیّکی قەیرە هەبوە ناوی (هەمین کچی مام ئەحمەد وەلکە) بووە دلّی دەرواتە مەلا خەلیل و زۆریش خۆشی ویستووە بەلاّم مەلا نەیخواستووە لەبەر ئەوەی قەیرە ژن بووەو لە تەمەنیشدا لە مەلا گەلیّ گەورەتر بووە . بۆ ئەم ئافرەتەش وتویەتی :

**گیای بەخت من بییەن سە پەلکە**
**مەعشوقم (هەمین مام ئەحمەد وەلکە)**

چەند ئافرەتیّکی بیّوەژنو قەیرە ژن هەبوە ئەوانیش ئارەزوویان هەبوە بە مەلا خەلیل شوو بکەنو لە گەلّیدا سەر لەسەر یەك سەرین بنیّن بۆ ئەو ئافرەتانەش ئەم تاکە خشتەی وتووە :

**چەند مەعشووق هەنی پەی من زەروورەن**
**بەعزیّ جە نزدیك بەعزیّ جە دوورەن**

بەلاّم وا دیارە مەلا خەلیل لەناو ئەو هەموو ئافرەتانە خوشکە (پەری) خانی هەلّبژاردووەو لەگەلّیدا زەماوەندی گیّراوە بۆیە بە شیعرەوە دەلّیّت :

**پەی شەخسیّ هەنی بیم وە موشتەری**
**جە (عەلی سەرای) ئامۆژن (پەری)**

**بالاّ چون بەیداغ سورەت لەنگەری**
**سە ئایل دارۆ پەی رەنج بیّوەری**

**وارسش نیەن سیّ طفل زەلیل**
**وە ناخیّر (پەری دریا وە (خەلیل)**

**نی چوار تا چوار جەمعەن مەبۆ هەشت**
**دەك خەلیل ئیقبالّ بەختت بۆ بەرگەشت**

**مەگەر (سەیید رۆستەم) نیمەی ئەملاکش**
**وەدالیەو خەرمان وەئاب و خاکش**

**بەخشۆ وەنەم وەبیّ دەردەسەر**
**پەریّ نەفەقەی نان هەشت نەفەر**

* * * * * * *

شاعیر لەم شویّن و جیّگانە دانیشتووە :
(کەرکووك ، کفری ، خانەقین ، گوندی وەردەك لە هەریّمی موسلّ ، تەرجیل لە هەریّمی کەرکووك ، گوندی عەرەب کۆیی و زەنقرو تۆبزاوەو عەلی سەرای لە هەریّمی داقوق) .
شاعیر لە شیعری ئەوینی و دلّداریش دا دەستیّکی بالاّی هەبوە ئەمەش چەند دیّریّکە لە نموونەی ئەو جۆرە شیعرانەی :

**کناچەی کوردەن خاوەن خەت خالّەن**
**دەم نوقلّ و نەوات دوو لیمۆش کالّەن**

**پەروەردەی سارای نام کوردستانەن**
**پەپوولەی ناسك نام کۆهسارانەن**

**پرچش لوول و خام چەنی زولّفانش**
**پەخش واردەن چون حەی وەبان مەمانش**

**دگان مرواری بالاّش چون چنار**
**خۆ لەبش ناسك گۆناش گولّ هەنار**

**سینەش تازە دوو میوە دارۆ**
**رەهرەوان دین چە دین برمارۆ**

* * * * * * *

شاعیر گەلیّ شیعری هەمە جۆری لە پاش بەجیّماوە **وەکو خۆی فەرمویەتی :**

فریّ نویسنام شیعر وە کوردی
کەردەنم بەیان ئەحوالّ رابوردی

نەدمای مەرگم بمانۆ یادگار
بوانان کوردان نە رووی رۆزگار




# ڕازی عیشقێکی ناکام

**غریب پشدەری**

برۆ جوانێ . تازە ڕۆی
وەك جاران شیعرت بۆ بڵێم
ئاوازی پڕ کەفو کوڵی . . .
عیشقی خودایت بۆ بڵێم

* * *

سەرت نانێمە سەر سینگم
گوێ لە ترپەی دڵم بگری
چاوت بنێیتە سەر یەكو
بە درۆوە لەبەرم بمری

* * *

ئەو پەنجانە دەقرتێنم
دوگمەی یەخەت بکەنەوە
جارێکی دی . کۆرپەی نووستووی . . .
سەرسینگت . خەبەرکەنەوە

* * *

ئەو دوو لێوانە داغ دەکەم
ئەسەی ماچی لێوی تۆ کەن
ئارەزووی گفتوگۆی گەرمی . . .
دەمو دووی بزێوی تۆ کەن

**ئەو هەناسە دەتاسێنم**
**لەناخی سینەما بەندە**
**کە هەر بۆ تۆم هەڵکێشاوەو . .**
**تۆش نەتزانی . نرخی چەندە**

* * *

**خودای خۆشەویستی . ئەمڕۆ**
**لەلای ئێمە . ئەو پارەیە**
**خاوەنی مێشکی بەتاڵو . . .**
**گیرفانی پڕ لە پارەیە !**

* * *

ئەو دەتوانێ . کام شت جوانە
بێنێو بیکاتە گەردنت
لات بێتە یادگارێ . . .
هەتاکو ڕۆژی مردنت

* * *

کام پارچەیەك . نەرمو نۆڵە
ئەویانت بە باڵا ببڕێ
هەرچی سۆزێکی ناسکتە
زۆر بە هەرزانی لێت بکڕێ

* *

بیرەوەری شەوانی زووی . . .
منت لەبیر بباتەوە
لەجیاتی من ئەو بووەشی
ئاکامت بۆ بکاتەوە

*

**موچورکەی** حەزوو ئارەزووی
**لە** لەشی تەزیوی بەرێ
**قەیناکا** . هەزار ئاگریش
**لە گیانی** بەزیوی بەرێ

* * *

کێ گوێ دەداتە هەناسەی . . .
گەرمی . شەوانی بێدارێك
یا گوێی بەزەیی شل دەکا
بۆ ناڵەی خاوەن ئازارێك

*

نەمدەزانی . تۆش ئامەزرۆی
ئامێزێکی گەرمو گوڕی
وەکو هەستو نەستو سۆزت . .
مردووی . . بووکەشووشەی قوڕی

* *

---

تکایە . . ئەم شیعرە بە هیچ
شێوەو مەبەستێك «نوقلی» ناگرێتەوە

# دێ

عبد الرحمن مزوری

ژدایکی
شاپەرێن تە . .
بومە گەرمانی و بەلەنبون(٢)
حووم و جەلالێن سنگێ تە
جودەمێ گرانی و کولیا . .
بومە فەلەند بون
ب بارانا لەسمانێ تە
ئەم دهاتینە قەژاندن و .
ژار ڤکرن
ب تیرو شکا دوچاڤێن تە
ئەم دهاتینە بالاڤکرن
دیا منێ
ئەی تە چێبیت .
فرینا خو ژێبڕدکەن
گیا ژکەسکاتیێ ژێ دبیت
بودار دبا رێژگە هێن خو .(٣)
ڤینا کەفن

گەر تو نەبی
چەوا هەسپێ عەمێ گوزێ
لێن سوێن خو .
دەشت و چیا . .
دێ وەر پێچیت ... ؟ !
چەوا مەمو
دبنێ زیندان و چالادا . .
دێ برەشەکێن میری .
کەبیت ؟ !

چەوا (لالش)
دێ ئەڤینا خو نوکەتن
سولاڤێن روناهیێ .
ڤەبیت ؟

چەوا . . چەوا
کەو دێ ڤەبیت
شەڤ دێ رەڤیت
کوچەرێ مە
دێ دەستێ هەیڤێ گریت و . .
بەرف زوزانێن خو .
ڤریت ؟ !
دیا منێ
شەڤێن تاری
ج هوستایێن کوولەرەشن . .(٤)
دیوارێن خو .
لبالیا دلێ تە ئێنە
گوییزو کوند . . دەرازینکێن
ژدەرگەهێ بهوستەکێ مشەختابن
. . دکەهینە
عەور . . رەشوکێن خرشن

گەر ژی . . پشیکەکا گێژە . (٥)
لێ موژگانێن تە .
رازابەو . .
شوخا کەنیا تە (هادیسێ) رارەڤابەو . . (٦)
دناڤ گوومێن خەونێن تەدا .
نمی دێون . . پیرهەڤبنە
دبا منێ
ئەڤە خەونە یان نەخەونە
کەر وێ بوینە کاریتە
ژانشا شانەکێ دبیت
گەنم گەڤوکا دگەزیتن
هێلینا دخوت .
. . قرش و زلا
کوریێن تەژی
هەر سوارێ یانکا تەتەو . .
پێر ژنحەلکێ بیانی .
سەرێ تە ددەن بەر نکلا !
دبا منێ
خفتانێ ڤێ خەوا گران
تو ژبەرکە
ئاگری بەردە خەمانو . .
خەمان و کوکا خو دبەرکە
هێسترا زای
نێشیکا پێریا تو هێلای
کیسەل گەهشتن زوزانا
هلو رابە
خێلی و تانو چارچوڤان .
ئەڤ دوکەرکە
خولیا کوچکێن نشنی
هەمێ خرکەو . .
بچڤانوکا مرنێ وەرکە

دبا منێ
دیزن پێن تەرا
مێژی یانە
لەشکەرێن رومێ دبورین
تە ژکووسکان .
تیر دوەشیان
دناڤ پێلێن پرچا تەدا
رەڤ رەڤ سەلحوڤی و تەتار .
عەوارە بون .
چونو نشیان
تەڤ (نیرویێن) . .
ئاڤ ژکانیکێن تە نوشی
ئ بو ژەهر .
نەمان گشتیان
قەمێن کبنێ (٧)
باپێن درەرباڤ و ئاوی
داڤ و زوڤ
. . هەمی قەشیان
سەربلندێ
توهەرمای دێ

---

١٩٨٨ / ١ / ٢٤

**پەیڤێن گران :**

(١) دێ - دەیك . دایك
(٢) نەند - لاتە . عرین
(٣) زبرگەهـ - معصب
(٤) کیونەرەش - پوشرەش . الزوج .
(٥) گەر - گەرد . توز
(٦) هادیس - دچیڤنوکێن گریکید خواوەندێ ژنەرمی یە
(٧) قەم - قام . الزراق .

سەلام محەمەد

# دوو دیمەن لە تابلۆی "بەندەکان"ی ڤان گۆخ

## بەرخ

جزووی زەردەواڵەی دوزەخ
لە ناخی مێشکتا چەق
لەوێشەوە . . ژەهری نەمان
بۆ ناو خوێن‌و ئێسقانت جوگەلەی بەست‌و
وردە وردە خاوبوویتەوە
لە پڕێکدا :
بینیت «ئیزرائیل» خۆیەتی‌و
لای سەرتەوە ڕاوەستاوە
دەستی چەپی بە توندی لە پرچت گیرکرد
بە دەستی ڕاستیش ، شمشێری
بۆ ئاسمان بەرزکردەوە
پێش ملپەڕین‌و گیان دەرچوون
تۆ چاوەکانت هەڵهێناو
ئەمجارەیان بینیت . . هێشتا
پەرداخەکەی شەوی پێشووت
نیوە پڕەو
زانیت کە دوێنێ ئێوارە
یادی بەرخێك مەستی کردی
بە بەر چاوتەوەسەربڕاو
ئەویش دیل‌و بێدەستەڵات
زۆر بە سۆزەوە ئەیباڕان

## شیرین

زستان . .
زستان . . .
خەم‌و برینی تەنیایی‌و لێکدانەوەم بۆتە زستان
شەختەی مەیو
بە لێواری گوێسەبانەی هەناسەما شۆڕبۆتەوە
سەرماو زریان
گوڵەباخ‌و نەمامەکانی ناوەوەم وێران ئەکەن
وەکو چڵی زەردەوەبووی
دار بەڕوویەکی بەجێماو لە دارستان
بای سەرەوخوارو . . سەرەو ژوور
لەگەڵ خۆیدا هەڵم دەگرێ
ئاو لە ناو ڕەگما دەیبەستێ
ڕەشەبای سەخت‌و . . وەیشوومەش
دەمباو . . دەمباو . . ڕاناوەستێ
پێش گرمەی هەوری گریانم
برووسکەیەك
ئەم زستانەش ئەسووتێنێ‌و
بە خۆڵەمێشی تەرمەکەی
نامەیەکم بۆ ئەنووسێت :
ئەکەی . . ئەڕۆی
ئەی شاعیرە بێ‌کەسەکە
ئەوەتانێ «شیرین» وا هات
خەم ڕەوێنەو . . «کۆچ»یش ناکات

٭ ٭ ٭

# هێلانا .. تە !!

ئەڤینا . . . تە
لناڤ دلێ من
ژینەکا بێ دیماهی یە
جیهانەکا هەروهەرە
ئەبەدی یە
باوەر ب - کە هێلانا تە
ل ناڤ پەرتوکێت
هوزانێت من دا نی یە
ئەو پەیڤەکا مشەختیە
نێ هێلانا . . . . . تە خەونەکە
نەیار دخەوا خو دابینن
خەیالەکە
شەڤە رەشێت خوینێت
درێژ.. پێ دبووڕینن
بەلێ نەشێن
ئەو ئارمانجا خو
بجی بینن
یان چرایێ ئەڤیناتە
لناڤ دلێ من . . . . ڤەمرینن
چونکی بزانە
گەر شەڤەکێ
ستێرا گەشا ئەڤیناتە
ل ئەسمانێ
یان و بەرێنێ دلێ من
نەهەلێتن .
ئەوێ شەڤێ . . .
بێ بژڤانە
کو بەژنا خەم خانێ بێتن
دا دوو لێڤێنێ وێ ب مێژیت
تێر ب مێتن
تێر ب مێتن

○

هاشم رێکانی

# دەروێش عەبدوڵڵا

● محسن ئاوارە ●

نە (با) یە هەڵیکردووە
نە هاو (دێ)ن هاتوونەتە خوار
چ هێزێ بێ ،
ئاوا دەجولێنێتەوە
درەختی چەم و لێرەوار ..؟!
ئاوەدان دیارە ئەم ناوە
دوێنێ ئێوارەیش هەر لەو دارستانەدا
خۆی بوو تەنکە سێبەرێکی رادەکێشا
بۆ سەرکانی
(کانی)یش هەر ئەو (کانی)یە ئاوە
کە لەسەر لاشەی زەویدا
وەکو پارچە، ئاوێنەیەکی شکاوە
دەم و چاوی ، پاك کردەوە
چەند گوڵمێ ئاوی خواردەوە
لەناو چاوی کانی مەنگدا
تەماشای سەرو ریشی تێکەڵ بووی خۆی کرد
دەستی پێداهێناو کەمێك هاتوو چۆی کرد
بەمەزنی خۆی هاتە بەرچاو
(ئاودیو)یش بوو
لەدڵی مندا گەورەتر ....
خۆی دەنواند هەنگاو بە هەنگاو

# خاك و خۆڵ

فاضل شەوڕۆ

دەمکوت دەبێ :
سەربوردەی تۆ ، لە گەڵ بسکی ئەستێرەکان
بهۆنمەوە ،
نیازم وابوو ،
بۆ ئەو شەوەم
بتکەم بە بێکە شیعرێك و
بە بێنێك بتخۆمەوە
خۆت ئەزانی :
کوانووی گیانم ،
بە شەماڵی عیشقت ئەبێ تاو ئاسێنێ .
لەحوزووری چاوانیشتا
چاوم ، ڕێژنەی ئەشکی شەوی ئاباریێ .
کەچی ئەمشەو

وا پێ ئەچێ ئێزت وابێ
ئەم پیاڵەشم لێ بشکێنێ
ئەم چەند حەرفە تەتو تاڵەم لێ بڕژێنێ .
ئەگەر مەستی ی
بگەیتە کەناری ئەو دەریا سوورەی
تاجی ئەمریم پێ ئەبەخشێ .
کەواتە تۆیش ئێمە مەگرە گەر
منیش وەکو ئەستێرەکان
لێت بکەومە شك و گومان
بێم : بازێی بەرستاری خەمرەوێنی ؟
یان شۆفاری دوژمن کاری چەنگ بەخوێنی ؟
ئەگینا چۆن دڵت دێنێ
دڵم هێندە بڕەنجێنێ !

دە تۆ وەرە ، هەر بۆجارێ
سەر دابکە بە پەنجەرەی ژووری دڵم
سا ئەزانی چۆنە بۆنو قوچە قوچی
مەشخەڵی دەروونو کڵم .
سا ئەپرسی :
بۆ تەمەنی ئەم شاعیرە
کەلاّش خوارە ، دەست بەسەرە ،
هێندە کورتو پڕ کەسەرە ! ؟
کێ ڕەشماڵی پرچی خاوی بۆ هەڵئەدا ؟
کێ شەو چرای بۆ هەڵئەکا ؟
خاتوزینە دڵگیرەکەم . . . !
بۆ ئەم کۆرپە چاو بە ئەشکەم
خۆم دایەنو شیرو بێشکەم .
گەر خۆم نەبم
کێ وا بە سۆز
لای‌لایەی خۆش . . . ،
سروودی جوان جوان . . . ،
حەیران دەشتی گەرمیان . . . ،
بۆ خونچەیەك ئەلێتەوە
کە لەم کونجە بچووکەدا
چرۆ ئەکاو ئەژێتەوە ؟
گەر خۆم نەبم ،
کێ ئەم گرێ ئاڵۆزانەی
کۆتی دەستم ئەکاتەوە ؟
کێ بریبی کۆنو تازەم
سارێژ ئەکا . . .
کێ دێ دڵم بداتەوە . . . ؟
ئەوە نی‌یە ڕۆژگارێکە :
لە ئاوای‌و چۆڵو بەندەن
گورگو چەقەڵ .
ئێسكو پرووسکم وورد ئەکەن !
کەسێ نی‌یە دوو مشتە گڵ
بکا بە سەر جەستەکەما .
بەڵکو ، ڕۆژێ . . . ساتێ زووتر
ئەبێتەوە خاكو خۆڵو
ئەچێتەوە باوەشی چیا .
خاتوزینە دڵگیرەکەم . . . !
ئێستێش کە تۆ
خەنیم ناکەی .
بە مزەی دوو ماچی ناودەم
لێم مەشکێنە جامی بادەم .
با ئەم پێکە شیعرەش هەڵدەم . . . :
بەلکو بە دەم خەیاڵەوە
وا هەست ئەکەم :
لاشەکەیان داپۆشیوم
بە خاكو خۆڵ .
دەستیان گرتووم :
لوتکەو ڕەزو ڕووبارو دۆڵ .

**فەرهەنگۆکە** :

سەربووردە : یا دو ڕووداوی بەسەرچوو
کوانوو : ئاگردان
ئەشك : ئەسرین . فرمێسك
پەرستار : ئافرەتی سەرپەرشتیکەری نەخۆش
شۆفار : بەدکار
کاڵ : خەرمانو کۆمەڵی ئاگر .
کەسەر : خەم . خەفەت
بەندەن : دەرەوەی ئاوەدانی
جەستە : لاشە .



# شیعر

**کاروان ئەنوەر فەرەج**

شیعر خەمە
شیعر ژانە
شیعر بەستەی هەژارانە
گۆرانی سەر زاری کۆیلەو
رەش و ڕووت و منالآنە

شیعر شا بەهرەی یەزدانە
شیعر لافاوی ویژدانە
زمانی ژیرو بیری تیژو
تروسکەی ئازاری گیانە

شیعر ئاوە
شیعر نانە
شیعر درووێنەی خەرمانە
شاروی دەغڵ و هێزی ئەقڵ و
دەنگی دووری هەندەرانە

شیعر ڕەشماڵی گەرمیانە
شیعر بەفراوی کوێستانە
کوخی چەمی بەستەڵەك و
مێرگی سەوزی بیابانە

شیعر ژینە
شیعر شینە

شیعر لێزەمەیی ئەسرینە
رازی دڵ و بۆنی گوڵ و
دوژمنی دڵ ڕەقی و قینە

شیعر منالێکی ڕوخۆشە
سەمفۆنیایەکی بە جۆشە
چاوساغی پیرو نابیناو
داوایەکی بە پەرۆشە

نوقڵ نی یە خەڵات کرێ
خورما نی یە بەرات کرێ
زەکات نی یە ساڵی جارێك
ببەخشرێ
شیعر کۆترێکی سپی یە
هەر کەسێك لەناوی بەرێ
خوا ئەیگرێ .

---

★ ★ ★

شاروی دەغڵ ـ پیش هەڵگرتنی دەغڵ و دان ، چەند کۆمەڵێکی بچوکی لێ دروست ئەکرێت پێی دەڵێن (شارۆ مەڵو).

# دەنگ نامرێ [1]

شۆڕش محمد علی

تەرمە .. یاکۆترێکی سپی بێ‌لەکەیە
به ئاسمانی .. دڵ و گیانی
(شیرین بەهارە) وەلکاوە ؟!
دەنگە یاگیانێکی بێ چرپەیە
لەسەر شانی .. خەمەکانی
چوار کۆڵەگەی دڵێکی زل
هەڵتروکاوە ؟ !
وەك مومێکی گەش و چزاو
لەبەر دەم ڕەوە کەوێکی سرك و تەزیو
داگیرساوە .. !
دەنگەو .. لەنێو قڵپی ڕشانەوەی
بێ دەنگیدا
بەگوێی کپی بێ دەنگەکان
دەچرپێنێ
ڕەنگەو .. خۆی بە ڕەنگی
خوێنی ئاڵ و گوڵی سوورو
دوندی چیا بەرزەکان دەنوێنێ !
تەقینەوەی ئاوازێکە
لەنێو داستانی چەرخی شەو
لەگرمەی خەوێکی گران و

خەونێکی ئاڵۆزکاودا
پڕ بەگەرووی دەقیژێنێ
[سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ]
[لەخەو ڕاپەرە ، هەوڵێ هیمەتێ]

## حاجی و شیعر [2]

لەئەستەمبوڵ بەرێکەوتن
بەنیازی وەی
ووشەکانیان
بەدەنگێکی ڕەسەن بەخشن
لەرێگادا
لەسێگۆشەی سەر سنووردا
شیعرو حاجیان .. لەیەکتر کرد
حاجی و گیانی
بەمیوانی .. چوون بۆ ماڵێ
هەر بەناوو ، سەرو سیماو کەلەشیان کورد
شیعریش لەنێو
دارستانی مێژوویەکی هێند تەزیو سڕ
خۆی گەیاندە
هۆڵی دڵی دەنگێکی چڕ !
قژی زەردی ووشەی ڕنی و
کرنۆشی بۆ لەرەی دەنگ برد
بەتف چاو مێژووی سواخ داو
هاواری کرد
دەنگ نامرێ و
ئەوەی مرد ..مرد !!
ئەوەی مرد ..مرد !!!

١ ـ ئەم شیعرە لە کۆڕی چلەی ماتەمینی (تایەر تۆفیق) ی هونەر مەند لەهۆڵی مەڵبەندی لاوان خوێندراوەتەوە
٢ ـ هی فائق بێکەسی شاعیرە ، مامۆستا تایەر تۆفیق بەگۆرانی دەیڵێ..

# چوار خونچە شیعر

**هیوا قادر محمد**

**خونچەی یەکەم :**

ئەمشەو شیعر
وەکو گریێی عانەتیابوی
فەقیانەکەی دایکم وایە
تاکو نەگریم . . ناکرێتەوە .

**خونچەی دوهەم :**

ژانی شیعر گرینۆکە
وەکو منالێکی سەرشێت
بەرد ئەگرێتە
پەنجەرەی فەرهەنگی ووشە .
چ شاعیرێك ؟
بەرگی ژانی
کردۆتە بەر «تولف»ی شیعری
چ ژانێکیش ؟
بە بەری هیچ شیعرێك بووە .

**خونچەی سیێهەم :**

کە شاعیرێك
قورگی پڕ نە گریێن دەبێت
ئاسۆی شیعریْ بەدی دەکات .
گویێی نەدەنگی
باڵی «باز»ی مێژوو دەبێت .
کە بازرگانێکیش دەگریو .
شینو واوەیلا دەگێڕێت
ئەوە منالە هەژارێك
گڕ لە مۆنە دینارەکانی بەردەداو
سەرمای جەستە بچکۆلەکەی
پێ ئەشکێنێت .

**خونچەی چوارەم :**

کە چاوەکانتم تێدەبڕیت .
دەبم بە هەنگ . .
کە پێڵوەکانت لێك دەنێیت
لێم تێکدەچێت !
لە نێوانی نوقڵی ئاڵی لێوەکانتو
شیلە گازەردی چاوەکانتا
بم بە هەنگ . . یا بە منالْ ؟ !



# پریاسکەی زامێکی قوڵ

سۆران محمد حسن
هاوینی ١٩٨٧

(١)

«تۆو خەمو خۆشەویستی گەورە ئەبن»
رۆژ لە دوای رۆژ
تینی گەرمی خۆشەویستیت
بەهێز ئەبێو
جەستەی ماندوی ساردوسڕم
ئەسوتێنێت . .
هەروەها تۆش
گەورە ئەبیو
خۆشەویستیش
لەگەڵ تۆدا گەورە ئەبێت
منیش بەرگەی
سوتان ناگرم
دەیسا هاوار !
گەردون . گەردون ! !
کات لە شوێن خۆیدا رابگرەو
چیدی بەگری ئەو عەشقەی
لەگەڵ تۆدا گەورە ئەبێ
نەتوێمەوەو هانا نەبەم
بۆ هیچ بن دارو بن بەردێ .

(٢)

«من و . . .»
ئەولاپاڵە
رەنگی زەردەو
نەخۆش دیارە
بۆ پزیشکێ
تیماری ئەو دەردەی ناکا ؟ !
ئەو لاپاڵە
خەمگین دیارە
هەڵپەرکێی مەرگی خۆی ئەکاو
خەندەی گریان دابەش ئەکا .
ئەو لاپاڵە
لە خوێنی خۆیدا تل ئەخواو
هەناسەی سوار
مەرگ پێشوازی لێ دەکا
منیش لەگەڵ ئەلاپاڵەی
پێکی فرمێسکی تێ ئەکاو
نۆشی ئەکا
خەممان یەکەو
پزیشکێ تیمارمان ناکا !

(٣)

«ئەستێرەی بەخت»
ئەڵێن ئەستێرە ناسەکان [١]
بەختی خۆتت ئەدەن نیشان
بەلام داخۆ
چ فاڵچیەك
ئەستێرەی بەختم ئەزانێت
لە کاتێکدا
تەنیا خۆم
ئەو ئەستێرە
بەختی منە
بەتاك ئەیبینم لە ئاسمان
لە ناوەندی تاریکیا
ئەسوتێت و
بەرهەڵستی گشتیان ئەکات
ساتێ دیارەو
ساتێکی تر بزر ئەبێت
وەك پەلەقاژێی مردن کات . .

° °

(١) بەواتای (منجمین)






چەنـدین ساڵە ئەم ڕێگەیەی گرتۆتە بەر ، لە ماڵەوە بەرەو شوێنی کارەکەی ، لەوێشەوە بۆ ماڵەوە . بە جۆرێکی وا لەوانەیە بە تەواوی بزانێ ماوەی نێوان ماڵ و شوێنی فرمانەکەی چەند هەنگـاو بێ . جارێ لەجـاران بە خەیـاڵیـدا نەهات لەڕێگەو شەقامێکی ترەوە ئەم هاتووچۆیە بکات . وای لێهاتبوو هەستی بەبـوونی ئەو دووکـان و خانـوو شوێنانە نەدەکرد کە بە بەر دەمیانا هەموو ڕۆژێ تێدەپەڕی . هەر وەك وێنەی هەڵواسراو لە ژوورێکـا بۆ ماوەیەکی زۆر ، مرۆڤ هەست بەبوونی ناکاو سەرنجی ڕاناکێشێت . نەك هەر ئەمە بەڵکو ڕوخساری زۆربەی هاموو شۆکەرانی ئەو شەقامەی لەلا ئاشناو ئاسایی بووبوون .

یەکێ لەو سەدان شتـانـەی کە هەموو ڕۆژێ دووبارە دەبێتەوە ئەوەیە ، هەموو بەیانیەك کاتێ دەگاتە نیزیك دەرگای ئەو بانقەی کە تێدا (پارە ژمێرە) ، خشەی گسکەکەی ـ عەلە ـ ی کرێکاری شارەوانی دێتە بەر گوێی . ئەو کابرایە ، لەگەڵ ڕۆژ هەڵاتا ، هەر لەسەرەتای ئەوشەقامەوە دەست پێدەکا بە ماڵینی تا کۆتـایی . ئەمە فرمانی دوا نەبڕاوەی ڕۆژانەیەتی .

ئەم وێنـە ئاسـاییـیە ئەمـڕۆ بەتایبەتی زۆر سەرنجی ئەمی ڕاکێشـاوە وای لێکردوە هەڵوێستێکی لەئاستا بکاو باش باش لێی وورد ببـێـتـەوەو بە قووڵی تێی بڕوانـی . پڕ بە دڵ خۆشـەویـسـتیـەك بەرامبـەری جۆشی سەنـد . عەلە ئەم هەڵوێستەی ئەحمەدەفەنی پێ سەیر بوو . ڕووی کردە لایەوە ، دەمی داچەقاندو دەستی لە ئیشەکەی سارد بوەوە .

ـ براکە بەیانیت باش .

- گیانت باش قوربان .

عەلە ئەم بەیانیت باشەی پێ سەیر بوو . چونکە ئەحمەدەفەنی هەموو ڕۆژێ لەم کاتەدا تووشی دەبێ ، کەچی تا ئێستا نەرووی‌داوە ئاوڕی لێبداتەوەو نە چاوەڕێی شتێکی وایشی لێکردوە . ئەم بابەیەکی زەوی ماڵ و ئەو فەرمانبەری بانق ، دەبێ چ شتێك بە یەکیان ببەستێتەوە ؟. ئەوەندە هەیە ئەم کابرایە لە کۆڵانەکەی پشت ماڵی ئەحمەدەفەنی دادەنیشێ . بەرەنگ یەکتری دەناسن بەڵام ناسینەکە نەگەیشتۆتە پلەی - بەیانیت باش - . (داخوا ئەمرۆ ڕۆژ لەکام لاوە هەڵهاتووە ؟!)

لەم ژیانەدا سەدان هۆ خەڵکی لەیەکتری جودا دەکەنەوە ، سەدانی تریش بە یەکیان دەبەستێتەوە . جیهانی مرۆڤ لە دەریایەکی پان و بەرین دەچێ . بەرووبەوە هەزارەها شەپۆلی ووردو درشت لەجم و جوڵدان . ئەو شەپۆلانە هەندێ جار پشت لەیەك دەکەن ، لەیەك دوور دەکەونەوە . هەندێ جاری‌تریش بەتوندی باوەش بەیەکدا دەکەن و لەیەکتریدا دەتوێنەوە . ئەمرۆ ئەحمەدەفەنی نۆرەی باوەش پیاکردنی عەلەیەتی . لەدوێنێکەوە هەست و هوشی بەتەواوی هەژاوە . مێشکی پرش و بڵاوە . چەند دەکا ناتوانێ فەرامۆشی بە خۆی بدا (کورە باوکم خۆ ئەمە یەکەم جار نیە ناخت ئاوا دەهەژێ ، ئەمە بۆتە خۆراکی ڕۆژانەت) نەخێر ئەمجارەیان گەیشتۆتە کونە لووت...

- فەرموو پارەکەت .

ئەوەبوو دوێنێ ئەحمەدەفەنی پاش ئەوەی لەژماردنی دەستە دەیی‌و بیست و پێنجی‌یەکان بووەوە ، دایە دەست کابرایەکەوە کە لەبەر دەم مینا بەندەکە لەگەڵ هاوڕێیەکیدا ڕاوەستابوو . کابراش بە هەڵپەیەکەوە باوەشی بۆ کردەوەو پەستایە ئەو هەگبەیەوە کە بۆ ئەم مەبەستە هێنا بووی . ئەمجا لەگەڵ هاوڕێکەیدا کەوتە قسەکردن (لەسبەی زووتر نیە ، دەست بە بناغە لێدان دەکەم .)

ئەحمەدەفەنی بیست ساڵە پارە بۆ خەڵك دەژمێرێ‌و باخەڵیان گەرم دەکاتەوە ، هێشتا بناغەیەکی بۆ خۆی لێنەداوە . تا ئێستا دەرفەتی ئەوەی نەدراوەتێ ، وەکوو بۆ هەندێ دەرەخسێ ببێتە خاوەن کونجێکی خۆی . هیچ جارێ وەك ئەمرۆ بە قووڵی بیری لەم دواکەوتنەی خۆی نەکردۆتەوە . دەڵێی تازە لە خەوێکی درێژ بە ئاگا هاتووە . هەستی کرد بە تەواوی لەکاروان بەجێ‌ماوەو کەسێکیش نیە ئاوڕێکی لێبداتەوە . توون بردیەوە . دەرگای مینا بەندەکەی بەر دەمی بەتوندی پێوەدا . وەك بڵێ : بەخوا ئیتر پوولێك بۆ کەس ناژمێرم . با بەس نۆرە بریم لێ بکرێ . ئەم لۆدە دینارەی کە بە هەزاران شەڵتەی لێ دەردەچێ ، زۆریشی بە ناو لەپی مندا تێپەڕ دەبێ ، شوێن پەنجەم بەسەر هەموو دینارێکەوە دیارە . دەبا جارێکیش هەندێکی بۆ خۆم لێ بژمێرم . هەستی بە تەنیایی‌و بێ دالدەیی‌یەکی تەواو کرد . خۆی لەچۆڵی بیابانێکدا بە بەجێ‌ماویەوە بینی . لەئاسمان زیاتر نیە بیی پارێزێ . ماف لەهەڵژینی بای ئەو بیابانە زیاتر نیە . کەسێ مشتێ خۆڵی پێ ڕەوا نابینێ .

ئەو شەوە هەتا بەیانی گینگڵی داو بەدوای نموونەکانی وەك خۆیدا عەودال بوو خەوی پێیانەوە دەدیت . لە گەڵیانا بۆ سکالای یەکتری گوێیان دەگرت . خەوی بە باوکی‌یەوە بینی ، لەو خەوەدا ، باوکی ئەو کورتە چیرۆکەی بۆ دووبارە کردەوە کە زۆر جار لە ژیانیدا بۆی باس کردبوو . ( ڕۆڵە بەخوا ، هەر لەبەیانیەوە تائێوارە ڕەنجمان دەدا ، یان لەناو لیتکاوی مەرەزەدا قورمان دەشێلا یان خەرمانی چەڵتوکمان دەکوتا ، کەچی ئێوارە کە دەگەڕاینە ماڵەوە ، هەر شلەساوەرەکە بوو !)

ئێستا وا ئەمیش لەڕاست عەلە ڕاوەستاوە ، چارەنووسی خۆی لەنێوچەوانیدا دەخوێنێتەوە . هەناسەیەکی هەڵکێشا . ئەم و ئەو چەند داوێك بەیەکیان دەبەستێتەوە . یەکێ لە داوە هەرە ئەستوورەکان ئەوەیە : عەلە هەموو ڕۆژێ شوێن پێی هاتووچۆکەران پاك دەکاتەوەو دەیماڵێ . گەرد بەجادەو شوستەکانەوە ناهێڵێ . بۆ نەگبەتی ، ئەوەندە دڵسۆزیشە ، تا باش دڵنیا نەبێ لە پاکی هەموو بستێ وازی لێناهێنێ ، کەچی کاتێ لە کارەکەی دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە کۆڵانەکەی خۆیان ، دەبێ باش خۆی لێهەڵکاو دەجار دیقەتی ئەم لاو ئەولای خۆی بدا تاوەکوو شوێن پێ‌یەکی ووشك بۆ خۆی دەبینێتەوە بیکاتە بەردەباز...!



# چەند کورتە چیرۆك

عەبدلایێ جندی

## زاڤا

یێ تێن د جەهدێدا شور دبنە خارێ ، **دەنگێ وان ئەو هاویرا** مشت کری . ئەڤە هاتن گەهشتنە من ، **ئەژی تشتەکی ژ وێ** کێش و بەرێ نزانم ، من هند دیت **کاڤا گەهیشتینە من** کێلنجیەك بمن کەت هند بوی ئەز دەڤ و دەڤ کەتیم . **دوی** دەمیدا من ژ ئێکی **پرسی و گوتێ:**

ـ ئەڤە کیـیە هون ب سەریرا لاڤژا دبێژن؟! ژ هەمی **دلێ خوە** **دەست قوتان** و کرە کەنی ، گوت :

ـ ما نزانی زاڤایێ مە کورێ موختاری یە ! **موختاری دڤێت** ب ساخیاخوە کورێ خوە بکەتە زاڤا!

## پێلاڤ

خەلکێ داجریایە بەر دەرێ چایخانێ سوحبەتا لسەر کەلەخێ وی گەرم و شاریایە ، دوان دەمارا دینەك ژی ل وێرێ بەرهەڤ بو ، گوت:



**پێکرنە کەنی و گوتنێ:**

ـ **ئەڤی زاروی چیە دەشت بویە ئەردی؟**

ـ **ئەڤەژی هەڤالێ تەیە** . پێلاڤا سمبێل بوقێ هەنێ یا بویاغ کری ، **هەکو هەقێ** خوە ژێ خارتی شوینا هەقێ وی بدەتێ پێلاڤا **حەشاندییە** د دەڤیدا و یێ گرێل کریە ڤێرێ.

بو **لیقە لیقا** شێتیو د جەهدێدا شور بو خارێ ، گازی دکر:

ـ **هەچیێ** هەقێ خوە بخازت ئەوێ دینە!هندی ئەوی خەلکی گوهـ لێ بوی ئەوی هەر دکرە گازی ( هەچیێ هەقێ خوە بخازت ئەوێ دینە!)



# لێ بەرزە بوون

خوها لبن دەست و پیادا تێتە خارێ و حنکە حنكا وییە. گوتێ:
- ئەرێ تە چیە وەسا بدلێ سوتی ئەڤی دیوارێ دسمی؟
بدلەکێ ژ خوە رازیو ب لێڤا ژووری گوت:
- تە چ ژێیە! ئەزێ دیوارێ دسمم و دێ لێ سەرکەڤمە بانی.
ئەویژی وەسا لسەر خوەو هێدی گوتێ:
- برا، ئەگەر تە بڤێت سەرکەڤییە بانی، خوە ب هندیڤە مژویل نەکەو دەمێ خوە ژ کیس نەبە، تێ ویتهەنێ پەیسکێ و لێ بسەرکەڤە!

○

# سەیدا

یێ بەرەڤ گوند دچن، هەمی سپێدا هەکو ژ مالێ دەردکەڤن یێ وەسیەتێ دکەن پاشی بێ خاترا خوە دخازن و دچن. هەمی روژا کەسپ و کوکێ وان ئەڤەیە، ئەوێ روژێ هندی بێژی روژەکا تەحلییە، باران وەسا یا د بارت خوە دێ بێژی جەرکێ سەر نشیڤ بوی وەلێ بادباریتن، ژبل مەترسیا ریکی بخوەچونکی ریا گوندی تەڤ ژێلەلیو نشیڤینە، ترسەکا وەسا ئەوێ روژێ یاکەتیە د دلێ واندا هەر خودێ دزانت چەندە. هەر چاوەبت بسلامەتی نێزیکی گوندی بوون، ئینا هەمیا پارە خرڤەکرن کریا شوفێری دانێ. شوفێری چاڤەکێ وی یێ ل پێشیا وییو ب یێ دیژی هێڤکرە پارا، بێهنەکێ ماو گوت:
- هندیدی پارێ منێ مای. سەیدا گوتن:
- مە هەقێ تە ب دروستی یێ دای.
- راستە، بەلێ ئەڤروکە دێ دوو هەڤا ژ وە وەرگرم چونکی گەلەك تەحلییە.
- نێ کورێ تە ژی قوتابییە یێ ل مەکتەبێ. وان هو گوتێ.گوت:
- ئەز نزانم، کور قوتابییە، ئەز شوفێرم هون ژی سەیدا.
- سەیدا وەسیەت، وەسیەت سەیدا. یا یێ مای هەمیا هوگوتن.

# ئۆتۆمبیل

ئێك بو پێشڤەیە، دوو بو پاشڤە، سێ ژی بو سینگیڤە، چار ژی بو پشتێ ڤە. ئەڤ نمرا هەنیژی دێ بو پشتڤە ڤەگەرێیت. تە زانی؟
ئەو یێ د وێ کێش و بێشیدا وهای ژ دەرێ دنیایێ ئینە. ژ نشکەکێڤە ئێکی سەرێ خوە د پەنجەرا دەریرا کرە د ژوورڤە. گوت:
- مەجۆ ئەڤەتو ڤێرە؟
- وەهـ ماچییە! ئەزێ هوی دبمێ، من ئەردێ خوە یێ ب مشتەکا دینارا فروتی و ئەڤ ئۆتۆمبیلا پێ کری.

---

سەرەنج: ئەڤ چیروکنە دگەل دوو چیروکێن دن ل هەولێرێ ل روژا ١٢/٤/١٩٨٨ هاتنە خاندن.

○

# سۆپرانۆیەکی دڵتەزێن

● نەورۆز عباس سعید ●

شەو بوو تارای تاریکی رووەمەنگ و قەترانی‌یەکەی لەگەڵ پەڵە هەورە جیاکانی ناو باوەشی ئاسمان ، یەکیان گرتبوو ... ئەستێرەکان بەبێ دەنگی لە کەژاوەی شەوێکی خامۆش دا ، کە چاوەروانی بوو بووە خولیای دڵە بێ ئۆقرەکەی ، چاویان وەك سۆمای پێشەنگی کوری دەبریسکانەوە ، گەڵا رەنگینەکانیش بە ئاورنگە چاو سەوزەکان ئارایشت کرابوون ، بە چوار دەوریا وەك مرواری دەدرەوشانەوەو بەدەم سەمفۆنیای نزدبایەکی هەناسە تەرەوە سەمایان دەکرد .... بێشکەی منالەکەی راتەژاندو چاوەزەشەکانی وەك کامێرایەکی گەرۆك دەسوراند ، لەبەر خۆیەوە دەیووت :

« نەهاتەوە نەء نەهاتەوە ، تۆ بلێی ئێستاکە لە کام کووچە بێت ، دەبێ کارەکەی ئەنجام دابێ ؟.... کە رۆیشت ناساغیش بوو ، ووتیشی کە دەگەرێتەوە : ئارام گیانَ دەمەوێ جێ نزرگەت باوەشی من بێت ، نەء نامەوێ وابێ ! هەر پێکەوە وەك رووبارو دەریاو درەخت باوەش بە خاکدا دەکەین . » ...

خۆزگەی خەڵوەتی شەوانی پێشوو بوو .... بەدەم ئەندێشەیەکی قوڵەوە سەیرێکی کات ژمێرەکەی کرد ( ـ دوو نیوی شەوە ) ... لە ناکاو دەنگی پێشەنگ بەرز بووەوە ، فانۆزەکەی تەنیشتی هەڵگرت و خێرا سەر بێشکەکەی لاداو سەیری کرد ، تا بزانێ ماریان دووپشك پیانەچزاون، کوڵیتەکە جێی متمانە نەبوو ، چەند حەسیرە کونێکی پێکەوە نراو بوو هیچی تر ....

نشیمەنیش لە دۆڵێکی واچرووچۆڵا ، جێی سەرسوورمان نییە ئەم جانەوەرانەی لێ بێت ، بەدەستە ناسکەکانی پاڵی بە بێشکەکەوە دەنا ، ( تەق ... تەق ... تەق ... تەق ) ... حەپەی سەگ وەرەکان سەرنجی بۆ کوڵیتەکانی بنار چیاکە رادەکێشا ، رووناکی تیا نەبوو ، ئەم چەند رۆژە خەڵکەکە زۆر ماندووبوون ، وا دەچوو هەموو نووستبێتن و پرخەی خەویان بێت : هەر لەگەڵ دەرکەوتنی تاڵی گرنك خەریکی چاککردنی بەزمی کوڵیتەو کەل و پەلەکانیان بوون ، ئای کە ئارەقیان رشت ... بەپرتاو شتێك کەوت بە دەرگای حەسیرەکەداو ئەمیش شڵەمی‌یەوە ، هەستایەسەرپێو لەبەر خۆیەوە ووتی :

ـ ئەبێ چی بێت ؟! ها ... پشیلەیە!

دەستێکی بەسکی‌یەوە گرت و سەیری چاوە زیتەکانی دەکرد ، وەك فسفۆر دەبریسکانەوە ... وردە وردە هاتە پێشەوە (میاو ... میاو) پارچەیەك نانی رۆناوی کە لێی مابووەوە ، بۆی هەڵدا ، سەیرێکی پارچە نانەکەی کردو نەیخوارد ، خۆی کرزۆڵە راگرتبوو، نووزە نووزی تەنیایی‌و بێ دەنگی شەوی لەهەستیا بە خەبەر دەهێنایەوە ، پاشان تۆزێك دۆی بۆ رشتە ناو قاپە شکاوێکی تۆزاوی‌یەوە ، هەر نەیخوارد !

بەڵام ئەمجارەیان ورد ورد هاتە پێشەوەو خۆی لەقاچە خەنەکراوەی‌یەوە هەڵسوو ، ساتە نا ساتێکیش بۆ لای دەرگاکەی دەروانی‌و هەر میاوە میاوی بوو ... رووی لەسەر پشیلەکە لاداو بەناچاری چووەوە ناو کەشتی خەیاڵی‌یەوەو ، کەوتەوە ناولەپی نیگەرانی بەتاریکی‌یە بێ شومارەکەی دا دەروانی ... رووناکی فانۆزەکەش لەدەم و چاوە پانەکەی دەدا ، کوڵمەکانی ئاوساو دیاربوون و سێبەریان لەچاو یاچەقەنەبزو لەدوور سەیرت بکردایە دەتووت چاوی هەرنێن ، پاشان لەسەر کەرەوێتە تەختەکەی تەنیشتی درێژبوو ، بۆ ئاسمانی دەروانی ، بەژنی لەم سەرو ئەو سەری دۆشەکەکە هاوتا وەستا بوون ، باڵا بەرز دەبینرا :

شەوێك لەشەوانی کەوتەوەیادکە «ـ ئارام ـ چاوی دزە دزەی بوو ، هەرکە بەدەنگە کپەکەی گۆرانی جەژنانەکەی دەووت دەیزانی ماچی لێ داوا دەکات ، ئەمیش بزەیەکی لەسەر لێوی بۆ دەنەخشاندو جەژنانەکەی دەدایە .

ـ ئارام منالەکەمان ناو بنێین چی؟

لە جێی‌خۆی هەڵاژا، وەك کۆترێکی گەوی چووە ژێر باڵی‌یەوە .
- جارێ وەختی ناو نی‌یە .
- گەر کوریوە پێشـەنگ بانگی دەکەین، گەر کچیش بوو تابلۆ خۆشـە ، بەڵام چەرمە سەری‌و نەبوونی ئەترسم بەختیاریان نەکات !
دەستە زبرەکانی بەروویدا دەهێناو، پەنجەکانی لەناو تاڵەکانی پرچیدا وون دەبوون، بە ئەسپایی دەدوا، لە تابانی ناو چاوی وورد دەبووەوە .
- هەر وورەم تیا بێت، بەختیاریان دەکەم و لای ئەو دەبەنگەش ئیش ناکەم، دوکانێکی بچکۆلە بنیات دەنێم .
دەگەشایەوە بە چرپە چرپەکەی ئاسوودەیی لە دڵیا دەخولقاند، پێکەنینی دەهات بەوەی کە بیری لێ دەکردەوە .
- چەند خۆشەبتبینم بە مامە پیرەیی و مناڵەکانیش کەسانێکی بێ وێنە ...
- گوڵشەن گیان دەبێ مناڵەکانمان چاك بنو خزمەت لە پێناوی خۆشی خەڵکی دا بکەن، دەنا بە مندالی خۆیان نازانم ! » .
هەستاو بەرەو ژوورەوە رۆیشت تابچێت بەتانی‌یەك بهێنێت و بە مندالەکەیدا بدات ... هەر کە دەرگـاکەی ترازاند، پشیلە رەشەکە، لە پەنایەوە خۆی کرد بەژووردا و چووە ژێر دۆلابە قاچ شکـاوەکـەوە خۆی دانەواندەوەو بینی کە بێچووەکەی بەدەم هەگدەرێو بەسەر لەقاندنەوە ، بۆ دەرەوە مل دەنێ ، سروشکە گەرمەکانی بەکوڵەکانیدا هاتنە خوارەوەو لەسەر زەوی‌یە ووشکە کە گیرسانەوە ، لە دڵی خۆیدا دەیووت:- ( - ئای ، ئەبێ ئێستا باوکی لەچ خوێریتی‌یەك بێت ؟
ئاخۆ لەچ نێچیرێك خۆی مەڵاس داوە ؟ دایکە کەشی ئاواجرت و فرتیـەتی تا لە زۆرانبازی ژیان بیانپارێزێ ، ئەی خۆ باوکی پێشەنگ خوێری نییە ، ئەی بۆ ... ؟!
بە فەقیـانـە شل و شینـەکەی فرمێسکەکانی سری و بەتانی‌یەکەی هێنا ، سەیری کرد مناڵەکەی گمەگمی دێت (- دیـارە هەستاوە)پەردەکەی لادا، چاوەکانی زیتەیان دەهات و رووناکی‌یەکی بزێووی تیادا دەجوولا، خۆیشی وەك رەشپۆشێك لە رووناکـی‌یـەکـەدا چەقی بوو، بزەی پێکـەنین سەر رووی گرتبوو، دەمی دەکردەوەو ئەترقیایەوە، خیزە خیزی سنگیشی وەك دەستـار دەهات ؛ بۆ ئەوەی نەخۆشی‌یەکەی لێ پیس نەکات ، هەندێ لۆکەی بۆ خزاند بوو ژێر دەسترازەکەوە ، تۆزە تۆزیش بە زنجیرە مێخەکەکەی سەر سەری، یاری بۆ دەکردو دەستی بە روویا دەهێنا ، مەمکە بچکۆلە لاستیکەکەی کرد بە دەمیداو بەتانی‌یەکەی پیادادا ... دەنگی سمی کۆمەڵێك وولاخ بزواندی - کە لەگەڵ بەردەڵانی رێگاکەدا چەخماخیان دەکرد ، تاباشتر بیـانبینێ پێڵووەکـانی چاوی کەمێك هێنایەوە یەك ، کە نزیك بوونەوە رێچکەی لای راستی کۆڵێتەکەیان بەرداو لە جۆگەکەوە بەشلپ و هورو تەقە تەق دەرچوون، کە گەیشتنە هەڵەمووتی بنارەکەی بەرامبەری ،یەك یەك و دوو دوو سەردەکەوتن دەنگی سم و مرخە مرخی هێسترەکان کەم دەبوونەوە ... لە پشتی گا بەردە چەقیـوەکـانی لووتکەی شاخەکەوە ، مانگ بەهێمنی وە دەرکـەوت ، چەشنی بنیادەمێکی خەواڵوو رێگای خولگەکەی گرتبـوو ، سورانـەوەکـەی لە عاشقێك دەچوو بخوولێتەوە بە دەوری دەستگـیرانێکی کۆستکـەوتـووی‌دا ، ناو دۆڵەکـەی رووناك کردبـووەوە ، سێبەری بنارەکەی بەرامبەر کۆڵیتەکە خەستر بوو ، ئەگەر ئارام بهاتایەوە هەر لەوێوە دەر دەکەوت ، خامۆشی پتر باڵی بە دەورو بەرەکەدا کێشا ، سروشت سەرەپا لە نووستـوو دەچـوو ، لە پرشلپەیەك راپیسکان ، سەرنجی رووەو تاریکی یەکە بەرێ کرد ، دەنگێك بە نزمی هاواری کرد

- ( گوڵشـەن ... گولشـەن ) ...
دەنگـەکـەی ناسی‌یـەوەو رایکـرد بە ناو چیلکەو چەوێڵی سەر رێگاکەدا، گەیشتە سەری .
- ئاە .. ئاە ئارام بۆ ئاوات بەسەر هاتووە ؟ !
باوەشی پیاکردو توند لە ئامێزی گرت ، سەری بۆ ئاسمانە روو گرژەکە هەڵبری و نەیدەوێرا سەیری ئارام بکات ، ئەهریمەنیش هەروەك دوژمنایەتی هەبێ لەگەڵیاندا ، رەزمێکی کردە مارەیی ئەم شەوەو بایـەکی سەر شێتـانـەی هەڵکرد ، بە پرچەکانی گوڵشەن دا خۆیان گیر دەکردو دەیاندایەملاولادا تۆزو خۆڵیشی لەگـەڵ هەڵگـرت و لە ناوەنـد را لوولی دەدا نەیـدەزانی‌چۆن بیگـەیـەنێتـە ژوورەوە ! پێشـەنگیش زیقەی لێ بەرز بووەوە ، سەیری کرد دەستی لە دەسترازەکە دەرهێناوە ئنگا .. ئنگای سۆپرانۆیەکی دڵتەزێنەو لەگەڵ کارەساتە ناوەختەکەدا بەدەم رەشەباکەدا هەڵدەکێشی

پەراوێز :
سۆپرانۆ : دەنگی تیژی ئافرەت و مناڵ
کۆڵیتە : ژووری بچووك ، (کوخ)
کەرمۆیتە : قەرموێڵە .
هەڵاژا : راکشا
هەڵەمووت : پلەی سەختی نێو کێوان





# شەش پەنجایی

دانا علی سعید

هەموو هەنگاوێکی نوێ ، کەللەی سەرسامیت گەورەتر دەکا .. حەپەساویت .. تەزیویت .. نامۆی .. ماندوویی .. نازانیت ئەم رێکەوتە چۆن بوو! کامە قەدەر هەڵی پێچای؟ بیست و دوو ساڵ تەمەن ، هەروەك مردوو ، یاخود نووستوو، لوت بەرچاوەکانی گرتوویت و لەم جیهانە بێخەبەری ، هەرچی‌یەك ئەبینی نامۆیە پێت ، هەست ئەکەی دڵ و مێشکت خەریکە دەئاوسێن ، چەند تەکان ئەدەی بۆ پێشەوە نامۆتر ئەبی، ئەو دەم و چاوانەی بەبەر دەمتا دێن و دەچن نەدی‌و نەناسیاون ، تەنانەت هەڵس و کەوت و زمانیشیان جیاوازە ، هەروەك لەئەستێرەیەکی‌تر دابەزیبی وەهایە . لەوەتی گوێچکەی راستت رووواوە لەم شارەدایت ، کەچی هەروەك خەون ئەم بەشە گەورەیەی شارت دێتە پێش چاو ، لەگەڵ ئەم هەموو تێرامان و سەرسامی‌یەتدا ، کزەبا ساردەکە ماوەی لە هۆش خۆ چوون نادات و بەردەوام ووریات دەکاتەوە .. بێ ویستی خۆت هەنگاوەکانت لەبەر دەرگای سەراوە بۆ لای سینەماکان کێشیان کردیت ، ئەوەندەی‌تر حەپەسایت ، خۆت لەناو حەشاماتەکە ئاخنی ، هەروەك منداڵ بەبێ ترس و بەبێ شەرم بە هەموو شتێکدا هەڵئەروانی ، عەرەبانەیەکی دەستی ، مەنجەڵێك شیرو فەردەیەك سەمون ، زیاتر لە بیست کەس تێی ئاڵاون ، دوو چایخانەکەی بەرامبەر ، هەروەك گوزەرە رەنگاو رەنگەکانی ئێواران دەرزی هەڵدە ناکەوێتە زەوی ، بەدرێژایی شۆستەکانی ئەمبەرو ئەوبەر خەڵکێکی زۆر راوەستاون و چاوەروانن ، ناوەراستی شەقامەکە ، ئەو شەقامەی لە نوێژی نیوەرۆدا بە راکردنیش لە ژێرتایەی ئوتومبێلە زاق و زریقەکەرەکان قوتار نابیت ، حەشاماتێکی ئێجگار زۆر بەسەربەستی دێن و دەچن .. ئەم کۆمەڵ سڵاو لەو کۆمەڵ دەکاو ئەم تەوقە لەگەڵ ئەوداو ئەویان هەواڵی ئەمیان دەپرسێ‌و ئیتر واهەست دەکەی هەموویان خزمن . تەنها تۆخۆت بە تاك و تەنها دەزانی ، کەس ناناسی‌و کەسیش ناتناسێ ، بەجۆرێك دەستەکانت لە گیرفان توند کردووە ، شایەتی ئەوەن کە بە هیچ جۆرێك چاوەروانی وەڵامدانەوەی سڵاوێك نیت .

سەرمای بەیانیان سەختەو پیاوی تۆکمەو خۆراگری دەوێ ، فێری ئەم سەرمایەنیت ، ئەوەتا دەم و لوتت هەروەك گوێژ سور هەڵگەروان ، بەڵام دەربەست نایەیت .. دێیت و دەچی .. جارێك بۆلای مزگەوتی گەورە ، جارێکی‌تر بۆلای پردەکەو لەوێوە بەرەو سینەماکان .. ئیتر بەبێ مەبەست دەخولێیتەوە سەرماکە بەتەواوی کەسیرەی کردوویت و ماندوویت ، بەڵام بێزار نابی ، چونکە تەواوی شتەکان لای تۆ نوێ‌یەو گۆشەی گشت

دیمەنێکیش باڵای سەرنجت دەپێکێ .
گرمە گرمی زۆپای ناو چایخانەکەی تەنیشتت ، هەنگاوەکانی راگرتی ، بێبیرکردنەوە بە چوار هەنگاو خۆت گەیاندە بەردەمی زۆپاکە ، تاوێکی باش رەق راوەستایت ، ووردە ووردە پیرە زۆپا دەمــارەکــانی جەستــەی خاو کردیتەوەو سەرو کەللەت گەرم داهات ، چایخانەکەو خەڵکی ناو چایخانەکە ئەوەندەی‌تر ورو گێـژیـان کردیت ، ماوەی چوار ساڵیش دەبێ هەموو رۆژێك بەلای کەمەوە سەعاتێك لە چایخانە دادەنیشی ، بەلام وێنەی ئەم چایخانەیەو ئەم خەڵکەت هەرگیز نەدیوە ، هەموو شتەکان سەیرو سەرسورهێنەر دێنەپێش چاوت .. ئەوەتا کابرایەك هەر لەســەر زەوی‌یــەکــەو لەولا پێــڵاوەکــانی تۆوە چوار مشقی دانیشتــووەو نان ئەخــوات ، زۆربــەیان جزمەو پێڵاوەکانیان داکــەنــدووەو بەرکــەمــاڵ لەسەر قەنەفەو کورسی‌یەکان پاڵیان داوەتــەوەو دانیشتــوون ، یان هەر بەپێــوەو بەسەر زۆپاکەوە چایەکی گەرم بە دوو قوم هەڵدەلووشن ، مامە عەبەی چایچیش هەر مەپرسە ، ئەوەتا بەردەوام فرتەی دێو هەراو هاواری رۆژە رێیەك ئەروا ، بەڵام چاوەزیتەکانی تۆ لەجرت و فرتەکەی مامە عەبە بزێو تره .. بە هەموو کونج و کەلەبەرێکی چایخانەکەدا بێوچان دێت و دەچێو هەڵدەمروانێ .. لە ناکاو دیمەنێکی سەیر چاوە زیتەکانتی جڵەو کردو بەهێمنیش مێشك و دڵتی زەوت کرد .. دیمەنی دوو کابراکەی بەرامبەرت .. یەکێکیان نانی ئەخواردو ئەوی تریشیان بە ئاشکرا لە دەست و پەنجەی مۆر دبوەو بە شانازی‌و بروا بەخۆبوونێکی سەیرەوە پێی ووت :ـ

ـ ئەرێ ساڵە تۆ خوا غەزەبی لێگرتووی؟

ـ بۆ؟

ـ هەموو بەیانی‌یەك شەش پەنجایی رەق ئەکە یتەوە !

ـ ئەی چی‌بکەم ؟

ـ بۆ لەماڵەوە نان ناخۆی؟ لە ژنەکەت ئەترسی..؟

ـ ئەمەیان باشترە .

ـ غەدرەکەیت ساڵە ، شەش پەنجایی بۆنانی بەیانی‌کەم نی‌یە!!

ـ ئەزانم ، بەلام .....

ئەم شەش پەنجایی‌یە بووە شەش هەزار پرسیاری بێ سەرو پێو کەللە بچکۆلەکەتیان قووڕس کرد .. ژاوە ژاوێکی سامناك گۆمــە مەنگەکەی ناوەوەتی شڵەقاند .. رەنگی مناڵیت ئاوەژوو بوو ، سەرو سەکــوتت بە فەیلەسوفێك دەچوو ، کە بەرامبەر هەزارەهــا فیلە پرسیار راوەستابێت .. بە ئەسپایی لە زۆپاکە دوورکەوتی‌یەوەو بە دوو قەڵەمباز خۆت هاویشتە نێو شەقامەکە ، هەر وەك بە دووی شتێکا وێڵ بیت کەوتیتە هەڵپە ، هەڵچوونێکی شێتانە هەنگاوەکانتی هەڵگرت . شەش پەنجایی بووە قەلایەکی سەخت و لەتەنها ساتێکدا هەزاران رمە پرسیاری لە کاسەی بیرکردنەوەت هەڵئەچەقاند .. ئەم تەرازووەیش بە تۆ هاوسەنگ ناکــرێ .. ئەوەتــا ئارامی‌و سەرسورمانت خەریکە لە ووزەدا نامێنێ‌و ئەبێتــە قریشکــە .. قریشکــەیەك ، بەجارێ ووشکە کەڵەکی بیست و دووســاڵ تەمــەن بەســەر ژووره تەســك و تەنگەبەرەکانی مێشك و دڵتا برمێنێ .. تێ ناگەیت!. نازانیت!. بۆ ئەبێ شەش پەنجایی لای کەسێکی دەست و مەچەك زبرو ئەستوور هێندە گەورەو بەقەلافەت بێ ؟ کەچی هەر لە ئێوارەی ئەم بەیــانی‌یــەدا ، دەست و پەنجە ساف و نەرمەکان لەسەر مێزێك گوێچکەی دەیان دینار ببرن ، هێندەی تەنها چایەکی خەست و هەڵپروکاوی مامە عەبە نرخ و سەنگی‌نی‌یە !! ئەم پرسیــارە پەلوپــۆی هێمنیت ئەشکێنێ‌و ووڕگی سەرســامی‌و حەپەساویت ئەئاوسێنێ .. باڵی خەیاڵ هەندێك جار هەڵۆئاسا ، لە هەوری پەشمەکی‌دا وون دەبێت و هەندێك جاریش هەر وەك و جرج لە کەلێن و زۆنگاواندا خۆی هەڵدەسوێ .

بە خێرایی لوقی درێژ بە دووی جێ مەنزڵتا وێڵە .. چاوەکانت ئەگێڕی و بەبێ پەروا هەڵپە ئەکەیت .. ئێستە شارو خەڵکی شار لە پێش چاوەکانتا بوونەتە دوو جیهان ، دوو رەنگی دژ بەیەك ، رەنــگــی رەش و رەنگی سپی .. دوو ئەستــێرەی جیــاواز .. ئەستێرەی بەیانیان و ئەستێرەی ئێواران وا هەست ئەکەیت لە بۆشایی نێوان خەڵکی شارا هەڵواسراوی .. خۆیشت نازانیت لە کامیاندا ئۆقرە ئەگری .. ئیمپراتۆری گیان و هۆش و حەزت کامە جیهان داگیر دەکات ؟ ئەو جیهانەی بیست و دووەوەرزی بەفری تواندەوە .. یان ئەو جیهانەی رێکەوتی تەنها یەك بەیانی دەست و پەنجــەی تەزانــدویت و گڕو تینی لە شتی کردوتە سەهۆڵ بەندان ؟!

★ ★ ★

چلەی (چا) هەڵپروکاوەکانی مامە عەبە چوو .. ئەڵێن ئەوەی چل ڕۆژ نوێـژی بەیـانیـان بکـات ، ئەتـوانێت تا هەتایە نوێژی بەیانیانی نەچێ .. ئەوە تۆیش چلەی کزەبا ساردەکەی بەیانیان و (چا) خەستەکانی مامە عەبەت تەواوکرد .. ئەشێ کەی ئەم فێیە شێتانەیە بەرت باو بگەڕێیەوە سەر خەوە گوڵ گوڵینەکانی بەیانیان ؟ فیلە پرسیار هەموو بەیانی‌یەك پێیەکی قورس لەسەر سنـگـت دەکـوتـێ و بە ئاگـات دەهێنێ .. تۆیش هەر وەك ڕاوچی‌یەکی چەتوون خۆت لەپێش نێچیرێ‌وەڵام مەڵاس دەدەی .. عەودالّی و بەڵام کارمـامزی وەڵام لە تۆ چەتوون ترەو بۆت دەسگیر نابێ .. چل ڕۆژە بەیانیان چاوەکانت زیت و ئێوارانیش گێژو وڕ لە ڕوخسار و سیمای هەر دوو ڕووی شار دەڕوانن ..

شەوانەیش بە کەسیرەیی خۆت لە جێگاکەت دەکوتی و خەو بە بۆشایی نێوان هەر دو ئەستێرەی بەیانیان و ئێوارانەوە دەبینی .. ڕۆژی چەپکێ پرسیاری بێ وەڵام ، هەر وەك کۆمەڵێ لاشەی بێ سەر بەرچاوەکانت دەتەنن و بەبێ پەروا دەستەکانیان ئاماژە بۆ سەر سنگت دەکـەن و چاوەڕوانی هیمەـــەتی تۆن سەرو کەللەیان بۆ بسێنی‌یەوە .. هاکا باڵەخانە سەختەگێرو وێرەکانی (چـۆن) و (بـۆ) بەســەرتا ڕماو لەتەنها سەرخەوێکا زارەترەك بووی‌و بوویتە هاوەڵی «ئەحە دۆڕانی» (*) .. هەر بۆیە هەندێك

جار ترسێکی سەیر هەناوت دەکرۆژێ .. ترسی تلیسانەوەی شتە هەست پێکراوەکان .. ترسی ڕۆچوونێکی ناوەخت ، بێ ئەوەی ناسنامەی هیچ مەملەکەتێکت لەمشتا بێ .. بەڵام ئەو هەستەی لە ناخەوەو زۆر لەسەرخۆ ، تەمی ئەو ترسە ئەرەوێنێتەوە ، ئەو کەسە ساکارو سادانەیە کە خەریکە خۆشیان بوێیت و خۆشت بوێن هەر لە عوسە چاو زەقی شیر فرۆش و ڕەحەی پاقلەوە هەتا دەگـاتــە وەستــا زایەرو خولەی نانەوا .. هەر یەکەیان جۆرە خۆشــەویستی‌یەکی تایبەتی‌یان لای تۆ دروست کردووە ، کە هەرگیـز لە یاد ناچنــەوەو گومـانیشت لێیـان نی‌یە .. کۆمەڵە خەڵکێکی سەیرو دڵگیرن .. لەش و لاریان ساڵ دوانزەی مانگ هەر وەك پیرە زۆپاکەی مامە عەبە قرچەو گرمەی دێت .. کەچی زۆر سانایی لەنێو کونجی ئەو چایخانە ڕەش و نووتەکانەدا ، بەختــەوەریــان دەچــرن و زۆر بە گوشـادی‌یــەوە ئێواران بە پریـاسکەیەکی هەرزان بایی‌یەوە بۆ ماڵە بچکۆلەکانیان بەرەو

خوارو بەرەو ژوور دەبنــەوە .. هەر یەکـەیـان لە پیشەیەکدا کارامەیەو دەست ڕەنگینە .. سەیرە ! زۆریش سەیرە !! هەر ئەم (ســەیـرە)یـەیش لە گومـانـدا پەراســووەکانت ئەترازێنێ و ئەو تاسێنێ .. سەیرەو هەزار جاری تریش بە لاتەوە سەیرە .. هەرچی شتە جوان و عەنتیکەکانی ئێوارانە ئەمان دروستیان کردووەو کەچی ملکی خەڵکێکی ترە .. ئەمــە کۆشکی جوان و بەرز ، ئەوە شەقامی ڕازاوە ئەمەیش دەیان خواردنی بەتام و بۆن خۆش .. ئەوەشیان .. ئەمەشیان .. ئەوەتا زۆر ئاشکرا بە بەر چاوەکـانتـەوە جیهـانێـك دروستی ئەکات و جیهانێکیش ئەیخوات .. خەڵکێکی سادەو ساکار جیهانێکی پڕ لە باق و بریق و گوڵ گوڵیـان خوڵقاندووەو کەچی هیچیان هەست بە بوونی ئەوی تریان ناکەن .. ئۆمەتی ئێواران بەیانیانی لە یاد کردووەو بەیـانیانیش ئێواران هەر ناناسێت .. هەر یەکێکیان لە لووتی خۆیـان زیـاتر نابینن .. ئێستە وا هەست ئەکەیت تەنها یەك پرسیاری گومان لەنێوانی هەر دووکیاندا هەیە ، ئەویش تۆیت .. تۆیــەکی بێ دەنـگ و سەرســام .. تۆیــەك لە نێوانی هەر دووکیاندا لە خاچ دراوی و کەسیش ناتبینێ .. لەبەر لێشاوی هەزاران گومــان و دوو دڵیـدا دۆش دامــاویت .. گەلێك جار پێکـەنینێکی شێتانەو زۆر جاریش گریان و فیغانێکی کلۆڵانە حەپەساویت دەرەوێنێتەوە .. زۆر ماندوویت .. بێزاریت .. هەر ئەو بێــزاری‌یــەیش لەم ڕۆژانــەی دوایــدا یاخی بوونێکی جوامـێرانــەی لەنـاو گیـانتا دروست کردووە .. جوامێری‌یەك لەتەنها بڕیارێکدا دەست و قاچی فیلە پرسیار گرموڵە بکاو بۆ ئەبــەدی ڕاست نەبێتــەوە .. کەللەی لاشــە بێ وەڵامــەکـان بگێڕێتەوەو دەستی نژاو داوایان بەیەکجاری دابگرن و تۆیش ئاسوودە بیت .. جوامێری‌یەك لە پاش ژانی عەشقێکی سەخت ، بە هێمنی لە منالانی خەڵکی شەش پەنجایی‌دا لە دایك بوو .. ئێستە بڕوات هێنا (ئەڵێن)ە کە تەواو دەرچوو .. چلەی چایخانە پڕ دووکەڵەکەی مامە عەبە ، ناچاری کردی تا هەتایە دەست لە هاوڕێیەتی عوسە چاوزەق و ڕەحەی پاقلەو خزمەکانی تریان هەڵنەگری .

پەراوێز

«ئەحە دۆڕانی» یەکێکە لە شێتەکانی شاری سلێمانی .

ه



پێشکەشە بە منداڵانی کورد لەکوردستانی ئێراندا :

# برووسکەو هەورە گرمە !!


عالیە عبدالکریم


بەرەو کۆتایی هاتنی وەرزی زستان ئەڕۆیشتین و پێشدەستی پێشوازی وەرزی بەهارمان ئەکرد . ماوەی چەند هەفتەیەك بوو سەرماو سۆڵەیەکی وئێجگار توندو تیژو دژوار بوو . سەروەر تۆف و باران بوو لەگەڵ گڤەگڤی بایەکی ساردی دەس وپێل شێن کەرەوەی وادا ئەگەر لەبەر ناچاری دابین کردنی پێویستییەکانی ژیان نەبوایە مرۆڤ بە پاڵەپەستۆش لە ماڵ نەئەکرایە دەرەوە . بەڵام ئەوڕۆژە ، بەپێچەوانەی ڕۆژانی

رابـوردووەوە ، باوبـۆرانەکە نیشتبوەوەو سەرماکە پشتی پێ هەڵکـردبـوو . خۆرێکی گەرم بە ئاسمانێکی خاوێنی شینەوە ئەدرەوشایەوە ، زەویی ئەو ناوچەیەی دابوە بەر تینی تیشکی خۆی.

بۆیـەبـوو باوکـی ئاسـۆیش هاتـبـوە دەرەوەو ، لە بەرهەیوانەکەدا دانیشتبوو خۆی دابووە بەر تیشکی ڕۆژەکە کە ڕاستـەوخـۆ ئەیـدا بەنـاو هەیـوانەکەداو لە کونی پەنجەرەی هەیـوانــەکــەشــەوە خۆی ئەگــەیـانــدە پشت هەیـوان و ناوکـەلەگیـیـەکـەوە. بێگـومان پاش سەرماو سوڵەیەکی ئاوا دژوارو بایەکی وا ساردو توند ، هەموو کەسێ ئاواتی تیشکێکی وا گەرم و خۆرێکی وا بەتینی ئەخواست .

باوکی ئاسـۆ هەستی بەماندوویی‌یەکی زۆر ئەکرد کە لەئەنجامی ئەو باوبۆران و هەوا ساردەدا بوو کە لە ماوەی ئەو چەنـد هەفتـەیـەدا لەش و گیـانی کوتـابـوو . لەبـەرئـەوە ئەوەنـدەی‌تـریش تیشکی خۆرەکەی پێ خۆش بوو . هەستی ئەکرد تەسکینی‌یـەکی خۆشی ئەداتێو ئەرژێتە ناو گۆشت و ئێسقـان و مۆخیەوەو بەناو بۆرێو دەمارەکانی خوێنی لەشیا دێو دەچێ . خوا خوای ئەوەی بوو خۆرەکە بۆ ماوەیەکی دوورو درێـژ لەجێی خۆیـا ڕاوەستێو جووڵە نەکـاو لە دەست تیـژ تێپەڕبوونی ڕەورەوەی مێژوو هەڵبێ. بۆیە بەتەواوی پشتی لە زەوی بەرهەیوانەکە توند کردبوو هەردوو دەست و قاچی واڵا کردبوەوەو باوەشی لە دوورەوە کردبوو بە خۆرەکەدا وەك بی‌یەوێ بیگرێو نەهێڵێ لە دەستی دەرچێ . هەر بەوجۆرەیش خۆی هەڵ ئەگـێڕایـەوە بەودیـواو سنگی بە زەویـیـەکـەوە ئەنـووساندو ئەودیوی گیانیشی ئەخستە بەردەستی خۆرەکە ، تا بەتەواوی دەمـارەکـانی گیـانی خاوبـوونەوە . گەرمی تیشکی خۆرەکە بەشێوەیەکی‌وا کاری تێ‌کردبوو بەئاواتەوە بوو چەند سەعاتێ لەژێر باڵیا خەوی لێ بکەوێ ولێی‌بنوێو کەس ڕای‌نەپەڕێنێ . چاوەکـانی بەتەواوی کەوتبوونە پێشوازی‌یەکی گەرمی خەوو پێڵووەکـانی ئەوەنـدە سست بووبـوون بۆی هەڵنـەئەهاتن . بێ‌ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە بڵێ با خۆم داپۆشم یا شتێ بنێمە ژێـر سەرم خەوی لێ‌کەوت . خەوەکەی ئەوەندە لا خۆش بوو وای‌ئـەزانی لەسـەر نەرمترین و خاوێنترین جێگا نووستووەو هەرچی فریشتـەی خوای خێرو چاکـەیـە لە ئاسمـان هەموو ئاگاداریتی. بۆیە وا چووبووە شیرین خەو ئاگای لەهیچ شتێك نەمابوو . وەك خۆڵی گۆڕستانی بەسەرا کرابێ ، سەعات و نیوێ لە قووڵایی دنیای فەرامۆشی‌و بێ ئاگاییدا لێی‌کەوت .

بەڵام خەوەکـەی لەوە زیـاتـری نەخـایاندو لە دەنگی گڤەگڤی باو باران و تەرزەیەکی دەنگ گەورە ڕاپەڕی ، وەك بڵێی ئاسمان بی‌یەوێ تۆڵەی ئەو تۆزە پشوودانەی لێ بسێنێتەوە . کوتووپڕ هەموو جمگەکانی هاتنەوە ئازارو ناڵەناڵ ، بەجۆری سەری سوورمـا لە دڵی خۆیـا وتی ڕەنگ بێ سەرمام بووبێ چونکـە خۆم دانەپۆشیبوو. تۆزێ خۆی بەم دیوو بەودیوا داو چاوی هەڵگلۆفت و تەکانێکی دایە خۆی‌و هەڵسایە سەرپێ ، تەماشایەکی سەرەوەی خۆی کرد ، دیی کەوا هەورێکی ڕەشی چڵکن ئاسمانی ئەوناوەی داگیرکردووە ، ڕق و قینێکی ئێجگار تونـدی بە ناوچەوانەوە دیارەو جارجاریش برووسکەیەکی تیژ تێپـەڕو ڕوون لەگـەڵ تریشقـەیـەکی گەورەی سامناك ئەیدا بەزەویـدا و هەمـوو ئەونـاوەی ئەهێنایە لەرزین . پاش هێدی بوونەوەی ئاسمان و دامرکانەوەی زەوی ، بێ‌دەنگی‌و ماتەمینی ئەو ناوەی داپۆشی‌یەوە . بۆیە ئەویش هەر وا ماتەمینی دایگرت و، جڵەوی بیری لەدەسـت دەرچـوو بە هەمـوو لایـەکـدا بڵاوبوویەوە . ترسی ئەوەی لێ‌نیشت دیسانەوە لافاوێکی گەورە ڕوویـداتـەوەو ببێ بە عیـزرائیل بۆ گیانی دەیان بێ‌تاوان و سەرلێ‌شێواندن و ماڵ وێران کردنی چەند ئەوەندەی تریش . جا ئەگەر وابێ کێ بە دەنگیانەوە دێو ، پاشانیش کێ ناوێکیان دێنێو باسێکیان ئەکا؟ تەنانەت لەئێزگەو ڕۆژنامەکانیشدا وەك هەواڵی ڕووداوێ لە ڕووداوەکانی ئەم جیهانەو ، هەر بۆ تەنها ئاگاداری ، کەس شتێکیان لەباوەرە بڵاوناکاتەوەو پشت گوێ ئەخرێن ، وەك بڵێی لەم جیهانە پان و بەرینەدا نەژین . بۆیە

ئەوەنـدەی‌تـر پەژارە دایگرت و سەرێکی باداو هەناسەیەکی ساردو قووڵی هەڵکێشاو بەرەورووی پشت هەیوانەکە ڕۆیشت و

پەلاماری زۆپا عەلادینە کۆنەکەیانی داو شقارتەیەکی پێوەنا ، گڕێکی لێ بەرز بووەوە تۆزێ ڕەشی هەورە چڵکنەکەی لەبەرچاو ڕەواندەوە .

تەماشایەکی سەعاتەکەی دەستی کرد ، لە دڵی خۆیا وتی: خۆ ڕۆژ درەنگەو ئاسۆیش هێشتا نەگەڕاوەتەوە . مووچرکەیەك بە لەشیا هات و مووەکانی لەشی هەر تاڵێ لە جێی خۆی ڕاست بووەوە. سەرسام بوو کە ئاسۆ زۆر لە کاتی هاتنەوەی دواکەوتووە ، لەگەڵ خۆیا وتی ئەبێ چی بێ ؟ تووشی شتێك نەهاتبێ ؟ تا خۆراوایەکی درەنگ دانی بە خۆیا گرت . سەرە نجام بڕیاریدا کەوا بیرکردنەوە هیچ دادێ نادا و لەمە زیاتر چاوەڕوان بم درەنگتر ئەکاو ئەبێ بە شەو . کەواتە با تا تۆزێ ڕووناکی ماوە بڕۆم بەدوایا . سا خوایە بەخێری بگێڕێ.

دەستی درێژ کرد بۆ پاڵتۆکەی‌و قۆڵێکی پیاکردو ئەو قۆڵەکەی تری بەدەم ڕێوە تێ‌هەڵکێشا . هەر دوو هەنگاوی ئەکرد بە هەنگاوێ‌و لەگەڵ ئەوەشدا وای هەست ئەکرد پێکانی بۆ دواوە ئەگەڕێنەوەو ناتوانێ بەرەو پێشەوە بڕوا . بۆیە زیاتر تەکانی ئەدایە خۆی و هەنگاوی زلتری بەرەو پێشەوە ئەناو ڕووەو شەقامەکە ئەڕۆیشت و ئەیویست بەتەنیا هەنگاوێك لە شەقامەکە بکاتە ئەو بەرەوە ڕاستەوخۆ بەرەو قوتابخانەکە بڕوا کە ڕووبەڕووی بوو .

وردە وردە شەو دائەهات و دنیا تا ئەهات تاریکتر ئەبوو. تەلی کارەبای شەقام و کۆڵانەکانی ئەو ناوچەیە پچرابوو و گڵۆپەکان نەئەسووتان ،

بەڵام ئەم بێ ئەوەی گوێ بە تاریکی‌و ڕۆشنی‌و بە کەندو کۆسپی ڕێگا بداو سڵ بکاتەوە لێیان ، هەنگاوی گەورە گەورەی ئەناو بۆپێشەوە ئەڕۆیشت . تاونەتاوێ لاشانێکی توندی ئەدا بە دار کۆڵەکەکانی کارەبای ناوکۆڵان و سەرشەقامەکانا کە وەك یاساوڵ لەم بەرو ئەوبەری ڕێگاکەوە چەقیبوون ، یا پێی لە هەندێکی‌تریان هەڵەنگووت کە کەوتبوون و درێژ ڕاکشابوون و هاتوچۆ کەر لێیان ئەسڵەمی‌یەوە ئەوەك کارەبایان لەسەر بێ‌و بێ‌یانگرێ . بەڵام ئەم ئەمەندە بەپەرۆشەوە بەرەو قوتابخانەکە ئەچوو هەموو شتێکی دژواری لێ بووبوو بە فریشتەی ئاسمان و لەژێر پارێزگاری باڵی ئەوانا هەنگاوی هەڵئەهێنایەوە ، تا بەدەم بیرو ڕۆیشتنەوە هەر ئەوەندەی زانی خۆی لەناو عەشاماتێکی زۆرو بێ‌شوماردا دی‌یەوەو دی هەریەکە فانۆزێکی بەدەستەوەیەو بە چاوی پڕ لە فرمێسك و دەنگی نووساوو دەروونی پڕ لە خەمەوە بەناو قوتابخانەی ڕماودا ئەگەڕێن و هاوار هاواریانە :

ئای ڕۆڵە گیان ئاخۆ لەژێر چ بەردێکدا پان بووبیتەوە یان دەست و پێکانت قرتابن و لە ژێر ئەو بارە قورسەدا بناڵێنی‌و کەس پێت نەزانی تا ئەمری !

باوکی ئاسۆ کەوتە ناو ئەم هەموو عەشاماتەو چاوی بە قوتابخانەی ڕماو کەوت و لە مەسەلەکە گەیشت و بە هەردوو دەست دای بە سەری خۆیاو دەستی کرد بە گریان و ئەویش لەگەڵ خەڵکەکەدا کەوتە گەڕان بەدوای تەرمی هاوڕێیانی ئاسۆو ئاسۆی تاقانەیدا کە نۆبەرەی پاش تەمەنێکی زۆری بوو.. برینی هەڵاڵە و دایکی هەڵاڵەی کچیشی هاتەوە سۆ کە ماوەی ساڵێك ئەبوو ڕۆژێك لەگەڵ دایکیا ڕۆیشتبوون بۆ بازار جل و بەرگی تازەو ئاڵ و واڵا بکرن بۆ جەژنی نەورۆزو بەهارو لە گەڕانەوەیاندا بووبوون بە قوربانیی دەسڕێژی تاقمێکی هاری بەرەڵڵا بووە گیانی خەڵك . بەم وەبیرهاتنەوەی کۆستی هەڵاڵەو دایکی هەڵاڵەیشە ، ئەوەندەی‌تر شین و شەپۆری گەرم بوو و بەدەم گەڕانەوە بەناو پارچە بەردو خشت و ئاسن و کۆگا خۆڵدا بەدوای تەرمی ڕۆڵەکانیاندا تەرمی چەند قوتابی‌یەکیان بە لاقی قرتاوو قۆڵ و باڵی پەڕیوو مێشکی پژاوو دەم و چاوی قوپاوەوە لە بن گڵ و کۆنکرێت و کۆمەڵە بەردو خشت دەرهێنا. یەکێك لەو تەرمانە تەرمی ئاسۆ بوو باوکی بەهەڵەداوان گەیشتە سەری و دەمی نایە ناو دەمە پڕ لە خوێنەکەی‌و تێرتێر ماچی‌کردو نای بەسنگیەوەو لەبەرخۆیەوە ئەیوت :

ئۆف ڕۆڵە گیان! دوژمن جەرگ و دڵی ئێوەی مناڵیشی دەرهێنا.. وەك ، ڕۆڵە ، جەرگ و دڵی ئەویش وەك من بە مەرگی ئازیزی بسووتێ لە تۆڵەی ئەم هەموو گوڵاڵە جوانە مەرگانەدا ..





چیرۆك بۆ منداڵان

# وولاتی کەرویشکان

نوسینی : زکریا تامر

وەرگێرانی : نوری سعید قادر

سەعدی کورێکی بچکۆلانەی سەرو قژ ئاڵۆزکاوی چەتوون بوو ، زۆریش شەرانی بوو ، لە هاورێیەك زیاتری نەبوو ئەویش صیاحی ناو بوو .

سەعدی‌و صیاح لە کۆڵانی گەرەکێکی هەژار دا ئەژیان‌و ماڵەکانیشیان بەتەنیشت یەکەوە بوو .

ڕۆژێکیان لە کۆڵانەکەدا بەیەك گەیشتن ، صیاح بە سەعدی ووت :

– «ئەوە چیتە بۆ وا گرژو مۆنی ؟» .

سەعدی ووتی : «وازم لێ بێنە خەفەتبارم» .

صیاح ووتی : «منیش وەك تۆ خەفەتبارم» .

سەعدی ووتی : «تۆ بۆچی خەفەتباریت ؟» .

صیاح ووتی : «باوکم خۆشی ناوێم ، چەند مانگێکە هەر گفتم ئەداتێ پایسکیلێکم بۆ بکڕێت ، ئەمڕۆ بە سبەیم پێ ئەکات ، تا ئێستاش بۆی نەکڕیوم .. بۆچی ؟ ئەڵێ ئەو پارەیەی ئەیدەین بە پایسکیل پیدەین بەنانێك‌و سکمانی پێ تێر بکەین باشترە» .

سەعدی ووتی : «منیش دایکم لەسەر ئەوە لیّی داوم چونکە لە کوری دراوسێکە مانم دابوو» .

صیاح ووتی : «ژیانمان زۆر ناخۆش بووە» .

سەعدی ووتی : «فرمان سەپاندن وەکو باران بەسەرمانا ئەبارێت» .

«بنوو ، یاری مەکە ، کۆشش بکە ، دەم‌و چاوت بشۆ ، دانەکانت پاك بکەرەوە ، میوە نەخوێت تا نەیشۆیتەوە» .

صیاح ووتی : «تەنانەت پشیلەش نایەوێ ئەم ژیانەی ئێمە بژی» .

سەعدی بەتوورە بوونێکەوە ووتی : «ئەڕۆم ، ئیتر هەرگیز سەر ناکەمەوە بەم ماڵەدا» .

صیاح لیّی پرسی : بۆ کوێ ئەچیت ؟» .

سەعدی ووتی : «هەر ئەڕۆم ، ئەڕۆم تا ئەگەمە شارێکی‌تر» .

صیاح بەسووربونێکەوە ووتی : «منیش لەگەڵتا دێم ، تا کەس‌و کارمان هەڵس‌وکەوتی خۆیان لەگەڵمانا نەگۆڕن‌و پەشیمان نەبنەوە ناگەڕێینەوە» .

سەعدی ووتی : «ئێستا ئەڕۆینەوە ماڵەوە ، بەیانی هەر لێرەدا یەك ئەگرینەوە ، ئەوسا هەردووکمان بۆی دەرئەچین» .

هەریەکەیان ڕۆیشتنەوە ماڵی خۆی‌و خەویان لێ کەوت ، بۆ بەیانی بەیەك گەیشتنەوەو ئەوەی بڕیاریان لەسەردابو جێ‌بەجێیان کرد ، پێکەوە بەشەقامە کانا ئەڕۆیشتن‌و هەروەکو ماڵ‌ئاوایی بکەن بە دڵێکی خەمناك‌و جاروباریش بە خۆشی‌یەکەوە سەیری خەڵکەکەو ماڵەکان‌و دووکانەکانیان ئەکرد .

صیاح‌و سەعدی هەر ڕۆیشتن تا لە ئاوەدانی دوور کەوتنەوەو گەیشتنە

ڕێگەیان هەڵە کردووە ، وون بوون ـ ترسێکی زۆریان لێ نیشت ..
سەعدی هاواری کرد :
«چی بکەین ؟» .
صیاح هاواری کرد : «خۆزگە نەهاتینایە بۆ ئێرە» .
هەر دووکیان خەریك بوون بگرین .. بەڵام هەریەکە شەرمی ئەکرد کە هاوڕێکەی بەبێ دەسەڵاتو ترسنۆکی بزانێ ، لەبەر ئەوە هەر جۆر بوو خۆیان گرتو نەگریان .
صیاح ووتی : « بەهەر چۆنێك بێت ئەبێ لێرە هەر بڕۆین» . بە هەنگاوی نا بە دڵو ترسەوە دەستیان کردەوە بەڕۆیشتن ، کە باڵندەکان ئەیان خوێند وایان ئەزانی گاڵتەیان پێ ئەکەن . کە سەیری درەختەکانیشیان ئەکرد هەروەکو شیشی قەفەزێکی گەورە ئەهاتە پێش چاویان کە دەرگای تیادا نەبێت .
صیاح ووتی : «باوکم خۆشی ئەوێم ، بەڵام بۆیە پاسکیلەکەی بۆ نەکڕیم چونکە بێپارەو هەژارە» .
سەعدی ووتی : «دایکم چاکی کرد لێی دام ، چونکە بێ ئەوەی کوڕی دراوسێکەمان خراپەی بۆم هەبێت ئێم دابوو» .
صیاح ووتی : «کەس‌وکارمان ئەیان ویست ئاقڵو ڕێك وپێك بین» .
صیاحو سەعدی بە ناو دار ستانەکەدا بێ پشوودان ڕۆشتن ، تا بەرەبەرە درەختەکان هاتنەکزیو بە تەواوی نەمان ، گەیشتنە قەراخی دەشتێکی پانو بەرین ، ئەوسا بە سەر سوورماویەوە ڕاوەستانو لە پڕێکا سەعدی دەستی ڕاکێشاو بە صیاحی ووت :
«سەیرکە ، سەیرکە !» .
سەعدی ئاماژەی بۆ کەروێشکێکی زۆر کرد کە هەریەکە ڕمێکی کورتی بەدەستەوە بوو ، بە بێ ترس لێیان نزیك ئەبوونەوە :
صیاح ووتی : «ئای لەو دیمەنە سەیرە !» .
کەروێشکەکان دەوری صیاحو سەعدییان گرت .
سەعدی ووتی : «ئێستا ئێمە لە کوێین ؟» .
کەروێشکێ وەڵامی دایەوە : «ئێوە لەووڵاتی کە رویشکان دان» .
سەعدی بە حەبەساوی یەوە هاواری کرد ، ووتی : (ئای لەوە ، بۆچی کەروێشك قسە ئەکات ؟» .
کەروێشکە کە ووتی : «بە ناوی پادشای مەزنی کەروێشکانەوە ئەتان گرین ، ئێوە یاسای ووڵاتی ئێمەتان پێ شێل کردووە ، چونکە هیچ ئادەمیزادێك بۆی نی یە پێ بنێتە ووڵاتەکەمانەوە» .



کێڵگەکانی قەراخ شار . لە ژێر درەختەکانا ڕاوەستانو هەریەکە سێوێکیان لە درەختەکە کردەوەو لەسەر گیاکە دانیشتنو بەوپەڕی برسێتی‌یەوە سێوەکەیان خوارد .
دوای حەسانەوە ، دەستیان کردەوە بە ڕۆیشتن ، بەدەم ڕێوە باسی کەس‌وکارەکەیان ئەکردو وایان بیر ئەکردەوە کە پەژارەو غەمێکی زۆر دای گرتوون . بەڵام هەرکە دارستانە چڕەکەیان دی سەریان سوورما ، خۆ ئەوە دارستانێکی ڕاستەقینەیە ، هەروەك ئەو دارستانەی لە کتێبا دیویانە بە قیژەو هەراو هۆریاوە بەرەو دارستانەکە چوون بەوپەڕی.
خۆشی‌و تریقەو هووڕەوە بە نێو درەختەکانا ڕایان ئەکردو یاری‌یان ئەکرد . ئەوەندەیان ڕاکرد تا لە پەلوو پۆکەوتن بە هەناسە برکێوە خۆیان دا بەزەوی‌یەکەداو لێی پاڵکەوتن ، زۆر کامەران بوون . دیسانەوە هەڵسانەوەو ویستیان لە دارستانەکە بچنە دەرەوە ، سەیریان کرد

سەعدی هاواری کرد : «ئەمە خۆشترین نووکتەیە کە لە ژیانما گوێم لێی بووبێت » .

کەروێشکە ووتی : «هیچ پەلە قاژێ یەك نەکەن. خۆتان بدەن بەدەستەوە ، ئەگینا بێ بەزەیی بەرمەکانمان ئەتان کوژین ، دەی خێرا پێشمان کەون» .

صیاح بە گاڵتە ترسی لە خۆی هێناو پرسی :

«بۆ کوێمان ئەبەن ؟» .

کەروێشکە کە بە ویقارێکەوە ووتی : « ئەتانبەین بۆ لای پاشای مەزنمان ، چۆنکە ئەو هەر خۆی ئەزانێ چیتان لێ ئەکرێت» .

کەروێشکەکان بە رمە کورتەکانیانەوە صیاحو سەعدی‌یان دایە پێش‌و بەرێ کەوتن .

لە پڕ سەعدی پێکەنی‌و بە صیاحی ووت :

«وەرە با رابکەین» .

صیاح بە هەڵچوونێکەوە ووتی : «دیسانەوە باسی راکردنت کردەوە ؟ لەو هەموو نا هەمواری یەی بە سەرمانا هات هیچ پەندێکت دەرنەگرت ؟ ئەتەوێ ئەمجارەش دوو چاری دەردێکی ترمان بکەیت ؟» .

سەعدی ووتی : «چیتە بۆ ئەوەندە ئەترسیت ؟ من ئەتوانم بە یەك چەپۆك بە لایەنی کەمەوە دە کەروێشك بکوژم» .

سەعدی‌و صیاح لە رێگادا هەر مقۆمقۆیان بوو تا گەیشتنە کۆشکێکی گەورە کە ئاڵایەکی بە سەرەوە ئەشەکایەوە ، ئاڵاکەش وێنەی گێزەرێکی سووری لە سەر کرا بوو .

یەکێك لە کەروێشکەکان بە فیزو شکۆمەندی‌یەکەوە ووتی: «ئەمە کۆشکی پاشاکەمانەو ئەوەش ئاڵای ووڵاتەکەمانە کە خوێنێکی زۆری لە پێناودا رژاوە» .

سەعدی‌و صیاح بە حەپەساوی‌یەوە سەیری یەکتریان کرد ، چوونە کۆشکەکەوە بۆ لای پاشا ، پاشا ، کەروێشکێکی وورگن بوو ، چەند کەروێشکێکی وورگنی تریشی لە دەور بوو ، سەعدی بەچرپە ووتی : «ئەی لەوە ! ئا ئەمەیە پاشا ، خۆ هەر لە ئافرەتێکی سك پڕ ئەچێت» .

صیاح تێی خوری‌و پێی ووت : «ووس بە ، دەمت بگرە» .

یەکێك لەو کەروێشکانەی دەوری پاشایان دابوو ووتی : «لەبەر ئەوەی من وەزیری دەستە راستی شای کەروێشکانم ، تکام وایە لە پاشای مەزن کە ئەم دوو بێگانەیە سزایەکی قورس بدرێن ، چونکە سەر پێچی‌یان لە یاسای ووڵاتەکەمان کردووەو بێ پرس هاتوونەتە ووڵاتەکەمانەوە پاشا بە



صیاحو سەعدی ووت : «ڕاست بڵێنو درۆ مەکەن ، چۆنتان توانی بێنە وولاتەکەمانەوە ؟ کێش ناردوونی ؟» صیاح ووتی : «ئەوەی ڕاستی بێت کاتێك بە دارستانە کەدا ئەڕۆیشتین ڕێگەمان هەڵەکردو وون بووین ، بێ ئەوەی بزانین بۆ کوێ ئەچێین بە ناو دارستانەکەدا ملمان نا تا لە پڕێکا خۆمان لە وولاتەکەی ئێوەدا دیەوە» .

پاشا ووتی «لە وانەیە ڕێویەکانی دووژمنان بە سیخووری ئێوەیان ناردبێ.» .

سەعدی قیژاندی ووتی : «ڕێوی ؟ ئێمە ڕێویمان خۆش ناوێتو بگرە زۆریشمان ڕق لێ‌یانە» .

صیاح ووتی : «لە وولاتی ئێمەدا ڕێوی ڕاو ئەنرێتو ئەکوژرێ ، چونکە زیان بەخشو چەپەڵنو دوژمنی ئێمەی مرۆڤیشن» .

پاشا ، کە ئەمەی بیست دڵی زۆر خۆش بوو ، پرسیو ووتی : «بێ درۆ ئەوەی ئەیڵێیت وایە ؟» .

سەعدیو صیاح بە جارێك هاواریان کرد : «ئێمە ڕقمان لە درۆیە . ڕاست ئەکەین» .

پاشا ووتی : «کەواتە ئێوە هاوڕێی کەروێشکن ؟»

صیاح ووتی : «بێگومان ، بێگومان .. ئێمە کەروێشکمان زۆر خۆش ئەوێ» .

سەعدی بە دەنگێکی نزم ، ئەمەشی ووت :
«بە تایبەتی بە برژاوی» .

پاشا وەڵامی دایەوە : «دەرگای وولاتی ئێمە لە ئاستی دۆستو هاوڕێیانا کراوەیەو بەشی دووژمنانیش هەر بەندیو مردنە» .

صیاح ووتی : «ئێمە هاوڕێی ئێوەینو زۆریشمان خۆش ئەوێن» .

پاشا ووتی : «ئێستا ئەتوانن لە گەڵ دانای وولاتی کەروێشکانا بە ئارەزووی خۆتان بەناو وولاتەکەمانا بگەڕێن . دانای وولاتیش لە هەموو ڕوویەکەوە وەڵامی پرسیارەکانتان ئەداتەوە ، دوای گەڕانەکەشتان وەك دوو میوانی ئازیز دێنەوە لام بۆکۆشکی شاهانە» .

سەعدیو صیاح لە گەڵ دانای وولاتی کەروێشکانا چوونە دەرەوە ، سەعدی لە کەروێشکە داناکەی پرسی : «چۆن ئێوە قسە ئەکەنو کەچی کەروێشکەکانی لای ئێمە قسە ناکەن ؟» .

کەروێشکی دانا ووتی : « کەروێشك کە لە وولاتەکەی خۆی دەبڕێ قسەکردنی لە بیر ئەچێتەوە» .

صیاح لێ‌ی پرسی : «چۆن تا ئێستا مرۆڤ وولاتەکەی ئێوەیان نەدۆزیوەتەوە ؟ کەروێشکەکە ووتی : «وولاتی ئێمە بە دارستانی چڕ چوار دەوری گیراوە ، ئەوەی بیەوێت پێ‌ی تێ‌بخات تیایدا وون ئەبێ ، نا چار ئەوەندە ئەگەڕێ تا لە تاو ماندوێتی بە لادادیو ئەمرێت . نازانم ئێوە چۆن وا بە ڕێکەوت ڕزگارتان بووە ؟» .

صیاحو سەعدیو دانای کەروێشکان بە ناو کێڵگە پانو بەرینەکانا گەڕان ، کەروێشکێکی زۆریان بینی کاریان ئەکرد ، صیاح پەنجەی بۆلای کەروێشکەکان درێژکردو ووتی : «ئەو کەروێشکانە خەریکی چین ؟» .

دانای کەروێشکان ووتی : «ئەوانە خەریکی گێزەر چاندنن» .

سەعدی ووتی : «ئای چەندە لە ڕو لاوازن !» .

کەروێشکی دانا ووتی : «لە وولاتی ئێمەدا کۆمەڵی کەروێشکان دوو جۆرن ، جۆرێکیان دەوڵەمەندنو پێویستیان بە کارکردن نی‌یە لە سەر ئەرکو ئازاری ئەوانی تر ئەژین کە هەر خەریکی کار کردننو بەرهەمی کارەکەشیان بۆ خۆیان نیە . بۆ دەستەی یەکەمە کە دەوڵەمەندەکانن» .

سەعدی ووتی : «ئەمە کارێکی نا ڕەوایە» .

دانای کەروێشکان بە گڕی‌یەکەوە ووتی : «جارێکی تر قسەی وانەکەیت ، گەر پاشامان بەمە بزانێ فرمانی بەند کردنت ئەدات» .

صیاح ووتی : «بۆ چی لە وولاتی ئێوەدا بەندیخانە هەیە؟» کەروێشکەکە ووتی: یەکی ئێجگار زۆر» .

سەعدی ووتی : «ئەوانەی تیا بەند ئەکرێن کێن ؟» .

کەروێشکەکە ووتی : «هەرچی سەر پێچی لە فرمانەکانی پاشامان بکات .

ئەوانەشی تیا بەند ئەکرێن کە بەرهەمەکانیان نادەن بە کەروێشکە دەوڵەمەندەکان» .

هەر کە صیاحو سەعدی ئەمەیان بیست گەلێك پەستو خەمبار بوون ، بەدانای کەروێشکانیان ووت : با بگەڕێینەوە ، تا لەوە زیاتر چاومان بەشتی ناخۆشتر نە کەتووە» .

هەر سێکیان گەڕانەوە بۆکۆشکی شاهانە . هەر کە پاشا چاوی پێ‌یان کەوت لە دوورەوە هاواری کرد : «ئێستا پێتان ئەسەلمێنم کە من لە پاشاکەی ئێوە دڵ فراوانترو بە خشندە ترم . بڕیارم داوە سینیو خوانێکی ڕازاوەتان پێشکەش بکەم» .

پاشا فرمانیدا خواردنەکە بێنن ، لە بەر ئەوەی صیاحو سەعدی زۆریان برسی‌بوو ، هەرچی پەژارەو توورەیی‌یەکیان هەبوو ، هەموویان لە بیر چووەوەو زۆریش دڵ خۆش بوون . بە خێرایی خواردنەکەیان هێنا کە گێزەری گەورە گەورە بوو .

صیاحو سەعدی هەر کە چاویان بەو گێزەرە گەورانە کەوت ، دایانە



قاقای پێکەنین . پاشان هەریەکەیان دەستی دایە گێزەرێکو کەوتە قەپڵ لێگرتنی .

سەعدی بە صیاحی ووت : «ئەگەر ماوەیەك لێرە بمێنینەوە ئێمەش ئەبین بە کەروێشك» .

صیاح ووتی : «بخۆو تووشی بەزمێکمان مەکە» .

دوای نان خواردن ، صیاح بە پاشای کەروێشکانی ووت : «رێگەمان ئەدەیت بەیانی بگەڕێینەوە بۆ وووڵاتەکەی خۆمان ؟» پاشا بە گاڵتە پێ هاتنێکەوە پێکەنی ، ووتی : «ئەوەی بێتە وووڵاتی ئێمە هەرگیز جارێکی تر بۆی نی‌یە لێی بچێتە دەرەوە» صیاح بە نارەزایی‌یەکەوە ووتی : «ئای لەوە . ئەم قسانە چی‌یە ؟» پاشا ووتی : «ئەگەر ماوەتان بدەین بڕۆنەوە بۆ وووڵاتی خۆتان کێ ئەڵێ سبەینێ خەڵکێکی زۆرمان ناهێننە سەرو قەلاچۆمان تێ‌ناخەن ؟» .

صیاحو سەعدی هەرچەندە بە ڵێنیان دایە کەشتی وا هەرگیز روونادات‌و نهێنی وووڵاتەکەیان لای هیچ کەسێك نادرکێنن ، سوودی نەبوو ، پاشای کەروێشکان هەر لە سەر قسەی خۆی‌بوو پاشان فرمانی پێ‌کردن کە بچن بنوون ، فرمانەکەیان جێ‌بەجێ کرد ، بەڵام هەر کە دەرگای ئەو ژوورەیان داخست کە بۆیان تەرخان کرابوو ، سەعدی بە صیاحی ووت :

«ئەمە باش بوو ؟ هەر پێت ئەڵێم لێم گەڕێ با پەلاماریان بدەم ئەڵێیت جارێ وازبێنەو دان بە خۆتا بگرە» .

صیاح ووتی : «ئێستا کاتی خەوتنە . سبەی جارێکی تر لە گەڵیدا خەریك ئەبینەوە . رازی بوو بشە . رازی نەبوو چیت پێ خۆش بوو بیکە» .

صیاحو سەعدی خەویان لێ‌کەوت . بەڵام ئەوەندەی پێ‌نەچوو لە هاتو هاوار خەبەریان بۆوە . بە زوویی چوونە دەرەوە . کەروێشکێکیان پێ‌گەیشت کە بە پرتاو رای ئەکردو زارەترەك بوو بوو . هۆی ئەو هاتو هاوارەیان لێ‌پرسی . پێ‌ی ووتن : «رێوی پەلاماری وووڵاتەکەیان داوون صیاحو سەعدی گەڕانەوە بۆ ژوورەکەی خۆیانو لە پەنجەرەکەوە سەیریان کرد وارێوی‌یەکان ئەو کەروێشکە لاوازو بێ دەسەڵاتانەیان شپرزە کردووە کە بەرەنگاریان ئەکردن . چونکە ئەوەندە بێ‌هێز بوون بەرگەی شەڕ کردنیان نە ئەگرت . کەروێشکە وورگ زلەکانیش لەبەر قەڵەوی‌و وورگنی نەك هەر شەڕیان بۆ نەئەکرا ، بگرە ترسنۆکیش بوون . صیاح ووتی : «با ئەم هەلە لە دەست نەدەین‌و بۆی دەرچین» . سەعدی ووتی : « دەی با هەڵبێین» .

صیاحو سەعدی بۆ ئەوەی لە وووڵاتی کەروێشکان رزگاریان بێ ، وەکو شێت رایان ئەکرد ، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ماندووبوون هەر رایان ئەکرد .

لە پڕ خۆیان لە کێڵگەکانی دەوروبەری شارەکەیاندا دی‌یەوە . لە خۆشیا هاواریان کردو بێ ئەوەی پشوویەك بدەن بەرەو کۆڵانەکەی خۆیان کە ماڵ‌و کەس‌و کارو هاوڕێکانیانی لێ‌بوون هەر رایان ئەکرد ..

**ئەم چیرۆکەم لە کتێبی «بلاد الأرانب» ی زکریا تا مرەوە گۆڕیوە .**

●




● سابیر رەشید ●

# سەرەتایەك دەربارەی چامەی درامایی كوردی

ئەگەر داستان و ئەفسانەو شانۆ كە هەر یەكێكیان بە گوێرەی تایبەتمەندی خۆیان ببن بە رەگەزێك و بەردی بناغەی هەر بەرهەمێكی درامایی بنیات بنێن ئەوا دەتوانین بڵێین ئێمە خاوەن كەلەپوورێكی ئێجگار دەوڵەمەندین لە داستان و ئەفسانەو لاوك و حەیران و هەقایەت ، بەهۆی بوونی رەگەزەكانی دراما تیایاندا كە دووبەرەكی و تراژیدیاو رووداوو كێشە كۆمەڵایەتیەكان و بەدیارخستنی لایەنی خێرو شەر تیایاندا بە كرداری دراماكەوە دەبەستێتەوەو بە هۆیەوە دەست نیشان دەكرێن ، بەڵام داخەكەم تا ئێستا ئەم سامانە لەبن نەهاتووەی فۆلكلۆری كوردیمان لەچەند هەوڵێكی دلسۆزانەی چەند شاعیرو نووسەرانمان بەم لاوە بە كارنەهێنراوە .. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا مانای وا نیە بنچینەكانی دراما لە شیعری كوردیدا رەنگی نەداوەتەوەو بەكار نەهاتووە ، نەخێر بەڵكو بە هۆی ئەم سروشت و تایبەتیەی كە كورد هەیەتی شاعیرانمان هەر لە كۆنەوە كێشەی ژیان و كارەساتی جەرگ برو رووداوی پاڵەوانیەتیو داستانی شەرو شۆرو دووبەرەكی چینایەتیو سەربردەی رامیاریو كۆمەڵایەتیو مێژوویی لەبەرهەمە كانیاندا بەشێوەیەكی تراژیدیانە قاڵ بووەو رەنگی داوەتەوە ، هەر لە بابەتاهیری هەمە دانیەوە تاكو شاعیرانی ئێستامان[١] ... دەتوانم بڵێم لە چامەی درێژدا ئەدەبی كوردی ئەسپی خۆی تاوداوەو درێخی نەكردووە ، بۆ نموونە دەتوانین قووڵ بوونەوەیەكی دراماییو كارەساتی تراژیدیانەی (مەم و زین)[٢] .. لە داستانە شیعریەكەی (ئەحمەدی خانی)دا زۆر بە زیرەكی و دارشتنێكی جوانەوە ببینین لە بەیەكدا چوونی كێشە كۆمەڵایەتیەكان و بە گژیەكدا چوونی هێزی خێرو شەرو هەڵوێست و فەلسەفەی خانی لەرووی خۆشەویستیو ژیان و مرۆڤ و كۆمەڵەكەی .. دووایش لە دوو چامەكەی نالیو سالم و دوو چامەكەی كەمالیو ناتیق و (گلكۆی تازەی لەیل)[٣]ی حەمە ئاغای دەربەندفەقەرەو داستانی (شیرین و خوسرەو)[٤]ی خانای قوبادی و (سەفەر بەرلك)ی مەلا حەمدون و (شەكوای حاڵ)ی عارف سائیب و (شەكوای حاڵ)ی ناتیق و گەلێك چامەی تری شاعیرانمان ، هەر چەندە ئەم سێیانەی دووایی باسی كارەساتی جەرگ برانەی جەنگی جیهانی یەكەم دەكەن (١٩١٤ ـ ١٩١٨) وەكو كارەساتێكی گشتیو كاریان بەسەر ئاوارەییو دەربەدەریو تێكچڕانی شیرازەی كۆمەڵ و ئازارەكانی مرۆڤ بە دەست ئەم جەنگە پر ئاژاوەی جیهان ، جا ئەم كارەساتە جەرگ برە لە شیعری كوردیش دا لای گەلێك شاعیرانی تر رەنگی داوەتەوەو شاعیرانی كورد زۆر زیرەكانە توانیویانە لە چامە نایابەكانیان دا دەست نیشانی بكەن هەر وەكوو چۆن جەنگی كوردی بابان و عوسمانلی لە شیعری سالم و دیسان گێرمەوە كێشەی جەنگ و كۆتایی هاتنە پر كارەساتە وەیشومەكەی لە چەند چامەیەكی بەرزی وەك (هاواری دایكی)ی مستەفا شەوقی و چامەكەی فایەقی تاپۆو (هیوای پاشەرۆژ)ی ئەحمەد ، موختار جاف بەر چاو دەكەون[٥] ... بگرە دوای ئەمانیش ئەم كارەساتەی كە هەر دوو گێتی بە خۆیەوە بینی كاریان كردە سەر زۆربەی شاعیرانی دونیاو شاعیرانی كوردیش لە هەوێنی ئەم كێشەو كارەساتە مێژوویيو كارتێكردنی هەموو لایەنەكانی ژیان بێ بەش نەبوون .. هەر وەكو دەبینین شاعیرانی كورد زۆر هەست ناسكانە گەلێك رووداوی ژیان كاریان تێكردوون و ئەم هەژان و دووبەرەكی و كارەساتە جەرگ برانەی ناو فۆلكلۆری كوردیشمان زیاتر كاریان لە هەست و دەربڕینیان كردووە «بەڵكو ناوەرۆكی فۆلكلۆری كوردی كارتێكردنێكی زۆری هەبوو لەسەر نووسەرە ریالیزمیەكان ، تا ناوەرۆكی داستانی كوردیان لە قالبی نوێ دارشت و لەگەڵ گیانی رۆژگارو بیرو باوەرەكەیان گونجاند»[٦] ..

ئەمانە هەمووی رێگا خۆشكەرێك بوون بۆ سەرەتاتكێ كردن و سەرەتاكانی چامەی كوردی كە زۆربەیان بنەمایەكی درامایی لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن ، بەڵام ئایا ئەم چامانە دەتوانرێ بخرێنە نێو چوارچێوەی چامەی درامایی كوردی ؟ بێ گومان

دەبێ بڵێین نەخێر چونکە رەنگبێ گەلێك لە بنەماکانی درامابیان تیـادا کۆببێتـەوە وەك بەکـارهێنانی داستانە شیعرو چیرۆکە شیعرو ئەفسانەو دەمەتەقێو تراژیدیاو رووداو و کرداروگرێ و .. تاد ، بەڵام هەریەکێك لەم چامانە نەیتوانیوە یاخود بڵێین مەبـەست نەبووە یان چامەی درامایی ئەوسا بەم تێگەیشتنە فراوانەی کە ئێستا هەیەتی وا باو نەبووە ، هەرچەندە دراماو ئەو پەیوەندیە نزیکەی کە هەیەتی لەگەڵ شیعردا هەر لەسەردەمی یۆنـانیـەکانەوە هاتۆتە کایەوە ، بەڵام ئەوەی زیاتر لە ئەدەبی کوردیدا باو بێت چیرۆکی شیعـری بووە وەك دکتـۆر مارف خەزنەدار لەبارەی چیرۆك و رۆمانی شیعری دەڵێت «یەکێ لە ئەدگـارەکـانی ئەدەبی نەتەوە موسلمانەکان ئەوانەی بەزمانی هینـدو ـ ئەورووپـایی وتـورکی ـ مەنگۆلی دەدوێن ئەوەیە کە چیرۆکی شیعری لەناویان دا باوە ، ئەم هونەرە شیعرییە هەر وەکـو لە ئەدەبی کلاسیکیی نووسراو دا هەیە ، لە داهێنانی میللی ، نووسراویش داباوە .... بەزۆری کێشی چیرۆکی شیعری یەك کێش دەبێ ، واتە یەکێتیی کێشی تێدایەو بە عەرووزی عەرەبی دەکێشرێ لەسەر بەحری هەزەج دەبێ ، بەڵام قافیەی جووتـە ، واتـە (مەسنەوی)یە ، کە هەر دوو نیوە دێرە شیعر لەسەر یەك قافیە دەبێ .

ناوەرۆکی رۆمانی شیعری بریتییە لە رووداوێکی مێژوویی یا چیرۆکییا بەسەرهات ، یا ئەو رووداوانەی لە ئەفسانەی میللی وەرگیراوون»[٧] .. دەبێ شاعیرانی کوردیش ئاگاداری ئەدەبیاتی یۆنـان و گەلانی دراوسێیان بووبن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چامەو داستانە کوردیانە هەندێکیان نەبێ زۆربەیان بە چامەی لیریکی هاتوونەتە کایەوە چونکە بەچەند ئەرکێکی کۆمەڵایەتیو رامیـاری و ئابـووریو مێـژوویی و ... تاد .. جیـا جیـا نوسراونەتەوە ، کە تایبەتمەندی کورد وای لێ کردووە ئەم ئەکارنە بە خۆیەوە ببینێ ، بێ ئەوەی رەچاوی ئەمە بکرێ رووداوێکی درامی تەواو کە سەرنجێـك لای خوێنەر جێ بهێڵێ و شان بە شانی ئەوەش کە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی‌و فەلسەفی بگەیەنێت ، ئەوەك خستنە رووی رووداوێکی ساکاری رووت فێرکـردنی خەڵکی و دەربـڕینی هەست و سۆزێکی شاعیرانە بەرامبـەر ئافـرەت بە دەربـڕینێکی لیریکیانە کەچی شیعری درامی ئەمرۆ «بەوە لە شیعری تر جیا دەکرێتەوە کە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی دەبینێ بە جۆرێکی تایبەت بەخۆیەوە ، شیعری درامی بەوە جیا دەکرێتەوە کە گرنگیەتی بە جێهێشتنی سەرنجدانێکی کۆمەکی و راستەوخۆ لەسەر کۆمەڵانێکی زۆری خەڵك کە کۆبـوونـەتـەوە بۆ ئەوەی چاوەروانی گێرانـەوەی رووداوێك بکەن کە لەسەر تەختەی شانۆ لاسایی دەکرێتەوە .. شیعری درامی لەگەڵ جۆرەکانی تری شیعر جیا دەکرێتەوە کە ئەرکی شیعری درامی دەبەسترێتەوە بە ئەرکی دراما بەگشتی ، بەڵام ئەرکی شیعری فێرکردن کە دەیەوێ زانیاری بگەیەنێ بەندە بە ئەرکی ئەو بابەتەی دەری دەبرێ کە ئەرکی شیعری فێرکردن دەگەرێتەوە بۆ فەلسەفەو رامیاری و سروشت ..»[٨] ..

جا لێرەدا دەتوانین بڵێین چامەی کوردیمان زۆربەیان لە پێناوی ئەرکێکی کۆمـەڵایـەتی یا رامیـاری یا فەلسـەفی یا ئایینی یا ئابـووری ... تاد نووسراونـەتـەوە هەرچـەنـدە وەك ووتمـان بنـەمـایـەکی درامـایی بەخۆیانەوە هەڵدەگرن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك بابەتێکی تەواو چەکەرەی نەکردووە .. جا «لەگەڵ کزی درامـا لە شیعـری کۆن دا درامای زۆر بەهێز لە شێوە نوێکـانی شیعری کوردیدا دەبینرێ ...»[٩] .. پەیدا بوونی چەند شاعیرێکی بلیمەت کە کۆت و پێوندی شیعری کلاسیکیان شکـانـدو ئەدەبـی کوردیـان نوێ کردەوەو سوودیـان لە تاقیکـردنـەوەی گەلانی تر وەرگـرت و گەلێـك جۆرە هونەری شیعـریـان بۆ ئەدەبی کوردی تۆمـارکـرد کەبـوو بە چرای پرشنگـدارو ئەدەبەکەمانیان دەوڵەمەند کرد هەروەك (رەشید نەجیب)و (شێـخ نوری شێخ سالح) و (گۆران) .. بەڵام «لە مەیدانی درامادا عەبدوڵا گۆران بوو بەردی بناغە کە ئەدەبی کوردی پێ دەوڵەمـەنـد بوو وەك پێشرەوێـکـی تەنـیـا کە پێنووسەکەی بۆ یەکەمجار چەند تاقی کردنەوەیەکی تۆمار کرد لە شانۆگەری ساکارییەك پەردەیی یا دوو پەردەیی و کۆمەڵێك لە شانـۆگـەرییو دەمـەتەقێی شیعری سەرکەوتووی داهێنا .....»[١٠] .. هەروەك چۆن یەکـەم پێشرەوە لە داهێنـانی شێوەو بابەتی نوێ لە شیعری کوردی نوێدا هەروەها لە بەکارهێنانی مەبـەستی دەمـەتـەقێی شیعـریدا .. گۆرانی مەزن چەند پیەسێکی یەك پەردەیی نووسیوە وەك [دوشمنمان مێشوولە ـ شیـوەنی دارستان ـ ماستاو ـ وڵاتی ئاوا ـ جوقی یۆنسکۆ ـ موحـاکـەمەی مام چەوەندەر ـ نق وجق ـ خۆزگەی هەژار] .. هەروەهـا دوو ئۆپـەرێتی شیعریشی نووسیوە وەك [ئەنجامی یاران ـ ئەنجامی ئەژدەهاك] کە دەتوانین بەدەست پێشخەری

دابنێـین لەنێـوان بابـەتی چامـە دراماییەکانیدا .. «چامەی ئەنجامی یاران کە لە ساڵی ١٩٥١ نووسیویە لە ڕیزی پێشەوەی بابـەتی چامـە دراماییەکانی دادەنرێ ، ئەم چامەیە جگە لە دەوڵەمـەنـدی شێـوەو ناوەڕۆك و بیرۆکەی ، لە ڕووی ئاستی جوانی دا نمـوونـەیـەکی زیندووی تواناو بلیمەتی و زیرەکی بێپـایانە بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی شیعری هاوچەرخی کوردی ..»[١١] ..

دووای مامۆستا (گۆران)یش چامەی درامایی کوردی زیاتر گەشەی کردو گۆڕانی بە خۆیەوە بینی شان بەشانی ئەدەبی جیهانی ، گەلێك لە شاعیرانی هاوچەرخی کورد زیاتر بایەخیان بەم لایەنە داو گەلێك شانۆگەری شیعیرو شیعری شانۆگەریو داستانە شیعرو بالادە شیعرو چامەی دراماییو بەکارهێنانی ئەفسانەو گەلێك تەکنیکی نوێ لە چامەی هاوچەرخی کوردیدا ماوەی ئەوەمـان دەدات بڵێـین شیعـری هاوچـەرخی کوردی توانیـویـە شان بەشانی گەلانی دونیا هەنگاو بنێو سوود لە تاقیکـردنـەوەی جیهانی وەربگرێ ، هەروەك چۆن ئەدەبیاتی جیهانی نوێ کاری کردۆتە سەر گەلێك لەئەدەبیاتی گەلانی تر، دەبینین نموونەی داستانە شیعریەکان و بالادە شیعرو چامەی دراماییی و شانۆگەریە شیعریەکان و گەلێك بەرهەمی بە پێزی تر وەك (ئێلیوت ، پۆ ، رامبۆ ،پاوەند ، سان جۆن پێرس ، ئەپۆلێنێر ، بۆدلێر ، مایاکۆفسکی ، لۆرکا ، نازم حیکمەت.... تاد) کاریان کردۆتـــە سەر تەواوی ئەدەبـیــاتی جیهــان ، هەر لە بارەی کارتێکـردنی لە ئەدەبی عەرەبیش دا (فـاضـل ثامر) دەڵێ :ـ «چامەی درێژ لە ئەدەبی عەرەبیماندا نموونەی چامەی درێژی ئەدەبی جیهــانی نوێ کارێکی گەورەی بەســەرەوە هەیـە لە پێکهێنـانیـدا ، شاعـیری هاوچەرخ هەستی بەوە کردووە کە تاقیکردنەوەی تایبەتی خۆیو ئاڵۆزبوونی خەمەکانی و کێشە جۆر بە جۆرەکـانی مرۆڤ گەورەتر بوو لەوەی چامەی کورت بیگـرێتـە خۆی ، لەبەر ئەوە لە کلاو ڕۆژنەی چامەی نوێدا ڕێگایەك دۆزرایەوە کە بەهۆیەوە تەعبیر لە جیهانە ئاڵۆزەکەی بکاتەوە ...»[١٢] ...

شیعری کوردیش لە کلاو ڕۆژنەی ئەدەبی عەرەبیو تا رادەیەك لە پەنجەرەی ئەدەبی ئینگلیزی و گەلانی دراوسێ دا توانیویە سوود لە شاکـارەکـانـی ئەدەبیـاتی گەلانی دونیـا ببینێو تاقیکـردنـەوەکانی خۆی پێ برە خسێنێ .. «لێرەدا ئەمەوێ ئەوەش هەڵنە بوێرم و بڵێم کە شان بەشانی پاراستنی تەجرەبە شیعـریـەکـانی خۆمان و لە هەمێز نانی لایەنە هەرە گەش و پاکەکەی کە لە پووری نەتەوایەتیمان و ووردبوونەوەوتێرامانی دڵازانـەو لە باری تەجرەبە شیعریەکانی گەلانی جیهان و بە تایبـەتی تەجرەبە تێرو تەسەڵ و سەرکەوتووەکانی ئەوروپای شارستانیەت ، تا دێ ووشەی کوردی جوان پاراوترو ژانگرتوو ترو لێپرسراوتر ئەکات و لە زاخی ئەدات و لە کەرەواڵەییو بێ دەرەقـانیو تامـەزرۆیی دەربـازی ئەکات و ئەیخاتە شوێنی شایانی شارستانیەتی سەردەم ..»[١٣] ... هەر لەم پێوەندانگەوە دەبێ ئەوەش بزانین کە «چامەی نوێ هەروەك چۆن زۆربەی ڕەخنەگرەکان لەو باوەڕەدان کە یەکبوونێکی تەواوە بەو جۆرەی کە یەکبـوونـەکە لە نێوان شێوەو ناوەڕۆك دایە ...»[١٤] .. وەك دەبینین چامەی درێژیش چەند شێوەیەك بە خۆیەوە دەبینێ کە لەهەر شێوەیەك دا سیماو مەبەستی خۆی بە جۆرێکی تر بە دەستـەوە دەدا یاخـود بۆ مەبـەستێکی تر شاعـیر بەکاریان دەهێنێ کە لەگـەڵ بەرژەوەندی ناوەرۆکی چامەکەی بگونجێ «لەوانـەش چامـەی تابلۆیی یاخـود هەندێك جار پێی دەڵێن چامـەی هێشـوویی (العنقـودیـة) کە شاعـیر تیایدا ناتوانێ تاقیکردنەوەی خۆی بە جارێك دەرببڕێو لەسەر یەك پشووی شیعریو لە سەریەك هێل بەڵکو بە هۆی چەند تابلۆیەك هەندێك جار هەوڵ دەدا بۆ دانـانـی ناونیشـانی نا سەرەکی بۆ ئەم تابلۆیـانـە ، لە هەنـدێ حالەتی تردا تەنیـا بە دانانی ژمارە دەیبڕێنێتەوە ، هەروەها چامەی درێژ هەندێك جار شێوەیەکی پتـەو بەخـۆیەوە دەبینێ بەبێ هیچ تابلۆیەك یاخود برینی نا ئاسـایی . لە هەمـوو حالەتێکیش دا درێـژی بە پێـوانەیەك دانانرێ بۆ ئەو لێك جیا کردنەوەیە ، تا وەکو بنیات نانی چامەی بیناکاری خۆشیو سروشتی تاقیکردنەوەی شیعرەکەش ..»[١٥] ..

ئا بەم جۆرە شێوەی نوێو دەوڵەمەند بۆ چامەی درێژ لە دایك بوو لە ئەدەبـی نوێدا کە ئەدەبـی کوردیش توانی لەســەر دەستی چەند شاعیرێکی بلیمەت و بە توانا ئەم جۆرە شیعرانە بێنێتـە کایـەوە کە بە قۆنـاغێکی گواستنـەوە دادەنـرێ لە پەرەســەندنی لیریکی چامەی کوردی بەرەو تێهەڵکێش کردنی دراماو قاڵ بوون تیایدا .. هەروەك ئێلیوت لە بارەی درامایی شیعرەوە ووتوویە :ـ «شیعر هەر دەبێ هۆی بوونی خۆی بە درامایی نیشان بدا ، ناشبێ تەنها شیعرێکی چاك بێت و بە

شێوەی دراما دارێژرابێ ، ئەوەش مانای وایە درێژایی کاتی شیعـر نابێتە شیعر تەنها کاتێ هەڵوێستە درامایيەکە دەگاتە چڵەپـۆپە کەوای لێدەکا دەربڕین بە شیعر کارێکی سروشتی بێت ، شیعر تاکە زمانێکە بە هەموو شێوەیەك کە دەتوانێ تەعبیر لە هەڵچوون بکاتەوە ...»[١٦] .. جا لەبەر ئەوەی چامەی درامایی بابـەتێکی گرنگی نوێبـوونـەوەی شیعرەو دەربڕینێکی پڕ بە پێستی سۆزو نیشان دانی ئازارەکانی مرۆڤەو شاعیریش وەك هەمــوو مرۆڤـێـکی تر دەرك بە هەڵچــوون و ئێش و ئازارو کارەساتەکانی کەون دەکا و دەبێ زۆر هوشیار ترو کارامەتر بڕوانێتە دیاردەکان و لە قالبێکی گونجاوی سەردەم هەلیبوێرێ چونکـە «یـەکێـك لە دیـاردە هەرە ئاشکـراکـانی نوێخوازی پێداگرتنە لەسەر بەلاداچوونی هۆش بۆ ئەم جۆرە ڕاهێنانە ، ئێستا شیعر بۆتە کێشەیەکی قووڵ لە نێوان وشەو ماناکەی ، هەروەها بۆتە کۆشش و ئازاردانێك بۆ هێزەکانی هۆش لە پێناوی گەیشتن بە قۆناغی هەست پێکردن پێناسەکانی کۆن و لاسایی کردوو بۆ مانای شیعر بەلادا دەنرێ ، ئێستا شیعر وەك جاران ـ کەف و کولێکی هەڵچووی هەستێکی ڕووت ـ نیە ، یاخود ـ جوانتـرین وشە لە جوانترین دارشتن دا بەڵکو تایبەتی‌یەکی جووڵانەوەی هۆشمەندی پێدەبەخشێ[١٧] کەواتە دەبێ ڕێگای ئەوە بدەین گەلێـك تاقیکـردنەوە سەرکەوتووەکانی جیهان کە خزمەتی مرۆڤ و ئێش و ئازەرەکانی دەکاو کێشەکانی جۆر بە جۆری دەگـرێتە خۆی و ئەدەبەکەمان ڕۆشن بکاتەوەو بەرەو پێشـەوەی ببا شان بە شانی گەلانی تر ، چامەی دراماییش یەکێکە لەو تاقیکردنەوە سەرکەوتوانەی کە لە هەموو ئەدەبیاتی دونیا بایەخی پێ دەدرێ و لێکۆڵینەوەی جۆراو جۆری لەسەر دەنـوسرێ .. ئێمـەش دەتوانین بڵێین ئەم بابەتە دەمێکە لای شاعـیرانی کورد چەکـەرەی کردووەو بایـەخێ پێدراوەو زۆر شاکاری بە نرخی پێ نووسراوە ، بایەخ پێدانیشی زیاتر دەرگای داهێنان و دەولەمەند بوونی ئەدەبی کوردیمان زیاتر دەکاتەوەو شیعری کوردی دەخاتە شوێنی شایانی خۆی ..

## پەراوێزەکان

١ـ لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا زیاتر بە نموونەوە لێی دەدوێن و لە دووای گۆڕانەوە دەست بە باسەکەمان دەکەین تا شاعیرانی هاوچەرخی ئێستامان .

٢ـ علاء الدین سجادی ، لە بەشی هۆنراوەی لاسایی وەیان مەسرەحی‌دا ، داستانی (مەم و زین)ی خانی لە کوردی‌دا بە نموونەیەکی تراژیدیا داناوە ، بڕوانە ـ ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی ـ ل ١٥٢

٣ـ بۆ زیاتر زانیاری و سەرنجی جیا جیا لە بارەی ئەم چامەیە بڕوانە محمود زامدار ـ گۆڤاری (بەیان) ژمارە (١٠١ ـ ١٠٢) ژمارەی تایبەتی ك١ ١٩٨٤ ـ گلکۆی تازەی لەیل و لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی .

٤ـ علاء الدین سجاوی ، ئەم داستانەی خانا بە نموونەیەك لە بوونی کۆمیدیاو تراژیدیا لەیەك داستانا دائەنێ ، بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل ١٥٣

٥ـ بۆ زیـاتـر زانیـاری بڕوانـە ـ د . مارف خەزنـەدار ـ شیعری سیاسی کوردی لە کوردستانی عیراق دا ـ ژمارە (١٥) گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات

٦ـ د . عزالدین مصطفى رسول ـ الواقعیة فی الأدب الكردي ـ ص ٣١

٧ـ د . مارف خەزنەدار ، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە ، ل ١٦٧

٨ـ ت . س . الیوت ، ترجمة الدكتورە لطفیة الزیات ـ مقالات في النقد الادبي ، ص ٤٣

٩ـ حسین علی شانوف ترجمة ـ شكور مصطفى ـگۆران شعر الشاعر الكردي المعاصر، ص ١٦٥

١٠ـ نفس المصدر السابق ، ص ١٦٠

١١ـ نفس المصدر السابق ، ص ٤٩

١٢ـ فاضل ثامر ، معالم جدیدة في أدبنا المعاصر ، ص ٣٥٢

١٣ـ محمود زامدار ، وێرانە خاك ، دیاری ژمارە (٤١) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ل ٦ .

١٤ـ د . كمال ابودیب ـ دراسات في بنیة القصیدة الحدیثة ، مجلة (الاقلام) العدد / ٥ آیار ١٩٨٧ ص ٥

١٥ـ فاضل ثامر ، نفس المصدر السابق ، ص ٣٥٣

١٦ـ ت . س . الیوت ، نفس المصدر السابق ، ص ٩٣

١٧ـ مالكم برادبری وجیمس ماكفارلن ـ ترجمة ، مؤید حسن فوزی ، الحداثة ، ص ٧٣

## سەرچاوەکان


١ـ علاء الدین سجـاوی ، ئەدەبی کوردی‌و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی ، بەغداد ، ١٩٦٧ ، چاپخانەی المعارف .

٢ـ د . مارف خەزنەدار ، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی بەغداد ، بەشی کوردی ، ژمارە (١٥) .

٣ـ د . مارف خەزنەدار ، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە ، بەغداد ، ١٩٨٤ ، چاپخانەی المؤسسة العراقیة للدعایە و الطباعة .

٤ـ د . عزالدین مصطفى رسول ، الواقعیة فی الادب الكردي ، دار المكتبة العصریة ـ بیروت ، بلا .

٥ـ ت . س . الیوت ، ترجمة الدكتورة لطفیة الزیات ، مقالات في النقد الادبي ، دار الجیل للطباعة .

٦ـ محمود زامدار ، وێرانەخاك ، دیاری ژمارە (٤١)ی ڕۆشنبیری نوێ

٧ـ حسین علي شانوف ، ترجمة ـ شكور مصطفى ، گۆران شعر الشاعر الكردي المعاصر، منشورات المثقف الجدید (٢) ، بغداد ١٩٧٥ .

٨ـ فاضل ثامر ، معالم جدیدة في أدبنا المعاصر ، وزارة الاعلام ، سلسلة (٨١) بغداد ، ١٩٧٥

٩ـ مالكم برادبری و جیمس ماكفارلن ـ الحداثة ، ترجمة ـ مؤید حسن فوزي ، دار المأمون ، بغداد ، ١٩٨٧ .









سافۆ، ١٩٢٥، پاریس – مۆزەخانەی بووردێل

ـه ئاسۆی هونەری جیهانی‌دا

### هونەری فەرەنسی هاودەم

# بووردێل

نووسینی مێژوونووسی سۆڤیەتی: ڤ. ڤ. ستارودۆبۆڤا
وەرگێڕان‌و ئامادەکردنی لە ڕووسی‌یەوە: محمد عارف

ئەگەر لە سەدەی نۆزدەم‌دا، هونەری شێوەکاری فەرەنسی ئاسۆیەکی ...و فراوانی لەپێش کرابێتەوەو هەنگاوی گەورەی بۆ پێشەوە نابێ، ئەوە سەدەی بیستەم‌دا. لە کاتی درووست بوونی جیهانی سەرمایەداری‌و لە ...ی ئیمپریالیزم‌دا، ئەو هونەرە تووشی زۆر جۆرە تەنگ‌و چەڵەمەو ...ەی هونەریی سەخت و زۆرانبازی گەلێك جۆرە قوتابخانەو شێوازو ...ز بووە... بە پێچەوانەی بەرهەمی ئەدەبی کە زۆر داهێنانی تازەی پڕ ...ی مرۆڤایەتی‌و تاقی‌کردنەوەی ئەزادی پێش‌کەش کردوە، وەك بەرهەمە ...ی‌یە نایابەکانی نووسەرانی مەزن: (ئەناتۆلی فرانس)، (رۆمان رۆڵان)و ...رانی گەورەی وەك: (پۆل ئیلوار) و (ئەراگۆن) کە بە باشترین نوێنەرو ...رانی قوتابخانەی ریالیزمی سوشیالیزمی دەژمێردرین لە وڵاتە ...رمایەدارەکان‌دا.

هەمان گیانی پێش‌کەوتن خوازیی لە هونەری سینەمای فەرەنسی سەرەتای ئەم سەدەیەمان دەست‌نیشان دەکرێ.

هونەری پەیکەر تاشینی فەرەنسی شەپۆڵی مۆدێرنیزم، کەمتر ...وبەتیەوە، بە پێچەوانەی هونەری نیگارکێشان، کە ئەم شەپۆڵە بەرەو ...ری فۆرمالیزمی‌و دیلی رووخساریی، دوور هەڵیگرتووەو لە نێوان سێ ...ەی سەرەکی: کووبیزم (التكعيبية)و ئەبستراکت (التجريدية)و ...یزمی چەسپاندوە.

بەڵام هونەری پەیکەرتاشینی هاودەمی فەرەنسی پەیوەندی خۆی ...ن گەل‌و بینەرو هونەر دۆستان بزرنەکردوەو هەر مۆرکی (هونەری ...و گۆرەپانی هەڵگرتووەو شەقام‌و شوێنە گرنگەکانی وڵاتی ...وتەوەو سروشتی جوانی‌و خواردەمەنی گیانی بە هەزاران خەڵکی ...ەوەی سالۆنەکان بەخشیوە) ئەم شتەش لە پەیکەرە نایابەکانی ...رمەندان: (بووردێل، مایۆل‌و دلسپیۆ) دا بەرجەستە بووە.

ئەوەی شایانی باسە ئەم دیاردەیە پێچەوانەی هونەری نیگارکێشان بووە... هونەرمەندانی نیگارکێش: «ماتیس، مارکیە، مودیلیانی، ئووتریللۆ، رووە، ڤلامینك، دیوفیە، سیگۆنزاك، دێرێن، براك، دووشامب، پیکابیا، میرۆ، دالی، دێلۆنی، ڤازارێلی، بیوفیە، هارتوونگ، فووژێرۆن، میێل، تاسیلسکی، ئیففێل‌و کامب». شاری پاریس‌و وڵاتی فەرەنسەیان کردوەتە گۆرەپانی گەورەی چموجۆڵی هونەریی‌و هەر یەکێك لەم هونەرمەندانە بەگوێرەی بیروباوەڕیی هونەریی‌و ئیستاتیکای تایبەتی ئاسۆی هونەری فەرەنسی‌و ئەوروپی‌یان روون‌ترو گەورەتر کردوە.

بەرهەمی پەیکەر تاشی مەزنی فەرەنسی (ئەنتوان بووردێل ١٨٦١ – ١٩٢٩) مۆرکی دراماتیزمی‌و دینامیکیەتی هەڵچوونی دەروونی مرۆڤی هەڵگرتوە. بووردێل بایەخێکی زۆری بە دابەش‌کردنی فۆرما داوە، بەڵام بە مەبەستی هونەرییەوە. زۆر جار کاتی جوولانەوەی هەڵبژاردوە کە – مانای ژیان – زیاتر دەبەخشی‌و هەروەها پەیکەرەکانی بە گیانی مەنومێنتی واتە (پەیکەری گۆرەپان) درووست‌کردوە، ئەو شتەش هەستی مەزنی‌و بڵندی‌و سامناکی دەبەخشیتە بینەر. لەم روانگەیەوە بە دڵنیایی‌یەوە دەتوانین فەلسەفەی ئیستاتیکی بووردێل لەگەڵ گیانی ئەدەبی‌و بەرنامەی نووسینی نووسەری فەرەنسی (رۆمان رۆڵان) بەراوردی بکەین، یەکەمیان بە هۆی پەیکەرەوە دووەمیان بە هۆی ووشەوە، هەمان گیان‌و ئیستاتیکای مرۆڤایەتیان هەڵگرتووەو بەوپەری باوەڕەوە ژیانی خۆیانیان بۆ تەرخان کردوە.

بووردێل لە خێزانێکی پیشەسازی بەردتاشین‌و کۆڵینی دارو پەیکەر تاشین، چاوی کردوەتە... ئەمەش نهێنی (گیانی میللی)یمان، لە پەیکەرەکانی بووردێل‌دا بۆ ئاشکرا دەکات.

پەیکەرتاش لە سەرەتادا خوێندنی هونەریی لە (تولوز) و لە پاشان لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکانی پاریس تەواو کردوە.

بووردێل زۆر کەرەت دووپاتی کردوەتەوەو گوتوویەتی: «لووڤر،



سەری ئەپۆلۆن ، ١٩٠٠ ـ ١٩٠٩ پاریس ، مۆزەخانەی بووردێل

نۆتردام، پیوژیەو باریی. ئەم مووزەخانەو شۆینانە، مامۆستاکانی ڕ ستەقینەی منن».

پەیکەرتاش لە تەمەنی بیستو سێ ساڵیدا، لە پیشانگا هونەرییەکان بەشداریی‌کردوە: بووردێل لە ساڵی (١٨٨٩)وە، لەگەڵ پەیکەرتاشی مەزنی فەرەنسی (ڕۆدان)، بە یەکەوە ئیشیان‌کردوەو ئەوەی شایانی باسە، فەلسەفەی ئیستاتیکی ڕۆدان کارێکی قوولی لە بەرهەمی بووردێل کردوە.

یەکەم بەرهەمی مەنوومێنتی بووردێل کۆمەڵە پەیکەری گۆڕەپانی شەهیدەکانن، کە لە ڕووی دامەزراندنی هونەرییەوە هەست دەکرێ کەمێك ساکارو شلوشۆقەو بەشەکانی بە چاکی - جێگای خۆیان نەدۆزیوەتەوە ـ.

پەیکەری نایابی (هێرقلی تیر هاوێژ)، ١٩٠٩، پاریس مووزەخانەی هونەری هاودەم، (هەمان پەیکەر تاکێکی تری لە شاری پراگ لە چیکۆسلۆڤاکیا هەیە). هێزی لەشو ئەندامی مرۆڤ، ئەو هێزەی کەپێویستە بەهۆشمەندی بەکار بهێنرێ، دەردەبڕێ. پەیکەرتاش مەبەستی لەم چارەسەرکردنە و دەربڕینی ناوەڕۆکێکی کۆن ئەوە بووە، کە گفتوگۆ لەگەڵ مرۆڤ هاوچەرخ بکاتو پێی بڵێ: (بۆچ ئەم هێزو توانایەت بزرکردوە کە سروشت بە تۆی بەخشیوە؟!)

بووردێل بۆ خۆی باسی پەیکەری (ئادەم) دەکاتو دەڵێ: «لەم پەیکەرەدا ئارەزووی دەربڕینی ئادەمم کردوە چۆن وەك پاڵەوانێکی بەهێزو مرۆڤێکی سادەو ساکارو دڵپاك دروست‌کراوەو بەرامبەر ئەو جیهانە جەنجاڵو سەرسوورێنەرە وەستاوە».

قۆناغی تازەی بووردێل، قۆناغی گەڕانو لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆکی ڕەوشتو خوو بەرزی مرۆڤو تەواویی هەستی مرۆڤایەتی‌یە، لە ماوەی دە ساڵی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، هونەرمەند لەم جۆرە ئیستاتیکایە بەردەوام بووە، گۆڕینی ناوەڕۆك، پێویستی بە گۆڕینی ڕووخسارو چارەسەرکردنی تازەش هەبووە، ئەو شتەی کەلە پەیکەری: (سەری ئەپۆلۆن، ١٩٠٠ - ١٩٠٩)و (پنیلوپ، ١٩٠٥ - ١٩١٢)، (سافۆ)و دوو پەیکەری مەنوومێنتی (میسکێفیس ١٩٠٩ - ١٩٢٩) و (جەنەراڵ ئەلڤیار - بوینس ئایرس - ١٩١٤ - ١٩٢٣ کە بڵندی ٢٢ مەترە)، باشترین نموونەی پڕ لە داهێنانی ئەم قۆناغەی باسکراو بەرجەستە دەکەن.

لە قسە نەستەقەکانی بووردێل باسی ئەم شتە دەکەین: «پێویستە هونەری پەیکەرتاشین، متروبەی هونەری بیناسازیی بێتو وەك دوو دار متروبە دەکرێ تا دارێکی باشتری لێ دەربچێ»... بەڵێ هونەرمەند لە شاکارەکانی لە شانۆی (یلیسی‌ی، ١٩١٢)و ئۆپێرای (مارسێلێ، ١٩٢٤) ئەم ووشانەی وەرگێراوەتە سەر بەرهەم.

بووردێل مامۆستای کەمهاوتای (پۆرترێتی پەیکەریش بووە) لەم گۆڕەپانەدا شۆرەسواری زەمانی خۆی بووە، پۆرترێتی: (ئەناتۆلی فرانس، ڕۆدان) بیتهۆڤن، ڕیمبراندت، میسکێفیس، ئینگر» بە باشترین پۆرترێتی پەیکەریی ئەم سەدەیەمان دەژمێردرێ.

○

هێرقلی تیرهاوێژ، ١٩٠٩ ـ پراگ . چیکۆسلۆڤاکیا مۆزەخانەی هونەری نەتەوایەتی هاودەم



# «ئامادە کردنی»
# مۆسیقای گۆرانیی فۆلکلۆری

وریا ئەحمەد

## سەرەتا

دەمێکە چەن بیرۆکەیەکی تایبەت بەم مەسەلەیەو چەن مەسەلەیەکی دیکەی هونەری ، لە مێشکمدا دەخولێنەوە . هەرچەن جاریش لەسەر ڕووی تەلەفزیۆندا ، چاوم بە هەندێ گۆرانی فۆلکلۆری «ئامادەکراو» دەکەوێت ئەم بیرۆکانە گورجو خێراتر لە جاران دەخولێنەوە . . . . . . . .

ئیە وام بە باش زانیو لەگەڵ خۆما بڕیارمدا . هەر جارە یەکێك لەو جۆکنە نخەمە بەرچاوی هونەرمەندو هونەردۆستان . . . . . دوور نیە کەکێشیان بیبیت ، لەوانەیە چەن کەسێکیش لە پەیوەندیداران . بە دەنگمەوە بێنو رای جیاوازیشان بیێتو دواتر مەسەلەکە بە پەیوەندی هونەری گۆرانیو مۆسیقای کوردیمان بشکێتەوە . . . . من دەبێ سوپاسی هەندێ لەو تیپو دەستەو تاقمانەش بکەم . کەلە لەم چەند ساڵەی دواییدا ، دەستیان بە (ئامادەکردن)ی مۆسیقای گۆرانی فۆلکلۆری کردووە ، چونکە ئەو دەستەو تیپانە ، هەموو یاساو ڕێسایەکی هونەری تایبەتەمەندم لایەنەیان تێکدا زۆرێ شێل کرد لە لایەکو لە لایەکی دتی ڕوخسارو شێوەی تا ڕادەیەك ئاشکراو ناسراوی ئاوازو ڕەزمی گورانی فۆلکلۆری کوردییان شێواند . . . . بۆیە وا لێیان بەدەنگ دێمو ئەم نووسینە بە مەبەستی سوود گەیاندن بەوان کەسانە ، بڵاو دەکەمەوە .

### ✳ گۆرانی فۆلکلۆری — Folksong

ئەو گۆرانییەیە کە لە نێو زۆربەی چینەکانی میللەت پەیدا دەبێتو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژیش بە زیندوویی لە نێوانیاندا دەمێنێتەوە . ئەم گۆرانییەش بە دەقێکی یا بەڵگەنامەیەکی هونەریو کۆمەڵایەتی دادەنرێو زۆر لە خووو نەریتی کۆمەڵگەکەی تیادا بەدی دەکرێت . (١)

زانایەکی دی دەڵێ : - گۆرانی فۆلکلۆری بریتییە لە پارچە هۆنراوەیەك ئاوازی بۆ دانرابێ . بەڵام نە خاوەنی هۆنراوە نە ئاوازی یەکەمجاری نازانرێ . . . ئەوەندە هەیە ئەو گۆرانییە . لەناو کۆمەڵێکی نەخوێندوارو لە سەردەمێکی کۆندا ، سەری هەڵداوەو ماوەی چەن سەدەیەك یا زیاتر بەکارهاتووەو لە کاتی گوتنەوەو دووبارە کردنەوەیدا . گەلێ ووردە گۆڕان بەسەر هۆنراوەو ئاوازەکەیدا هاتووە[٢]

### ✳ هەندێ لە خاسییەتەکانی گۆرانی فۆلکۆری

لە نەوەیەکەوە . بە هۆی بیستنەوە . بە نەوەیەکی دی دەگاتو بە زۆر جۆرو شێوە هەیە . بۆ نموونە گوتنی یەك گۆرانی فۆلکلۆری لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی . یاخود لە گۆرانی بێژێکەوە بۆ یەکی دی دەگۆڕێ بگرە یەك گۆرانی بێژ . گەر داوای لێ بکرێت ، دوو جار یەك گۆرانی فۆلکلۆری بڵێت . هەست بە ووردە گۆڕان لە گوتنەکانیدا دەکەین . بەڵام قالبی ئەو

گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یە تا رادەیەك دیارەو پارێزراوە . گۆرانی فۆلکلۆری لە ئەنجامی هەندێ هۆو رووداوی کۆمەلآیەتی دروست بووە . هۆنراوەو ئاوازی ئەو گۆرانی‌یانە بە گشتی بێ زۆر لە خۆکردن هاتوونە ، چونکە مەسەلەیەکیان دەست‌نیشان کردووە .

## ئامادەکردنی مۆسیقای گۆرانی فۆلکلۆری

«پارتۆك بێلای» هەنگاری[٣] لەم بارەیەوە دەڵێ : – (مامەڵە کردن لەگەڵ ئاوازی فۆلکلۆری دا . لە نووسینی ئاوازێکی سەرکەوتووی تازە زەحمەت ترە . . !. . ؟) ناوبراو ئەم مامەڵە کردنەش بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش دەکات : –

جۆری یەکەم : – ئاوازێکی فۆلکلۆری بە بێ دەستکاری تۆماربکرێت دوای ئەوەی (دەنگی هاوەڵ – مرافقة – saccompanimentی بۆ زیاد دەکرێت . یاخود (پێشەکی مۆسیقا – post Lude)و (کۆتایی – مۆسیقا – Postludeی بۆ دەکرێت . «پارتۆك» بۆ ئەم کارە دەڵێ : – وەك ئەوەیە . چەن بەردێکی نایاب‌و گرانبەها . لە ناو چوارچێوەیەکی پڕ بە پێستی ئەو بەردانە دا بنێین . . . . . . لەم جۆرە ئامادەکردنەدا . گرنگی بۆ ئاوازە فۆلکلۆری‌یەکەیەو ئاوازەکانی دەوروپشتی بە دەوری دووەم دێن‌و بەخزمەت ئاوازە فۆلکلۆری‌یەکەدان

جۆری دووەم : – لەم جۆرەیان ئەو رە فۆلکلۆری‌یەکە وەك پارچە مۆسیقایەکی سەرەکی (motto) دەبێت‌و مۆسیقا ئامادە کراوەکەش زۆر گرنگە . ئەوەشمان لەیاد نەچێت . ئەو «رۆب»ە ئاوازەی دەی‌کەینە بەر ئاوازە فۆلکلۆری‌یەکە . دەبێ لەسەر تایبەتی یەکانی ئاوازە فۆلکلۆری‌یەکەوە هەڵقولآبێت‌و تام‌و بۆی ئەوی لێ بتکێت . (٤)

## رای تر بەرامبەر ئامادەکردنی گۆرانی فۆلکلۆری

گەر بکرێ . گۆرانی فۆلکلۆری . لە دەمی چەندین کەسەوەو لە چەندین ناوچەی جیاجیادا تۆمار بکەین . . . . . دوای کۆتایی هێنان بەم کارەکە (گەرانی گۆرەپانی - المسح الميداني) پێ دەڵێن . کاری پشت‌مێز



دەستپێدەکات . ئەویش بریتی‌یە لە خوێندنەوەی هۆنراوەی گۆرانی‌یەکەو هەموو ئەو تێبینی‌یانەی لە کاتی تۆمارکردنی ئەو گۆرانی‌یە دان نووسراون . پاشان بە دەیان جار بگرە گەلێ لەوەش زیاتر . گوێ لە ئاوازی ئەو گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یە دەگرین . . . بۆ ئەوەی لە (ئاواز)و (رەزم)ی تێربین‌و شارەزای (پەیژە – Scale) (رەزم – ئیقاع) وکەی بین‌و بچینە ناو ناخ‌و قووڵایی ئاوازەکەوەو لە (نورك – طابع)ی ئەو ئاوازە بگەین . ئەوکاتە ئاوازدانەر وەك چۆن (یەرداخ) پڕبێت لێ‌یدەرژێت . کە گوێی مۆسیقاو مێشکی لە نهێنی‌و کون‌و کەلەبەری ئەو ئاوازە تێربوو . . . یەکەم ئیش ئاوازە رەسەنەکە بە شێوەیەکی ساکار بە (نۆتە) بنوسێتەوەو وەك (ئەرشیف) بپارێزرێت . . . .

زانایانی مۆسیقا پێ لەسەر رایەك دادەگرن‌و دەڵێن : – (نووسینەوەی گۆرانی فۆلکلۆری . واتە بە نۆتەکردنی . دەبێ بە ئەمانەتەوە بێ . بۆ ئەوەی ببێت بە بەڵگە نامەیەکی هونەری راست‌و لە دوارۆژا پشتی پێ ببەسترێ .) پاش ئەوەی ئاوازو هۆنراوە فولکلۆری‌یەکە مان بە (ئەرشیف) گەیاند . . . . ئیستا دەتوانین ئاواز بۆ (پێشەکی . یا کۆپلە . یا ناوئاخن‌و کۆتایی . . . . تاد) ئەو گۆرانی یە دانێین . بە مەرجێك نامۆ نەبن لە ئاوازەکەو بە هیچ جۆرێك لە تام و بۆی ئاوازە رەسەنەکە دوور نەکەوینەوە . ئەو پارچەیە یا پارچانەی بۆی زیاددەکەین ئاڵۆزی‌و زۆر لە خۆکردنی تیادا بەدی نەکرێت‌و هەر لە ئاوو بای ئاوازی گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یەکەوە هەڵقولآبێت . . .



ئێستا حەز دەکەم هەندێ لەو دەیان گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یانەی خۆم مۆسیقام بۆ ئامادەکردوون ، بە نموونە بهێنمەوە : —

١ — گۆرانی (با بچینە کوێستان) دوای ئەوەی ئەسڵی ئاوازو هۆنراوە رەسەنەکەیم ، بە ئەمانەتەوە بە (ئەرشیف) گەیاند . . . . . . . بە هەڵبەستێکی تازەو بە پێشەکی‌یەکی گونجاو بەتۆمارم گەیاند . . . .

٢ — گۆرانی (بەلەنجەو بەلەنجە) ئەم گۆرانی‌یە ، یەك رستەی بچووکی مۆسیقا بوو ، بەم شێوەیە گۆراو بوو بە گۆرانی‌یەکی تەواو .

٣ — گۆرانی (هۆبزەندان) یەکەمجار بریتی بوو لە رستەیەکی بچووکی مۆسیقاو بەڵام دوای ئەوەی لە ئاوازەکە تێربووم ، کاری لە ناخم کردو هەژاندمی نەك هەر پێشەکی مۆسیقا بەڵکو (کۆپلە) شم بۆ زیادکرد . . . .

لەپێناو ئامادەکردنی مۆسیقای ئەو ئاوازانەی سەرەوەدا ، چەندین شەوو رۆژم بەسەر بردووە . . . . گوێم بۆیان شل‌کردووە ، بەیانیان چونکە مێشك تێرخەوو خۆراكو سافە . . . . شەوان پێش خەفتن ، بە مەبەستی ئەوەی زیاتر لێ‌یان تێ‌بگەم . . . . . . . . لە کاتی بێ ئیشی‌دا . . . . وەك دەڵێن : تاوەکو «بگات» . . . . هەرگیز زۆرم لە خۆم نەکردووەو پەلەوهەڵپەی ئەوەم نەبووە ، بە زووترین کات بە تۆماریان بگەیەنم .

کەچی لە (تایتل — Title)ی پێشەکی ئەوگۆرانی‌یانەش ، تەنیا «ئامادەکردنی — وریا ئەحمەد» دەبیزێ .

بەداخەوە هەندێ لەو مۆسیقا ژەنانەی ئەمرۆ . . . . گۆرانی‌یەکی فۆلکلۆری دێنن ، بێ ئەوەی تەنیا یەکێکیش بێت لەو خاڵانەی زووتر باسم کردن ، رەچاو بکەن ، گۆرانی‌یەکە زۆربەی جاریش بە ئیفلیجی‌و شێواوی دووبارە دەکەنەوەو تۆمار دەکەن . . . بەڵام لەسەر تایتلی پێشەکی ئەو گۆرانی‌یانە ناوی‌خۆیان وەك (ئامادەکەر) دەنووسن ! ؟

**ئایا هەموو مۆسیقاژەنێکی لێهاتوو توانای ئامادەکردنی گۆرانی یا ئاوازدانانی هەیە ؟**

ماوەیەکە هەندێ مۆسیقاژەنی لێهاتوومان لە نێودا هەڵکەوتوون . . . . لە رادەیەکی پێشکەوتوودان . . . . جێگای دڵخۆشی‌و شانازیمانە کە میللەتەکەمان لە ماوەیەکی ئەوها کورت‌دا ، کۆمەڵێك مۆسیقاژەنی بلیمەتی تیادا دەرکەوێت ، بەڵام ئایا هەموو مۆسیقاژەنێکی چاكو لێهاتوو — توانای ئامادە کردنی گۆرانی فۆلکلۆری‌و ئاوازدانانی هەیە ؟ ؟ لێرەدا قسەیەکی گۆرانی‌بێژی خوالێخۆشبوو (شەماڵ سائیب)م بیرکەوتەوە ، کە دەی‌گوت : — (لە میسر بە سەدان مۆسیقاژەنی بلیمەت‌و بەتواناو ناودار هەن . . . . . بەڵام ئەوانە چەندیان ئاوازدانەرن ؟ ؟ .) بەداخەوە ئەمرۆ لەناو ئێمەدا ، ئاوازدانانو ئامادەکردنی مۆسیقاو دابەش‌کردنو . . . .تاد لای هەندێ کەس بووە بە چاولی‌کەری . . . . من دەڵێم : مەرج نیە هەموو مۆسیقاژەنێکی تا رادەیەك پێشکەوتوو ، یا هەر دەرچوویەکی پەیمانگەیەکی هونەری ، ئەوکارانە بە لێهاتوویی‌و سەرکەوتوانە ئەنجام بدات . بۆیە هەندێ بەرهەمی فۆلکلۆری ئامادەکراون بەرگوێ دەکەوێت . . . . راستە مۆسیقاکە پاکە . . . .

بەڵام بەداخەوە نامۆیە . . . . هەندێ لەو مۆسیقا ئامادەکراوانە ، بە راهێنانی نێو کتێبەکانی فێربوونی ئامێرەکانی مۆسیقا Methodدەچن‌و بە هیچ شێوەیەك گوێ‌گری کورد ناجولێننەوە . . . . چونکە شتە زیاد

کراوەکانیان . . . . ئامو بۆی ئاوازە ڕەسەنەکانیان لێ ناتکێتو بەڕا ی من هێزنیە بتوانێت ، ئەو مۆسیقا زیادکراوانە ، بە گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یە- کەنەوە بنوسێت . چونکە وەك دەڵێن : - (خوێندنو خوێندنەوەی زۆرو پروانامەو . . . . . تاد ڕەنگە ڕۆشنبیرێکی لێهاتوو دروست بکەن ، بەڵام شاعیرێکی چاك دروست ناکەن .)

- **یەك گۆرانی فۆلکلۆری لە ماوەی (٢ -٣) ساڵدا زیاتر لە جارێك ئامادە دەکرێتو بە تۆمار دەگات .**

---

بەڕای من باشتر وایە جارێ ، بە دوای گۆرانی‌یەکی فۆلکلۆری‌دا بگەڕێین ، ئاوازەکەی گوێی خەڵکی پێ ئاشنا نەبووبێ ، یا هیچ نەبێ بە تۆمار نەگەیبێ . . . . گۆرانی‌یەکی فۆلکلۆری کە بە ڕێكو پێکی بۆ ئیسگە یا تەلەفزیۆن تۆمار کرابێت . . . یا بۆ جاری دووەم سێیەم تۆماری نەکەینەوە ، بەڵکو وەك گوتم : ئەم هەوڵە لەگەڵ یەکی نادیار بدەین . ئەمەی باسمکرد زۆر جار ڕوویداوە ، وەك نموونە : -

(١) گۆرانی «کراسەکەی مۆرە» کاتی خۆی لە لایەن هونەرمەند «رزگار خۆشناو» ئامادەکراو خۆیشم دەرهێنانی دەنگو تۆمارکردنیم ، سەرپەرشتی‌کرد ، (تیپی هونەری هەولێر) بە دەنگی «ڕەحمان قوربانی» بە شێوەیەکی چاك بۆ تەلەفزیۆنی «دۆبلاج» کرد . . . .

(٢) دوای ماوەیەك ، هەمان گۆرانی بە ئامادەکردنی «سالار حەمادی» (تیپی مۆسیقای ڕۆشنبیری جەماوەر سلێمانی) بە دەنگی گۆرانی بێژێکی دیکە ، «خۆزگە دەنگیشی لەگەڵ مۆسیقاکەدا ، تەواو بوایە» بۆ تەلەفزیۆنی تۆمارکرد .

(٣) جارێکی دی هەر ئەو گۆرانی‌یە ، بە ئامادەکردنی «قادر مەردان» دەنگی گۆرانی بێژێکی دیکە ، بۆ جاری سێیەم ،

(تیپی مۆسیقای سەر بە تەلەفزیۆن بە تۆماری گەیاندەوە ! ؟

خۆ ئەگەر دووبارەو سێ بارە تۆمارکردنی ئەو گۆرانی‌یە ، لەوەی ئێمە پاکتر بوایەو زیاتر مۆرکو تامی کوردی لێ بتکایە . . . . . . ئەوە هەر قەیدی نەبوو . . . . . . بەڵام وەك ڕاستی‌یەك ، تۆمارکردنی جاری یەکەمی ئەو گۆرانی‌یە ، لە هەموو لایەنە هونەری‌یەکانەوە ، لە تۆمارکردنی جاری دووەمو سێیەمی ئەو گۆرانی‌یە ، جوان ترو ڕێكو پێك ترە . . . . .

بە داخەوە ڕاستی‌یەك هەیەو دەبێ بگوترێ . ئەویش ئەوەیە : زۆربەی مۆسیقاژەنان لە سەرەتای دەست‌پێ کردندا ، هۆشیاری گشتی‌یان کەمە . . . . هۆیەکەشی چونکە زۆربەی کاتیان بە (پرۆڤە) واتە ڕاهێنان لەسەر (ئامێرەکانیان ، یاخود خوێندنەوەی کتێبەکانی تایبەت بە مۆسیقاو مێژووی مۆسیقاو ناودارانی ئەوجیهانەو . . تاد . بەسەر دەبەن . مۆسیقاژەن هەیە لە ڕۆژێك‌دا (٨) کات‌ژمێرو هەیە زیاتریش بە پرۆڤەکردنە بەسەر دەبات - بەڵام دەبێ بە هەوڵ دانو خۆ ماندووکردنوخوێندنەوە گفتوگۆو . . . .تاد هەوڵی بەرز بوونەوەی ئاستی هۆشیاری گشتی خۆی بدات . چونکە بەرزبوونەوەی هۆشیاری هەمووان ، بەرزبوونەوەو بەرەپێش چوونی هونەری نەتەوەبە ئەنجام دەگەیەنێت .

## کۆتایی

---

بە هیوام چی دی کەسانی لێ‌نەهاتووو کەم‌توانا خۆ لەم بوارە نەدەنو شوێنی کەسانی بلیمەتو بەتوانا نەگرن چی دی با گوێی خەڵکی نەشێوێننو زەوقی میللەت پێ‌شێل نەکەن . . . . . چونکە هونەری مۆسیقا بە گشتیو ئامادەکردنی گۆرانی فۆلکلۆری بە تایبەتی کارێکە دوای خوێندنو خوێندنەوە پرۆڤەو گەڕانی گۆڕەپانیو تێگەیشتنی تەواوی ئاوازە ڕەسەنەکانو دوای ئەوانەش لەبەهرەو سەلیقە داری‌یەوە دێت .

## پەراێزو سەرچاوەکان

١ - ئەسعەد محەمەد عەلی - کتێبی (في أصول الموسيقى الفولكلورية) ل . ١٢

٢ - ئەلکساندەر کراب -کتێی (علم الفولكلور) ل . ٢٥١ .

٣ - (پارتۆك بێلای)و (زۆلتان کۆدای) دوو پێشەنگو ڕابەری داهێنانن ، لە مۆسیقای هەنگاری تازە . لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە دەستیان بە گەڕانی مەیدانی بە دوای گۆرانی فۆلکلۆری خۆیان‌دا . کردووە . ئەم دوو مۆسیقارە ئاوازە فۆلکلۆری‌یەکان بە سەرەتاو بناغە دادەنێن . بۆ ئەوەی ڕاپەڕینێکی مۆسیقا ڕووبدات . ئەم کارەیان بووە هۆی ئەوەی مۆسیقایەکی نەتەوەیی هەنگاری دروست بێت .

٤ - ئەسعەد محەمەد عەلی -هەمان سەرچاوە . ل . ٤٧ .

٥ - Title - مانای - ناو ، ناونیشان ، دەگەیەنێت ، مەبەست لەو کارتەیە کە لە سەرەتای بەرهەمی تەلەفزیۆنی‌دا ، ناوی گۆرانی‌بێژ یاخود دەرهێنەر یا ئاوازدانەر یا شاعیر تاد لەسەر دەنووسرێ .



# گیروگرفتەکانی قسەکردن و چارەسەریان

جەلال خەلەف ژالەیی

خوێنەری بەرێز : تەمەنێکی تایبەتی بۆ قسە کردنی [ زمان گرتن ] منداڵ ، دیاری نەکراوە ، چونکە بێجگە لە دایك ، و باوك ، کە مەبەستی چەند ووشەیەکی منداڵی پێنج مانگی تێدەگەن ، و دەزانن واتای خۆشی‌یە ، یان ناخۆشی‌یە ، ئازارە ، یان لەش دروستی‌یە ؛ کەس لە واتای یەکەم ووشەی منداڵ تێ‌ناگات ، بەڵام ئەوەی راست بێت ، زوربەی زۆری منداڵان بەیەك ساڵی دەست بە زمان گرتن دەکەن ، یەکەم ووشە یشیان کە فێری دەبن ، ووشەی دایەیە ، یان باوەیە ، یان کاکەیە ، یان دادەیە



، یان تەعەیە .... هتد ...
لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە منداڵانی لەش دروست ، و ئاسایی لە تەمەنی (١٨) هەژدە مانگیدا فێری قسە کردن دەبن ، بەڵکو هەشیانە بە دوو ساڵی فێری قسە کردن دەبێت .
ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ، ئەگەر هات ، و تەمەنی منداڵ لە دوو ساڵی تێپەری کرد ، و فێری قسە کردن نەبوو پێویستە لەسەر کەس ، و کاری ئەو منداڵە بەتایبەتی دایك ، و باوکی ، زوو بە دەست ، و برد نیشانی پزیشکی تایبەتی بدەن ، و بەوەش نەخەڵەتێن کە ئەو منداڵە دواکەوتووە ، لە دوای تەمەنی (٣) مانگی بەدواوە گروگاڵی کردووە، چونکە منداڵانی زەین کوێریش ، و کەرو لاڵی تەواویش هەر گروگاڵ دەکەن .

## گیروگرفتەکانی زمان گرتن :

ئەو گیروگرفتانەی کە دەبنە هۆی دواکەوتنی زمان گرتن ، دەبنە چەند بەشێکەوە ، گرنگترینیان ئەم بەشانەن :
١ ـ لاڵی تەواو : ئەو کەسەیە بە گەورەییش قسە فێر نابێت ، بە [اشارة] تێدەگەیینرێت ، یان تێدەگات ، زوربەی زۆری ئەمانە کەریشن .
٢ ـ لاڵی ناتەواو : ئەمەیان چەند پلەو رادەیەکی هەیە بە گوێرەی پلە ، و بە هێزی ، و بێ هیزی گیرو گرفتەکە ، و هۆکانی .
ئەو گیروگرفتانەی کە ناگەنەپلەی لاڵی تەواو چەند جۆرێکی هەیە ، و هەر پلە ، و ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە :
یەکەم : توری : بریتی‌یە لەوەی منداڵ یاخود گەورە ، پیتی

یەکــەمی ئەو ووشــەی ، یان پیتی یەکــەمی ئەو ووشــەیــەی دەکــەوێتــە سەرەتای ئەو رستەیەی ، سایەی دەکات ، چەند جارێك دەڵێتەوە ، یان بابڵێن : ریزی دەکات ، کە بیەوێت : تۆ دەڵێت : تــ تــ تۆ ، کاتی وا هەیە برگەکە تەتەڵە دەکات .
لە زمانی کوردیدا بە تەتەڵە کردنی دەنگی هەموو پیتێك ، یان هەموو برگەیەکی سەرەتای ووشە ، زیاتر پێی دەووترێت توری ، یا تەتەڵە کردنی برگەی [دە]یش بێت ، وەکو : دەدەدەرمان، یان باتەتەڵە کردنی دەنگی پیتی (م) یش بێت ، وەکو : مــ مــ من ، کە دەتوانین ناوی بنێن : [ موری ـ التمتمة ] لەسەر کێشی توری،بری

دووەم : گیری : یەکێکی دیکە لە گیروگرفتەکانی زمان گرتن ، گیری‌یە ، ئەو برێتی‌یە لەوەی کە ئەو کەسە ووشەکەی بۆ نایەت ، واتا: بۆی دەرنابررێت ، و دەی خنکێنێت ، بەگران دەری‌دەبریت
سێیەم : بری ، بری یان لاڵەیە کەبریتی‌یە لەوەی کە ئەو کەسە ، قســەکان دەبرێت ، و بچڕ بچڕ دەکات ، و دەی گلمێنێت ، ودەمی بە یەکدا دێت .
ئەم سێ جۆرە گیرو گرفتە [ لاڵی‌یە ] زۆر کەرەت ، دیاردەکانی لەشە دەروونی ( سایکو سوماتی ) ،یان لە گەڵدا دەردەکەوێت ، وەکو شان هەڵتەکاندن ، پێ بە ئەرز دادان ، جیر کردنەوە ، بروهەڵتەکاندن چاوتروسکاندن ، سەرلار کردنەوە بەلایەکدا ، یان لارە کردن بەسەر .
چوارەم : موغی ـ اللثغە : برێتی‌یە لەوەی ئەو کەسە ، دەنگی پیتی (ر) دەگــۆرێتــە دەنگی (غ) یان دەنگی پیتی (ی) یان دەنگی پیتی (ڵ) ، وەکو ئەوەی کاتێك کەسایەی ووشەی (کەر) دەکات ، دەڵێت : کەغ یان کەی ، یان کەڵ .
پێنجەم : فسی : برێتی‌یە لەوەی ئەو کەسە لە کاتی قسە کردندا ، دەنگی پیتی (س) ، دەگۆرێت بۆ (ث) عارەبی ، هەرچەند فسی بە گیروگــرفتی قســە کردن دادەنــرێت ، بە هیچ جۆریك لاڵی پێنــاوتــرێت ئەبێت ئەوەش بزانین ئەو کەسە کوردانەی ، لە کاتێکــدا بە زمانی عارەبی قسە دەکەن ، و دەنگی پیتی (ث) عارەبی ، دەگــۆرن بۆ پیتی (س) ، بە گیروگرفت دانانرێت ،



چونکە ئەو کەسانە بە گەورەیی فیری زمانی عارەبی بوون ، و سەلیقــەی کوردی‌یــان بەهیــزە ، و پیتی (ث) یش لە زمــانی کوردیدا [ ئەلف و بێ ] نی‌یە ، هەر چەند گوێگران بە کارێکی ناشیرین دادەنێن .
شەشــەم : منگنی : هەر چەنــد بە گیروگــرفتی قســەکــردن دادەنــرێت ، بەڵام وەکــو فسی ، بەهیچ شێوەیەك ناچێتە ژێر بەشەکانی لاڵی ناتەواوەوە، مرۆڤی منگن : ئەو کەسەیە کە بە قورسی سایەی دەنگی هەموو پیتەکان دەکات ، دەنگی هەردو پیتی ( م ، ن ) نەبێت ، ئەمیش لەبەر ئەوەیە، بۆشایی‌یەك هەیە لە سەروی قورگەوە ، لەکاتی سایەکردنی دەنگی پیتەکاندا هەوا

دەدات ،یان هەوا دەدزێت ، بەلام لەکاتی سایەکردنی دەنگی هەردو پیتی (م،ن) دا دادەخرێت ،و کەلێنەکە دەچێتەوەیەك .

خوێنــەری هێـژا : ئەگـەر بێت ، و ووردبینەوە لەو کەسانەی گیروگرفتەکانی قسە کردن دەچێژن ، بێجگە لەوەی هێندێکیان لە قوتابخانەدا دووا دەکەوون و لە راپەرینی هیندە کاروبارێکی رۆژانەدا گیروگرفت دێتە رێگەیان ، دەبینین چەند دیاردەیەکی دەروونی ، و چەند زیانێکی سوزیان بەهۆی ئەو گیروگرفتانەوە پێگەیشتووە ، رادەی توندو تیژی ئەمانیش دەگەرێتەوە ، بۆ رادەی بەهێـزی وبێ هێـزی ، کەسێتی ئەو مرۆڤە،و جۆری پەروەرەدەی مندالی، و جۆری ئەو کۆمەلەی کە تیایاندا دەژی ئەو روالەتانەش وەکو : ئەمانەی باسیان دەکەین :
شەرمنی، و گۆشە گیری، و دلەراوکی، و باوەر بە خۆنەبوون، هەست بە کەمســەری، و کەمتــەرخـەمی، و نەگـونجاندن لە قوتابخانەدا، یان لەگەل هاورێ، و کەسانی کارکردندا .
ئەبێ ئەوەش بزانــین : زۆر کەس هەن ئەم زیـانانە هەروەکو ئالفــریــد ئەدلەر دەلێت : لەبــاتی ئەوەی گیروگـرفتـەکـانی قسەکردن، دوایان خات، پالیان پێوە دەنێت وپێشیان دەخات، و لە ژیانیاندا زۆر سەرکەوت، و دەبن .
نەگــەر هات، و ئەم دیــاردانــە بەهــۆی گیروگــرفتــەکـانی قسەکردنەوە، تووشی مرۆڤ نەبوون، و لە مرۆڤدا دەرنەکەوتن بەلکـو هۆیدیکـە هەبــوو بۆ دەرکـەوتنی ئەم دیاردانە، ئەوە دوورنی‌یــە کە مرۆڤــەکــە تووشی یەکێـك لە گیروگـرفتــەکانی قســەکردن نەکەن، وەکو لەمەودوا لە باسی هۆدەروونی‌یەکاندا باسیان دەکەین .
پێویستە ئەوەش بزانین، کە زوربەی زۆری ئەو مندالانەی کە تووشی گیروگرفتی زمان دەبن، تەمەنیان دەکەوێتە نێوان [٢ ـ ٥] سالی‌یــەوە، لەبــەر ئەوەیە کە زۆرترین منال، پێش چوونە قوتــابخـانــە بەشێـوەیــەك رێـك ووشەکان سایەناکەن ، یان جێگـۆرکی لە نێوان دەنگی پیتەکانی ووشەکاندا دەکەن، یان هەلەی زۆر دەکەن، ووشەیەك لە چەند رستەیەکدا ، دەگێرنەوە، واتــا: دووبــارە، و سێ بارەیان دەکەنەوە، بێ ئەوەی پێویست بکــات، لە کاتێکـدا کە چوونــە قوتــابخــانــە، دەبینــین : ئەم روالەتانەیان بەرە بەرە کەم دەبێتەوە، و نامێنێت .
ئەمجا لەبەر ئەمە ، ئەمانە بەگیروگرفتی قسەکردن ، دانانرێن، وا دیــارە لەبــەر ئەوە بووە کە ئەو منـدالانــە پێش ئەوەی لە قوتــابخانە وەرگیرێن ، کەسێك نەبووە وەکو مامۆستا، هەولیان لەگــەل بدات، زووبانیان راست کاتەوە،و ئەو نارەوانی یەیان نەهێلێت ، ئەگینا بۆچی ؟
هەروەکو چۆن ئەو کەسانەی لە پر پرسیاریان لێ دەکرێت ، و داوای وەلامی کت ،و پرییان لێ دەکرێت ، ئەوانیش بەگران قسەیان بۆ دێت ، یان ئەو کەسانەی بەلێشاو مانایان بۆ دێت ، و تاکەکانی زمانیان کەمە، وەکو ئەو کەسانەی کە تازە زمانێك فیربوون ،و تاکەکانی ئەو زمانەیان کەمەو لەکاتی قسەکردندا دادەمێنن ، و بەباشی قسەیان بۆ نایەت ، یان ئەو کەسانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم رووداوێکی ترسناك دەبینن ، دەحەپەسێن ، و قسەیان بۆ نایەت . ئەمانە هەمویان بە گیروگرفتی قسەکردن ، دانــانــرێن ، چونکە بەردەوام نین ، بەلام زوبان بەستن بۆ ماوەیەکی دوور ، وەکو زوبان بەستنی هیستیری یەکجاری ، یان بەردەوام : دەبێتە گیروگرفت لە رێگەی قسەکردندا .
ئەو لێکـولینەوانەی لەبارەی جۆرەکانی لالی‌یە وەکراوون ، ئەم راستیانەیان دەرخستووە : ـ
١ ـ توری لە کوراندا ، زیاترە ، وەك لە کچاندا ، دەلێن لەبەر ئەوەیــە کۆ ئەندامەکانی کچان پێش کۆئەندامەکانی دەماری کوران دەگەن ، یان لەبەر ئەوەیە کوران زیاتر زۆریان لێدەکرێت ، بۆ فێربوون ، راهێنان .
زانایەك بەناوی [شۆییل] دەلێت : لەبەر ئەوەیە کۆمەل سیفاتی مل کەچی ، و وازهێنان پەسند دەکات ، واتا : کۆمەل چەندێك پێش کەوێت ، ئەوەنـد هەول دەدات ئەنـدامـەکـانی باشتـر ملکـەچی یاســاو نەریتــە کۆمــەلایــەتی‌یەکان بکەن ، و زیاتر پاداشتی دەداتەوە ،و سزای دەست درێژی‌و سەربەخۆ بوون دەدات ، کچان زیاتر پەیرەوی یاساو نەریتە کۆمەلایەتی‌یەکان ، دەکــەن ، و کورانیش زیاتر دەست درێژ دەکەن ، و هەولی سەربەخۆ بوون دەدەن .
٢ ـ توری لای منـدالانی شاری زیاترە ، وەك لای مندالانی لادێ .

وادیـاره لەبـەر ئەوەیە خەڵکی لە شاردا کۆئەندامی دەماریان زیـاتر ماندوو دەبێت ، وەك لە لادێدا ، هەرچەند مەبەستمان شارو لادێیـەکانی ئێستامان نییە کە لە جەنگداین ، بەڵکو مەبـەست شار،و لادێیـەکـانی کاتی ئاسـایشە ، کاتێکە کە دانیشتوان لە زروفێکی ئاساییدا گوزەران بکەن ، و بژین .
لەلایـەکی دیکـەیشەوە ، لەوانەیشە لەبەر ئەوەبێت منداڵانی لادێ سەربەستیان زیاترە،و شێوەی ژیانیان سروشتی ترە ، ئەو کارە سوکـانـەی کە لە لادێیـەکـانـدا و گوندەکاندا دەست دەکەوێت ، وەکو ئاژاڵ بە خێوکردن کە لەگەڵ سروشتی منداڵدا دەگونجێت ، یان کشتوکاڵ کردن لە دەشتە فراوانەکاندا ، کە دەگونجێت لەگەڵ سروشتی منداڵاندا ، بەڵام منداڵانی شاری ئەو دەوروبەرەیان بۆ ناگونجێت ، بەڵکو لە زینگەیەکی جماوی پڕ هەراو هوریادا دەژین ، و رەودەرناکەن بەم لاو ئەو لادا .

### هۆکانی گیرو گرفتی قسە کردن

لە پێشەوە ووتمان : ئەگەر هات ، و منداڵ تەمەنی گەیشتە دوو ساڵی ، و قسەی نەکرد ، پێویستە لەسەر کەس ،و کاری نیشانی تویشـدار [پـزیشك] ی تایبەتی بدەن ، بۆ ئەوەی بزانن ئەو هۆیانەی تووشی گیروگرفتیان کردووە کامانەن ، و چارەسـەریان بکـەن ، بۆ لێکـۆڵەرەوەکـان دەرکەوتووە ، هۆکانی گیروکرفتی قسـەکـردن چەنـد جۆرێکن ، هەیـانـە لەشییـە ، هەشیـانە دەروونییـە ، هەشیـانـە کۆمـەڵایەتی ، و دەروونییە ، واتا تێکـەڵاوە ، لەبەر ئەوەی کە لەم سەردەمەدا ، لە کوردستانی عیراقدا مرۆڤ لە تەمەنی منداڵی ، و هەرزەکاریدا ، کاتی زۆر لە قوتابخانەدا ، کەکۆمەڵگەیەکی نموونەیی بچوکە ؛ بە سەردەبات ، هۆکـانی گیروگرفتی قسەکردن لە قوتابخانەدا ، بەجیا باس کردووە ، لە پێشا دێنە سەرباسی هۆلەشییەکان .

**یەکەم : هۆلەشییەکان :**

١ ـ ناتەواوی مێشك : ئاوسانی مێشك ، یان هەوکردنی ، یان خوێن بەربوونی ، دەبنە هۆی دواکەوتنی ئەو منداڵە کە لە ووتە فێربوون ، و زمان گرتمدا ، یان هەر بەیەککەرەتی لاڵ بێت ، یان زەیـن کوێـر بێـت کاتی وا هەیـە هۆی ناتـەواوی مێشـك دەگەرێتەوە، بۆ چەند نەخۆشییەك کە دایکی منداڵ تووشی بووە و ئەویش ئاوەڵـە بووە لەسکیـدا ،و تووشی سیروژە بووە ، و ئۆکسجین کەم بووە ، و بۆتە هۆی فەوتانی چەند شانەیەکی نێو مێشك .

هەروەهـا ناتـەواوی کۆئـەنـدامی دەمـاری قسەکردن ، یان زەدەبوونی ، یان ئیفلیجبونی منداڵەکە ؛ ئەمانە هەموویان دەبنە هۆو تووشی گیروگرفتی زمان گرتنی دەکەن ، جاری وا هەیە فێری قسەیش دەبیت ، بەڵام هەروەکو : توتی لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە ،و چاو لێکەری دەکات .

٢ ـ کەری : منداڵی کەر بازیرەکیش بێت ، درەنگ زمان دەگرێت ، یان هەیـانـە زمـان ناگـرێت ، و لاڵ دەبێت ، ئەگەر کەری تەواوبێت، چونکە گوێی لە قسەی کەسانی دیکە نابێت ، تاوەکو لێیـانـەوە فێربێت ، و لاسایی بان بکاتەوە خۆیشمان دەزانین بیستن ، وەکـو یەکێـك لە هەستـارەکـان بوونیان مەرجە ، و هۆیەکی زۆر گرنگە بۆ فێربوون ، و زمان گرتن ، منداڵیش وەکو گیانەوەرێك لە دەوروبەرەوە فێر دەبێت .

٣ـ نارێکی دەم و دان ، و پەیوەست بوونی زمان بە شەویلەوە، دەبێتە تەگەرە لە رێگەی قسەکردندا ، چونکە سەری زوبان بە شێوەیەکی لەبار هەڵ ناسورێت لەکاتی قسەکردندا هەر وەها کەرت بوونی سەربـانی دەم ، درزبـوونی لێـوی سەرەوە، و نارێکی دانـەکـانی پێشەوە ، و گێروگە واجیشەویلە خۆی ، هەمـویـان دەبنـە گیروگـرفت لە رێگەی قسە فێربووندا ، بە شێوەیەکی ئاسایی .

٤ـ هەوکردنی ئاڵو : هەوکردنی ئاڵو ، جاری واهەیە کۆئەندامی بیستن تووشی ئازار دەکـات ، ئەگـەر زوو چارەسـەر نەکرێت لەوانەیە گوێی ئەو کەسە گران بکات ، ئەگەر منداڵ بوو زمان گرتنی دواخات .

٥ـ تەندروستی گشتی منداڵ :

ئەگەر منداڵ تەندروستی گشتی باش نەبوو نەخۆشی ، و ژمەن بردەمیی سەری تێکردبوو ، لە زمان گرتندا دوا دەکەوێت .

٦ـ هۆی منگن بوونی منـداڵ : منداڵانی منگن زۆر کەمن لە

٠١٪ لە مندالە گیروگرفتاوی‌یەکانی زمان گرتن ، منگنن ، هۆی منگنی مرۆڤیش ئەوەیە کە کاتێك ئاوەلەبووە لە سکی‌دایکیدا ، و تەمەنی لە سێ مانگی کەمتر بووە لەبەر هەر هۆیەك هەبوبێت ، ریشالەکانی سەربانی قورگی ، کاتێك کە دروست بوون ، بە باشی نەگەیشتوون ، وپەیوەست نەبوون ، کە لە بەرێك لەسەربانی قورگی ئەو ئاوەلەیە بۆتەوە ، و ئێستە لەکاتی قسەکردندا هەناسە دەدات ، یان ئەو کۆرپەلەیە لێوی سەرەوەی قلیش بووە ، و بونەتە هۆی ئەوەی لەکاتی قسەکردندا ، بێجگە لە دەنگی هەردوو پیتی ( م . ن ) نەبێت ؛ دەنگی هەموو پیتەکان تێك بچن ، دەنگی پیتە ( متحرکە ) کان منگەیان لێوە بێت ، دەنگی پیتە ( ساکنە) کانیش مرخەیان لێوەبێت یان بگۆڕێن .

**دووەم : زەین کوێری :**

زەین کوێری هۆیەکی ژیری‌یە بۆ دواخستنی مندال لە قسە کردندا ، زەین کوێر بەوکەسانە دەلێن : کە پلەی زیرەکی یان لە (٩٠) پلە کەمترە ، واتا ریژەی زیرەکی‌یان لە ٥٠٪ کەمترە ، هەر وەکو چۆن مرۆڤی بلیمەت کەپلەی زیرەکی‌یان لە (١٤٠) پلەی زیرەکی زیاترە ، کەمن ، ئاوەهاش مرۆڤی زەین کوێر کەمن ، واتای وایە : زوربەی زۆری مرۆڤ زیرەکی یان مامناوەندی‌یە ، هەر وەکو چۆن مندالە زەین رۆشنەکان لە زمان گرتندا پێش دەکەوون ، ئاوەهاش مندالە زەین کوێرەکان دووا دەکەوون رادەی زەین رۆشنی‌و زەین کوێری مرۆڤ بە زیرەکی پێوی تایبەتی زاناکان دیاری دەکەن .

**سێیەم : هۆی دەروونی‌یەکان :**

ئێمە لە پێشەوە ووتمان چەند دیاردەیەکی دەروونی هەن ، لەو کەسانەدا بەدی دەکرێن ، کە تووشی گیروگرفتی زمان دەبن ، ئەوانەش وەکو : شەرمنی ، گۆشە گیری ، باوەر بە خۆ نەبوون ، ودلەراوکی هتد ....

ئەم دیاردانە کاتی وا هەیە گیروگرفتەکانی زمان دروستیان دەکات ، کاتی واش هەیە هەست بە کەمسەری ، و چەند کارکەرێکی لەش وەکو : گەجەری لە مرۆڤدا ، دروستی دەکەن ، و کاتە ئەو مرۆڤە توشی جۆرەها گیروگرفتی دەروونی ، و زمان ، و هەلوێستی ترسناك ، سامناك دەكات .

بۆ نموونە : ئەو کەسەی کە تووشی دلەراوکێ ببێت ، لە ئەنجامی هەست بە کەمسەریدا ، دەبینین : کە قسە دەکات لە بەرامبەری کەسێك لە خۆی گەورەتر ، یان لە خۆی پایە بلندتر ، لەکاتی سایە کردنی رستەکاندا ناتوانێت بە باشی بیر بکاتەوە ، دەمی بەبەکدا دێت ، و برگەی ووشەکانی دەبرێت ، و واتاکانی بۆ دەرنابررێت ، و دەیان خنکێنیت ، و یان زوبانی تەتەلە دەکات ، و دەی لەرزێنێت.

بەلگەش بۆ ئەوەی کە گوناهی دلەراوکێکەیە ؛ ئەوەیە ، کە کاتێك گۆرانی ، و بەستە دەچرێت ، یان لە ئاوێنە روبەروی خۆی قسە دەکات یان لەگەل مندالی بچوکدا قسە دەکات ، یان ووتەکانی روبەروی کەوێك ، یان سۆیسکێك ، یان هەرگیان لەبەرێکی دیکە بکات ؛ زوبانی هیچ تەتەلە ناکات ، و قسەی رون ، و رەوان دەکات ، بێ ئەوەی بیگرێت ، یان بیبرێت .

ئەمەش لەبەر ئەوەیە سام نایگرێت ، کاتێك کە گۆرانی دەلێت ، لە گیانەوەرو مندالان ناترسێن ، هەست بە ناتەواوی ، و کە مسەری ناکات

دەروون زانەکان دەلێن : کاتی واهەیە هۆی دلەراوکێی مندال ئەمانەیە:

١- پەروەردەی خراپ ٢- نازدارکردنی زۆر ٣- نەباندنی مندال لەلایەن دایك ، وباوکێوە ٤- رقەبەری نێوان مندالان ٥- ناکۆکی کەوتنەوەی نێوان دایك ، وباوك ٦- زۆر کردن لە مندالی چەپەوانە کە بەراست نیوسێت ، بۆ ئەوەی ببێتە راستە وانە ٧- چونی باوك بو سەفەر ، و دورکەوتنەوەی دایك ، یان مردنی یەکێکیان

٨- مال گواستنەوە بۆ شارێکی دیکە ، یان بۆ گەرەکێکی دیکە

٩- هەولدانی زۆر لەگەل مندالدا بۆ ئەوەی زۆر بخوێنێتەوە،و کۆشش زۆر بکات ، بۆ ئەوەزیرەك بێت ، و پلەی چاك بەدەست بهێنێت لە قوتابخانەدا .

ئەمانە هەمویان مندال جۆرە لالێك دەکەن، یان بابلێن : تووشی جۆرە لالی‌یەکی دەکەن

**چوارەم : هۆ دەروونە کۆمەلایەتی‌یەکان!**

**ئەم هۆیانە وەکو :**

١- پێشەوای نارەوان: پێشەوای نارەوان ، مرۆڤێکی گەورەی

تۆرە، بابە یان خاڵە، یان مامە، یان کاکە، دەبینین مندالی دوو ساڵی ، وسیّ ساڵی ، چاویان لێدەکەن ، ولاساییان دەکەنەوە ، و خۆیان تور دەکەن ، وەکو :
جۆرە [ اعجابیك ] و راهێن لەسەری تا ماوەیەکی دوور ، دوایی وازی لێدەهێنن .
٢ـ هەوڵدانی زۆر لەگەڵ مندالدا ، لەسەر زمان ڕەوانی ؛ بە ڕێگەی ڕەخنەگرتن ، و تەریق کردنەوە .
٣ـ ژینگەی فرە زمان فرە شێوە [ لهجة ] یش کاردەکاتە سەر منداڵ ،و تووشی گیروگرفتی زمانی دەکات ، وەکو : ئەو شارانەی دانیشتوانی چەند نەتەوەیەکن ، و بە زیاتر لە زمانێك دەدوێن ، و بەتێکەڵاوی یەکی پڕ نیشتەجێن ، چونکە منداڵەکە سەری لێدەشێوێت .
٤ـ بەزەی هاتنەوە ، بەمندالی ، و ئاگرداری کردنی زۆری ، لەبەرئەوەی لاڵە، و هەر جار نەجارێك لالی یەکەی بیرخەیتەوە ، ئەوە زیاتر لالی دەکات ، و چارەسەیشی گرانتر دەبێت و زیاتر هەست بە ناتەواوی‌یەکەی دەکات ، و وورەی نزم دەبێتەوە .

**پێنجەم : هۆکانی نێو قوتابخانە :**
لە زۆر حاڵەتدا قوتابخانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە قوتابی رزگاری نەبێت لە گیروگرفتەکانی قسەکردن ، یان تووشی یەکێکیان بێت ، ئەو حاڵەتانەش وەکو ئەمانە :ـ

١ـ لە حاڵەتێکدا قوتابخانەی سەرەتایی دەوروبەرێکی باش ئامادەنەکات ، بۆ قوتابی‌یە نوێکان ، دوورنی‌یە تووشی توری ، یان گیری ، یان بری نەبن ، چونکە وەرگرتنی قوتابی بۆ یەکەم کەرەت لە قوتابخانەدا ، بە جۆرە جیا بوونەوەو سەربەخۆبونێك دەژمێررێت .
ئەمجا منداڵ لەم جۆرە سەبارەتانەدا ، بە تایبەتی لەو ژینگە دواکەوتوانەی کە منداڵان بە مامۆستاو قوتابخانەو دکتۆر وپۆلیس دەترسێنن ؛ئەگەر نەچن بۆ کارێك ، یان سرەوت نەگرن ،و دانەسەکنێ ؛ هەست بە جۆرە ترس ،وسامێك دەکەن ، کە چوونە نێو قوتابخانەوە .
لەبەر ئەوە باش وایە یەکێك لە کەس ،و کاری منداڵ ، ڕەوانەی بکات ،و هاورێتی بکات ، تا دەیگەیەنێتە دەستی مامۆستای قوتابخانە ، یان مامۆستای باخچەی ساوایان ،و پیش چێت بە پیرێوە ، لە کاتی گەرانەوەیدا ، تا وەکو شارەزادەبێت ،و چاوو گوێی دەکرێتەوە .
٢ـ لەحاڵەتێکدا ، کە قوتابی‌یەکە بەیەك کەرەت پێکەوە فێری چەند زمانێکی نوێ بکرێت ، وەکو : ئەوەی لە ساڵێکی خوێندنی تازەدا ، فێری هەردو زمانی عارەبی ،و ئینگلیزیش بکرێت ، یان مامۆستا یەکسەر هەوڵدات بە شیوەی ڕەوان [ اللغة الفصيحة ] منداڵەکە بنوسێت ،و بیش خوێنێتەوە ، لەباتی ئەوەی وورده وورده بە شێنەیی فێری کات .
٣ـ لە حاڵەتێکدا ، مامۆستایان لە تاقی‌کردنەوەی سەرزاری رۆژانەو کۆتایی ساڵ ،و نیوەی ساڵی خوێندن ، بەپەلە پرسیار ئاراستەی قوتابی بکەن ،و داوای وەڵامی پەلە ،و یەکسەری لێ بکەن ، بێ ئەوەی ماوەی تەواوی بدەن کە بیر بکاتەوە ، یان قوتابخانە دەورو بەرێکی پڕ هەرەشەو گورەشەو پۆلیس بەکاربهێنێت .
٤ـ لە حاڵەتێکدا قوتابی لە پۆلدا هەستی کرد کە مامۆستاو قوتابی‌یەکان ، لە کاتی سایەکردنی ووشەکاندا ، یان راڤە کردنی وانەکان ، چاوەرێی ئەوە دەکەن کە بکەوێتە هەڵەوەو زمانی تەتەڵە بکات ، ئەو کاتە ، ئەوەندەی دیکە لاڵ دەبێت ،و چاك بوونەوەی گرانتر دەبێت ، هەر وەها ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشداری چالاکی‌یەکانی نێو پۆل نەکات ، ئەمیش بە ڕێگەی خۆی کار دەکاتە سەر رادەی فێربوونی‌و دوای دەخات ، نەگونجاندنی لەگەڵ مامۆستاو قوتابی‌یەکانی هاورێیداو دەرنەچوونی لە تاقی‌کردنەوەدا ، بەڵکو جاری وا هەیە دەبێتە هۆی ئەوەی واز لە خوێندن ، و قوتابخانە بهێنێت ، هیندێکیان هەن ڕق لە مامۆستاو هاورێ قوتابی‌یەکانیان دەگرن ، بیجگە لەمەش کە کەس و کاریان هەست بەمە بکەن ، بەچاوێکی زیاتر بەزەیی تەماشایان دەکەن ،و ڕەنج بێ‌وەردەبن بەرامبەر قوتابخانە .
٥ـ لە حاڵەتێکدا مامۆستا هەوڵ نەدات ئەو قوتابی‌یانەی دواکەوتوون ، بەتایبەت ئەوانەی گیروگرفتی زمان دەکێشن بییان گەیەنێت بە کۆری قوتابی‌یە مامناوەندی‌یەکان ،و پشت گوێیان بخات ، وبەربەرەکانی نێو زۆری خوێندنیان پێ نەکات ، لەگەڵ قوتابی‌یە باشەکاندا ، یان بەربەرەکانی یان پێ بکات ،

بەلاّم یارمەتی‌یان نەدات بۆ خۆگرتن ، وسەرکەوتن ، ئەو کاتە دەبەزن ، و زوبانیان راست نابێتەوە ، هێندێك لەو قوتابی‌یانەی کە گیروگرفتی قسە کردنیان نی‌یە لەوانەیە تووشی ببن .
٦ـ رەخنـەگـرتنی زۆر لە شێـوەو سایە کردنی ووشەکان ، و رستـەکان ، لەلایەن مامۆستاوە ، (تأکید) کردنەوەی زۆر لەم بارەیەوە ، قوتابی تووشی گیروگرفتی قسە کردن دەکەن ، لەبەر ئەوە مامۆستا پێویستە شێنەیی بێت لەگەڵ قوتابی‌یەکانیدا .
٧ـ ئەگەر قوتابخانە یارمەتی ئەو قوتابی‌یانە نەدات ، دەگەنە قۆنـاخـی هەرزەکـاری ،و هەسـت بە رودانی گورانی لەشی ،ودەروونی دەکەن لە خۆیاندا ؛ لەسەر گونجاندن ، بەتایبەتی ئەو گۆرانانەی کە لەباری توخمی‌یەوە بەسەریانەدێت ، زۆریان تووشی گیروگرفتی قسەکردن دەبن و دەشێوێن و لەوانەکانیاندا دوادەکەوون .
خوێنەری هێژا ! مەرج نی‌یە ئەو قوتابی‌یانەی گیروگرفتەکانی زمـان دەکێشن ، هەمـویان لەقوتابخانەدا دواکەوت وبن ، بە پێچەوانەوە ، هەیانە زۆر پێشدەکەوێت ،و سەردەکەوێت بەسەر زۆر لە هاورێ قوتابی‌کانیداو بەجێیان دەهێڵێت ، نموونە بۆ ئەم قوتابی‌یانە زۆرە، رێکەوتی زۆر قوتابی تورو گیرو برم کردووە کە ئێستە لە کۆلیجەکانی پزیشکی‌و ئەندازیاری‌و هونەرە جوانەکان دەخـوێنن ، چونکـە بەویستی بە هێزی خۆیان سەرکەوتوون بەسەر گیروگرفتەکانیاندا زاڵن لەکاتی قسەکردندا .

**چۆن مامۆستاکەی دەتوانێت ، چارەسەری گیروگرفتەکانی قسەکردنی قوتابی بکات ؟**

زۆر لە ئێمە دەیانەوێت ، زوو بگەنە ئەنجام ، زووبگەنە ئاوات ، زوو بگـەنە بەرهەم ، ببنە یەکشەوە ، بائامانج ،و بەرهەمێکی خراپیش بێت ، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە پشوویەکیان هەبێت و چاوەنواری بەرهەم کەن ، چاوەنواری بەرهەمی باش کەن .
لەبـەر ئەوەی بنکـەکـانی چارەسـەرکـردنی گیروگـرفتـەکانی قسـەکردنی منداڵ زۆر کەمن ، و گیرگرفتیان هەیە ،و لەهەمو پارێزگەیەکدا نین ، دانشتوانیش ، ئەوانەی منداڵی لاڵیان هەیە هەمویان توانایان نی‌یە پەیوەندی‌یان پێوەبکەن ،و لە بەرئەوەی زۆر لەدایکـان ،و باوکان و نەخوێندەوار و نەزانن ،یان نایان بەرژێتـە سەرچـارەسـەرکـردنی گیروگـرفتی منـداڵەکانیان ، پزیشکەکانیش سەریان قاڵەو هێندێك گیروگرفتی دورخایەنیان ، بۆ چارەسەر ناکرێت ، کەسانی دیکەش بە کاری گرنگترەوە ، خەریکن ؛ لەبـەر ئەمـانـە هەمـویـان چارەسـەرکـردنی گیروگرفتەکانی قسەکردنی منداڵ ، ئەگەر نەڵێم زوربەی زۆری هەموو گیروگرفتێکی منداڵ ، وا بەسەر مامۆستاوە ، لەبەر ئەوە ، مامـۆستـای سەرکەوتو قوتابخانەی سەرکەوتو بەرامبەر ئەم کۆسپـانە دەستەو ئەژنۆ دانانیشێت ،و ناڵێت : ئاگرەسورە لە خۆم دوورە، وچـارەسەرکردنی ئەمانە هەموو، بەمن چارەسەر ناکرێن ، بەڵکو ئەم رێگایانە دەگرێت ، لەگەیاندنی تەنها یەکێك لەنامە پیروزەکانیدا :ـ
یەکەم : وورەی بەرزدەکاتەوە،و باوەری بە خۆی بەهێزدەکات ،و یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی سەرکەوێت بەسەر گیروگرفتەکانیدا .
دووەم : مامۆستا کاتێك دەتوانێت چارەسەری گیروگرفتەکانی قسـە کردنی قوتابی بکات ، کە هانی بدات نەترسێت لەکاتی سایـە کردنی پیتەکاندا ، لەوەی بکەوێتە هەڵەوە ، لەگەڵ ئەم هاندانەشدا ، دەبێت قوتابی‌یەکە هەست بکات کە رێزی هەیە لای مامۆستا،و حەز بە بەرژەوەندی دەکات .
سێیـەم : قوتابی‌یەکە رابهێنێت لەسەر ئەوەی ، کە لە پێشترا قسە کانی لە خەیاڵی خۆیدا ئامادە بکات ،و بە خاوی بدوێت ،و قسە بکات ،و پەلە نەکات ،و هەوڵ دات بە پێی‌توانایی،و کاتی ،لە پەشێـوی‌یـە دەروونی‌یـەی کە هەستی پێـدەکـات ، دوری‌خاتەوە .
چوارەم : قوتابخانەی سەرکەوتو پەیوەندی بە ماڵی قوتابی‌یەوە بکـات ،و هاوکـاری لێوەرگـرێت ، لە نەهێشتنی ئەو دیـاردە دەروونیـانەی کە لەگەڵ گیروگرفتەکانی قسە کردندا ، وەدەر دەکەوون ،وەکو : نەهێشتنی ناکۆکی لەنێو خێزاندا ، نەهێشتنی ئەو رقەبەری‌یەی منداڵەکە لەگەڵ منداڵی لەخۆی گەورەتر ، یان لە خۆخۆشەویستر لەماڵدا ، دووچاری بووە .
هەر وەها قوتابخانە دەتوانێت : نەیەڵێت : ناکۆکی لەنێوان ئەو قوتـابی‌یـەو قوتـابی‌یەکانی دیکەدا بکەوێتەوە ، ئەمانەش بۆ ئەوەی نەبنە هۆی ئاڵوسکانی گیروگرفتەکانی قسە کردن ، یان دوورنی‌یـە نەبنـە هۆی پەیـدابـونیان ، لەو قوتابی‌یانەدا کە خوێندنێکی ئاسایی دەخوێنن .

هێنـدێکی دیکـە لەو دیـاردانـەی کە بە یارمەتی قوتابخانە،و خێزانی قوتابی پێکەوە چارەسەر دەکرێن ، بەتایبەتی قوتابی باخچەکانی ساوایان ؛ میز بەخۆدا کرین ،و وورك گرتن ، ودەمار کرتنە .

پێنجـەم : نابێت مامـۆستـایـان رێگـە بدەن ، لە کۆمەڵگەی قوتابخانەدا گاڵتەی پێ بکرێت ، کەس ،و کاریشی تێبگەیەنن کە بەسەرزەنشت ،و هەرەشەو گاڵتە پێکردن ، بەهەر مەبەستێك بێت ، دادی‌نادات ،و گیروگرفتەکانی لانابات ، چونکە ئەم جۆرە کەسـانـە وورەی نزم دەکـەنەوە ،باوەڕی بەخۆی نامێنێت ،و خراپتر دەبێت .

شەشەم : گوێ کرتن بۆ قسەکانی،و کرنگیدان بۆ ووتەکانی ، لەلایەن مامۆستاو کەس ،و کاریشێوە ؛ باوەڕی بەخۆی‌پەیدا ، دەکـات ،و دڵ بەخـۆی خۆش دەکـات ، دەبنـە هۆی راست بوونەوەی زوبانی ،و رەوانی قسەکانی .

حەوتـەم : نابێت یەکسـەر داوای لێبکـەن ، دەنگی هەمـوو پیتەکانی ووشەیەك ، یان رستەیەکیان ، بۆ سایە بکات ، یان یەکسەر توری‌یەکەی نەمێنێت ، یان یەکەندەردوو ووتەی بۆبێت ؛ بەڵکو دەبێت بە پشوبن لەگەڵیدا ، چاوەرێ بکەن .

هەشتەم : کاتێك کە منداڵی لاڵ پرسیار ئاراستە دەکات ، نابێت پێیدا هەڵکاڵن ، وتەریقی کەنەوە ؛ لەبەر ئەوەی کە زوو ئەنجام ناداتە دەستەوە ، وزوو تێیان ناگەیەنێت .

نۆیەم : قوتابخانەی سەرکەوتو پێش هەموو شتێك ، کەس ،و کاری قوتابی ،رۆژشنبیر دەکات ،و فیریان دەکات ، کە چۆن دەورو بەرێکی یان ژینگەیەکی پڕ ئارام ،و ئاساییش ،و خۆش ،و گونجـاو ،بـۆ منـداڵەکـانیـان دروست دەکـەن ، تێشیان دەگـەیەنێت کە چۆن کردەوەی خراپ منداڵەکانیان ئەوەندەی دیکە لاڵ ،و بە تەری دەکات .

دەیەم : بەشداری کردنی قوتابی لەچالاکی‌یەکانی قوتابخانەدا ، وەکـو : وەرزش نوانـدن ، (نشرة) نوسـین ، چارەسـەری گیروگرفتەکانی دەکات .

## چارەسـەری گیروگـرفتـەکـانی قسـەکـردنی منـداڵ بە شێوەیەکی گشتی

خوێنەری بەڕێز : ئەگەر هۆی ئەم گیروگرفتانە ،بەتایبەتی [لاڵی] تەواو بۆ ماوەبێت ، ئەوە چاکبونەوەیان قورس و گرانە ، پێویستە بە پزیشکێکی پسپـۆری دەکـات ، ئەگـەر هۆکـانی دروست بوونیان ئەو نەبێت ،و ژینگە بێت ، یا ژینگەی ناوخۆیی بێت ؛ ئەو کاتـە پێـویست بەکەس ،و کارێکی کارامە ،وبە حەوساڵە دەکـات ، لایـەکی دیکـەشـەوە ، پێـویست بە هەرەوەزی،و یارمـەتی،و پشـو،و پەلە نەکـردن ، دەکـات ئەو کەسـانـەی چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانەیان مەبەستە ، دەبێت بەم پێی ئەم خاڵانە برۆن :

١ـ چارەسەری لەشی :

١ ـ ١ ـ ئەگـەر ئەو کەسە هاواری لە دەستی ناتەواوی‌یەکی لەشی هەبوو، لە کۆئەندامی بیستندا ، یان قسە کردندا ، یان دەماردا ، پێویستە یەکسەر ببرێتە لای پزیشکێکی تایبەتی ، وچـارەسـەری ناتـەواوی یەکەی بکرێت ، وەکو: بەرەڵاکردنی سەری زوبـانی‌پـە بوەستی، بەکـرداری نەشتـەرگـەری ؛ دورینەوەی لێوی قڵیشاوی ، ڕێککردنەوەی دانی چەوت ،و چێڵ یان دەرهێنانی

٢ ـ ١ ـ ئەگەر ئەو گیروگرفتە منگنی بوو، یان با بڵێن : مرخنی بوو ، پزیشکێکی نەشتەرگەری تایبەتی بەم شێوەیە چارەسەری دەکـات :ـ بەنەشتەرگەری ، کە لەبەرەکەی سەربانی قورگی پردەکاتەوە . ئەگەر نەیتوانی ، یان نەکرا ،ئەو کاتە دانسازێکی کارامـە بە پشکێـك ، یان دەرگابێنێکی پلاستیکی تایبەتی ئەو کەلەبەرە دەگرێت ،یان دەی خنێت ئەمجا لەبەرئەوەی ئەوکەسە منگنـە ، لەسـەر سایە کردنی دەنگی پیتەکان بە شێوەیەکی چەوت ،و جێڵ راهاتووە ، دەبێت دانسازەکە، یان کەسێکی دیکە سەر لەنوێ رای بهێنێتەوە ،لەسەر سایە کردنی دەنگی پیتەکان ، بە شێوەیەکی راستی ، هەر دوپیتی [م . ن] نەبێت ، بیجگە لەم راهێنانە چەند راهێنانێکی چارەسەری دیکەش هەن وەکو: راهێنانی ئەو کەسە لەسەر هەوا دەرکردن لە دەمیەوە ، لە کاتی قسە کردندا ،یان لەکاتی سایە کردنی دەنگی پیتەکاندا

٢ـ چارەسـەری دەروونی : ئەگەر گیروگرفتی قسە کردن لەبەر هۆیـەکی لەشی نەبـوو ، لەوانـەیـە لەبەر هۆیەکی ،یان چەند هۆیەکی دەروونی بێت ، ئەوکاتە پێویستە چارەسەری دەروونی

بکرێت ، واتا : چارەسەری هەست بە کەمسەری،و شەرمنی،و گۆشـەگیری بکرێت ، ئەویش هەر بەدەم ئاسانە ، لەبەر ئەوە ،پێش هەمـوو شتێـك ، پێویستە دایك ،و باوك رابهێنرێن ،و فێربکرێن ،و روشنبیر بکرێن ، بۆ ئەوەی بزانن چۆن لەم بارەیەوە ، گەلە هەرەوەزی لەگەڵ پزیشکی بپسپۆری دەروونی ، دەکەن ، چۆن وادەکـەن منداڵەکە هەست بە سۆزی گەرم ،وگوڕیان بکات ، چۆن لە ماڵەوە ژینگەیەکی پڕئارام، وئاسایشی بۆ دروست دەکەن .

٣ـ چارەسەری سەرزاری : ئەم جۆرە چارەسەرەش ، یارمەتی چارەسەری دەروونی دەدات ، واتا : چارەسەری سەر زاری تەواوکـەری چارەسـەری دەروونـی‌یـە ،و پێـویستـە ئەم چارەسەرکردنە بەردەوام بێت ،ولە نەخۆشەکە نەبرێت ، ئەمیش بەوە دەبێت ، فێری بکەیت بە خاوی،و لەسەرخۆ، قسە بکات ؛ ووردە ووردە دەنگی پیتـەکان ،و برگەکان ،و ووشەکان سایە بکات ، نەك بەیەکجاری ،واتا : لەزۆر سوکەوە ، بروات ، بۆسوك ، لە سوکـەوە ، بۆ گران ، لە گرانەوە ، بۆ گرانتر ...هتد بەم رێگـەیـە چارەسـەرکـار دەتـوانێت کۆئـەندامی تۆمار [جهاز التسجیل] بەکار بهێنێت ،بۆ ئەم مەبەستە .

چارەسەرکردنی زاری کارێکی نەکردەنی‌یە ، زۆر کەسی لاڵ بەم رێگـەیە ، وەریان بەخۆیان پەیدا کردووە،و بەسەر گێروگرفتی قسەکردندا سەرکەوتوون ،و بونەتە کارامەترین زوبان رەوان .
مێـژو بۆمـان دەگـێڕێتـەوە ، دەڵێت : دوانـدەری ئەگـریکی بەناوبانگ [دیماز سپینیس ـ ٣٨٤ ـ ٣٢٢ ـ پ ـ ش] کەهاو چەرخی [فلێپس]ی مەکدونی ، باوکی ئەسکەندەر بووە ؛ [توغ ـ ذولثغـة] بووە ،کـە کاتێـك لەنێـو جەماوەردا دوانی دەدا ، گاڵتەیان پێ دەکرد ، وپێی پێدەکەینن ئەوەندەی نەمابو بچێت ،و بە تەواوی لاڵ بێت ، ئەگـەر مامـۆستـایەکی بەفریادی نەگـەیشتـایە،و هانی‌نەدا ، بۆ ئەوەی زمانی راست بکاتەوە ، لەبـەرئـەوە چووە خەڵوەوە،و هەوڵیدا زمـانی راست کاتەوە ، دەگێڕنەوە و دەڵێن لایەکی سەری دەتاشی ،
و لاکەی دیکەی دەهێشتەوە ، بۆ ئەوەی خەڵوەکەی نەشکێنێت ،

تا چەند مانگێك مایەوە ، زوبانی لەسەر سایە کردنی ووشەکان رادەهێنا ، و بیری دەکردەوە ؛
دەگێڕنەوە دەڵێن : دەچووە سەر لێواری دەریای ، و چەوێکی دەخستـە دەمێـوە ، و ئەوجـا بە خەیـاڵ شەپۆلەکانی دەکردە جەماوەر ، و ووتاری بۆ دەدان ، و گوێی بۆ دەگرتن ، هەتا وای لێهات زوبانی راست بۆوە ، و بووە پێشەوای هەمو دواندەرەکان [خوتبە خوێنەکان]ی ئەگریکی هاوچەرخی خۆی ، دژی ڤلێپس دەدا ، و دەیووت : بەراستی حوکمڕانێکی بەربەری ،و رەگەزی ، و خۆپەرستە .

هەر وەها مرۆڤی تور ، یان ئەو مرۆڤەی کە تووشی گێروگرفتی قسـەکـردن ، بووە دەتوانێت ، کەڵك لە خۆراونین لە ئاوێنەدا وەربگرێت ، بەتایبەتی ئەگەر ئاوێنە کە جۆری باڵا روان بێت ، واتا گەورە بێت ، چونکە بەسەر چویدا ئەو کەسە زاڵتر دەبێت ، دەتوانێت بۆخۆی قسەبکات،و پەراوە لەسەر ئەو دەنگانە بکات، کە زوبانی باش نایان هێنێت .

خوێنـەری هێـژا : تا ئێستـە وەکـو رابەرێکی پەروەردەیی ، رێکـەوتی چەنـد قوتابی‌یەکی گرفتاوی قسە کردنم کردووە ، هێندێکیان لە وانەکانیاندا زۆر سەرکەوتو بوون ، هێندیکیشیان دواکەوتو بوون .
لە راستیدا ئەو قوتابی‌یانە ، بە شێوەیەکی راستەوخۆ ، و لەبەر ئەو گرفتـە رەوانـەی لای من نەکـراوون ؛ بەڵکو یەکێکیان لە تاقی‌کردنەوەدا گزی (الغشی)ی کردبوو ، ئەوی تریان هەر لە خۆتەن هاتبو ، یەکێکی دیکەشیان کە ناوی [ش . ساسانی] بوو بەریـوەبـەر لەبـەر ئەوەی لە تاقی‌کـردنەوەدا ، گزی کردبوو هەواڵەی لای منی کردبوو .
دوای ئەوەی کە (حاڵە) تەکەییم کۆڵی‌یەوە ، بۆم دەرکەوت :
١ـ تەمەنی (١٢) ساڵ بوو
٢ـ سیێیەم کوری دایکی بوو
٣ـ باوکی تازە ژنی تازەی‌بەسەر دایکی هێنابو ، بەجیا داینا بوو ئەمانی پشت گوێ خستبو بەدەگمەن روی تێدەکردن .
٤ـ لە خێزانەکەیاندا کەسێکی دیکەی (تور) نەبوو ، بەڵام لە نێو باپیرانیدا چەند کەسێکیان تووشی نەخۆشی دەروونی [دڵتەنگی] بو بوون .

٥- رادەی خویندنی باش نەبوو ، واتا : دواکەوتو بوو
٦- لە قوتابخانەی سەرەتاییدا تەنها سالێك دەرنەچو بوو .
٧- لە کاتی پشوی هاویناندا ، لە کرین ، و فروشتندا ، یارمەتی باوکی دەدا .
٨- رادەی ئابوری باوکی مامناوەندیبوو .

ئەم قوتابی‌یە هەر چەند توانیم چارەسەری گزی‌یەکەی بکەم ، جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە سەری ، و لە کۆتایی سالی خوێندنا لە تاقیکـردنـەوە دەرچـوو ، هەر چەند لە سەرەتاوە ، توانیم باوەری بە خۆی بهێنمەوە ، و توری‌یەکەی چاك بێت ؛ بەلام جارێکی دیکـە گەرایـەوە ،و سەر لەنوێ تووشی بووەوە ، هەر چەند بە شێوەیەکی سوکتر .

لە باوەری خۆمـدا هۆی گەرانەوەکەی ، بۆ (توری) یەکەی ، دەگەرێتەوە بۆ ئەم هۆیانە :

١- لەبـەر ئەوەی باوکـی لێـوەی دوربـو ، و ملۆش بوو بە بەریـوەبـردنی خێزانە تازەکەیەوە ، ئەمیش هەستێکی زۆری پێدەکرد ، بەتایبەتی دایکی سکالاو بۆلە بۆلی زۆری دەکرد .
٢- برا گەورەکەی کە لەدایکی بوو ، و وایان دانا بوو جێگەی باوکی بگرێت ، و مال بەریوەبەرێت ، سەرباز بوو ، تەنها دایکی سەرەوکاری مالی دەکرد ، نەی دەپەرژا سەرەوکاری بکات ، و کاتی زۆر ، بداتێ .
٣- زۆر کەس دەوربەری (توری) یەکەیان بیر دەخستەوە ، و دەیان ووت : ئەوە چۆنە لالی‌یەکەت نەماوە ؟!

لەبـەرئـەوەی دووبارە سەرلەنوێ هەولم لەگەل دایەوە، تاچاك بوو، بەلام ماوەیەکی زۆر خایان .

**واتای چەند ووشەیەك**

| کوردی | عارەبی |
|---|---|
| بری | التلعثم |
| پشك | سداد صغير |
| توری | التأتاة |
| خەلوە | إعتكاف . |
| داسەکنانت | عدم الحركة |
| دەرگابین | سداد |
| دواندەر | الخطيب |
| سرەوت | الاستقرار ، السكون |
| سایە | تلفظ |
| فسی | الثأثأة |
| کەلەبەر | الفجوة |
| گیری | الحبسة |
| موغی | اللثغة |
| موری | التمتمة |

**ئەو سەرچاوانەی کەلکم لێوەرگرتوون**


١- بياجيه ، جان - التطور العقلي لدى الطفل - ترجمة سمير علي ط١ من منشورات دار ثقافة الاطفال في العراق ١٩٨٦
٢- جرجيس ، ملاك - مشاكل الصحة النفسية للأطفال ط٢ - الدار العربية للكتاب ١٩٨٥ - طرابلس - ليبيا .
٣- رفعت ، محمد - صحة الطفل ط١ دار المعرفة ١٩٨٠ - بيروت

٤- ژالەیی ، جەلال خەلەف - نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان - چاپی یەکەم چاپخانەی [دار جاحظ ١٩٨٦ - بەغداد ].
٥- ژالەیی ، جەلال خەلەف . گەشەی مندال - چاپی یەکەم ، چاپخانەی [دار آفاق عربية] ١٩٨٤ بەغدا
٦- عزام ، عبدالوهاب وآخرون - التوجيه الأدبي - ط١ مطبعة الأميرية ١٩٤٠ - القاهرة
٧- القوصي ، - عبدالعزيز - اسس الصحة النفسية - ط٩ مكتبة النهضة المصرية - القاهرة .
٨- گۆڤاری پەروەردە و زانست ژمارە ١٤ ١٩٧٨
٩- گوڤاری پەروەردەو زانست ژمارە / ٧ ، ٨ / ١٩٧٤
١٠- گوڤاری روشنبیری ژمارە ١١٤ ١٩٨٧
١١- مجلة الأم والطفل العدد / ٣٨٧ - ١٩٧٩
١٢- مجلة الصحة والحياة العدد / ٢ - ١٩٨١
١٣- مجلة العربي العدد / ٢٠٣ ١٩٧٥
١٤- مصادر أُخرى .







# زانســـتەو هونــــەر

**نوسینی : ل . ریمیلکاس**

**وەرگێڕان و ئامادەکردن : مەجید ئاسنگەر**

**تێبینی**

وەرگـێڕی ئەم باسە بۆ زمانی ( عەرەبی ) ، د . صفاء محمـود الجنـابي دەڵێت : ئەمـانـە چەند بیروڕاو بۆچوونی لێکۆڵەری سۆڤییەتی ل . ریمیلکاسن کە لەو دیدارەدا پێشکەش کردن لەلایـەن دەستـەی نووسـەرانی گۆڤـاری ڤەپـرۆسی لیتـەرەتـوری قضـایا الأدب ) ی سۆڤیاتییەوە ساز درا ، بە هاوکاریی ئەنجومەنی وەرگێڕان یی ئەدەبی سەر بە نووسەرانی سۆڤیـاتـەوە ئەمـەیش ( گۆڤارێکی سەنگین ) ی وێژەیی‌یە ، یەکێتی نووسەرانی سۆڤییەت و ئامۆژگای وێژەی جیهانیی سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیاتی بەناوی ( مەکسیم گۆرکی ) هەمـوو مانگێ جارێك دەری دەکات . ئەم باسەیش لە ژمارە (دووی ساڵی ١٩٨٦)ی ئەم گۆڤارەدا بڵاو کراوەتەوە .

منیش ، لەبەر نرخی زۆری ئەو بیرو بۆچوونانەی لە دوو تۆیی باسـەکەدا نیشاندراون و ، پلەو پایەی خاوەن گۆتار لە لایـەکـەوەولەبەر رۆشنایی گرنگیی کارو رۆڵی ( وەرگێڕان ) لە ئەدەبی کوردیی ئیمـڕۆمـانـاو ، بەو نیـازەوە ئەو نویسـەرو وێژەوانانەی خەریکی کاری ( وەرگێڕان ) ن ئاگادارو شارەزای ئەم بۆچوون و رایانەبن و سوودیان لێوە ببینن .. بە ئەرکی سەر شانی خۆمم زانی لەسەر لاپەڕە زێڕینەکانی ئەم گۆڤارەدا بە زمـانی‌شـیرینی کوردیی بیـانخـەمـە بەر دیدەی خوێنەرە هێژاکانمانەوە تاکو ئاسۆی بیریان پێ رۆشن بێتەوە ، هیوامە ئەرکێکی هەرە بچووکم ئەنجام دابێت .

« وەرگێڕ»

**وەرگێڕان زانستەو هونەر**

ئەو قسانەی لەبارەی [ تەرجەمەی ئەدەبی ] یەوە کران زۆر پڕ تام و بەگـوڕ بوون و ئەوانەی بەشداری کۆڕەکەن لە ووتـەکانیانا هەست بە هەوڵو کۆششی بێ ووچانیان دەکرا بۆ ئەوەی بە پەرۆشەوە پەرە بە بارو ئاستی ( وەرگێڕان ) بدەن.

ئومێدەوارم ئەم بۆچوونانەم ، کە بە خۆمی رەوا نابینم بڵێم کەم و کووڕی‌یـان نییـە ، تێکـەڵی رێبازی گشتی‌ی ئەو

دەمەتەقێیانە ببنەوە کە لە ئاراد ان و بەشدارێی بکەن لە تێرو تەســەڵ کردنی هەنــدێ لەو بۆ چوون و تێ بینییانــەی کە پێشکــەش کران.لەمــەوە دەس پێدەکەم کە ( پێوستە) وەرگێڕ زمانەکە زۆر باش بزانێت ، بەڵام ، ئاخۆ کام زمان ؟ سەرەتا،

لەوانــەیە قســەکەم سەیر بێتە بەر چاو ، بەڵام دەوێرم بڵێم (وەرگێڕ) پێویستە پێش هەموو شتێك زمانی زگماکی خۆی زۆر چاك بزانێت ، یا ئەو زمانەی بابەتەکەی بۆ وەردەگێڕێت وە دەبێ بە چاکی بیزانێت و لە زانینی ئەو کەسانە کەمتر نەبێ کە بە زمانی زگماك شاکاران دەنووسن . دەشێ هەندێ کەس گومان بکەن و بڵێن ئەوە شتێکی ( میثالی ) یەو ئەنجامدانی لە ووزەدا نییــە . بەڵام ، من دەڵێم ئەمە [ ئاواتێکی رەوایە ] چونکە لە هەموو ئەدەبەکانی جهاندا زۆر شاکار هەن کە دەست پاکانەو زۆر ( میثالی ) یانە ( تەرجەمە ) کراوون . لە بەرامبەر ئەوەشەوە تووشمــان دەبێ بە تووشی زۆرەهــا وەرگــێڕانی خەراپــەوەو ،

وەرگێڕی وەها دەبینین کە لە زانیاریی زمانەوانییدا **زۆر هەژارن** و لە شێوازدا زۆر لاوازو نزمن بە شێوەیەك کە **تەرجەمەکانیان** هیچ نرخێکی هونەریی ئەوتۆیی پێك ناهێنن شایانی **باسکردن** بێت و هەرگیز ناگەنەوە ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەی **بە زمانەکەی** خۆیــان نووسراونــەتــەوە . بۆ نمــوونــە ، **ئێمە لە ئەستۆنیادا** [1] وەرگێردراوی ئێجگار نایابی (بۆشکین) **مان هەن [ب . ئالفیر]** وەریگــێڕاوون ، هەروەهــا بەرهــەمــەکــانی **(نیکراسـۆف و** تفادۆسکی و غۆتە ) کە [ ئا. سانغ ] وەرینگێڕاوون ، **کەچی تا** ئێستــەش وەرگــێڕانی سەرکــەوتــووانــەی **شاکــارەکــانی** (مایاکۆفسکی) بە زمانی ئەستۆنی نەکراوە ، **هەرچەن ئەوانەی** بۆ وەرگێڕانی شیعرەکانی **هاتنە پێشەوە زمانی رووسیی گەلێك** باشتر دەزانن لەو دوو وەرگێڕانەی ناویانم هێنان. جا، لێرەدا، ئەم پرسیــارە قوت دەبێتەوە : سوودی باش زانینی ئەو زمانە بیانییە چییە کە لێیەوە وەردەگێڕین ئەگەر بێتو ئاسێ وەرگێڕانەکە ئاســایی بێ ؟ ئێمــە لە ئەستــۆنیــادا دیــاردەیەکی سەرسور هێنــەرمان تووش هاتووە کە بریتییە لە نەبوونی وەرگێڕی بە توانای لێهاتوو لە زمانی رووسییەوە بۆ سەر ئەستۆنیی لەبەر چی ؟ پێــویستە بووتریێ زۆر کەس **هەن** زمانی رووسیی زۆر چاك دەزانن ، بەڵام [1] ئــەستــۆنیــا کۆمــارێکی سۆڤییەتییەو (تالین) پێتەختەکەیەتی .

کەم وا دەبێ لە نێــو ئەوانــەدا وەرگــێڕی بەهــرەداری **ئەوتۆ** بدۆزینــەوە کە شاهســواری زمــانی وێژەیی ئەستۆنیی بن لە کاتێکدا ئەم بارە لە نێوان ئەو وەرگێڕانەدا بەدی ناکرێت کە جگە لە رووسیی زمانە بیانییەکانی تر بە چاکی دەزانن . ئەوانەی بارگرانیی وەرگێڕان وا بە ئەستۆییانەوە لەزمانە بیانییەکانەوە وەکــو ئینگلیسی و فەرانســزیی و ئەسپــانیــایی و جۆرجیی و ئۆکرانیایی وئازەریی و هی تریش . ئەمانە لە گۆرەپانی ئەدەبدا ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی ( تەرجەمە ) بکەن بە ( پیشە ) بوونی خۆیــانیــان سەلماندووە . بۆ وێنە :ی سیمبر ، ئا سانغ ، د . فارانــدی هەمــوویــان ئەدیب ی بلیمــەت بوون بەر لەوەی **زمانەکانی رووسییو ئەلەمانی و ئەسپانیایی و فینلەندەیی بە باشی فێر ببن .**

لەکاتی **گفتوگۆکاندا** هەندێ ووتیان : ورگێڕان ئەو زمانە **دەولەمەند دەکات** کە بەرهەمەکەی بۆ وەردەگێردرێت ، بەڵام ، **من دەڵێم بە پێچەوانەوە** ، بەداخەوە ( تەرجەمە ) زۆر جار زمانی **بێ وەرگــێردراو هەژار** دەکــات : من لە ڕێــگــای چۆنیــەتی **زانستییــانەی** وەرگێڕانەوە بەم ( قەناعەتە ) گەیشتووم ، کە دەبینــین زمانی زۆر لەو کارانەیی وەرگێردراوون پاراوو رەوان نییــە بگرە لە بەرامبەر ئەسلەکانەوە ئێجگار هەژارو سادەن : ئەمــەیش لەوەوە هاتــووە کە ( وەرگێڕ ) وەك ( نووسەر ) مکە بلیمەت نەبووەو تواناو دەسەڵاتی بەسەر زمانەکەدا نەشکاوە . ئەمــەش جگــە لە پتەوییو سفتییو ووردەکاریی لە شێوازی نووسینی نووسەردا . پسپۆران گەیشتونەتە ئەو بڕوایەوە کە زانینی ( سەد ) ووشە لە زمانە بیانییەکەوە بارمەتیی ئەوەمان دەدات لە سەدا چل ی ٤٠٪ هەر تێکستێ تێ بگەین وە ئەم رێــژەیــە بۆ ٧٠ تاکــو ٨٠ لەســەدا بەرز دەبێتــەوە گەر هاتو (١٠٠٠) هەزار ووشە بزانین ، لە کاتێکداڕێژەکە لە ٩٠٪ دا تێدەپەڕێت کاتێ (٩٠٠٠) ووشەی لێ بزانین . جا ، ئاخۆ دەبێ

ئاستی ئەو وەرگێردراوانە چۆن چۆنی بێت ئەگەر کەسانێك بۆ (تەرجەمەی) شاکارانی (تۆلستۆی و دۆستۆیفسکی و هیتر) بێنە پێشەوە کە پتر لە (٨٠٠) ووشەیان لە هەگبەدا نییە ، وە ئەوسا ئاخۆ باس لە کام جۆری‌زمان دەوڵەمەند کردنەوە بکەین باشە ؟ مەبەست لەو دەوڵەمەند کردنەی زمانە چی‌یە کە باسی لێوە دەکرێت ؟ ئایا مانای زۆر کردنی ووشە فەرهەنگی‌یەکان دەبەخشێ، یاخۆ مەبەس ئەوەیە گرامێرو رێزمانەکانی زمانەکە سەر لەنوێ دابڕێژرێنەوە ؟ هەر زمانێکی گەشە سەندووی سەردەم بێگومـان ووشــە گەل و توانستیی (گـراماتیکی)ی پێــویستی خۆی هەیــە بۆ دەربــڕینی هەمــوو بیــرو باوەڕو هەستەکانی مرۆڤ هەر لە دێر زەمان و چاخە ناوەندییەکانەوە تا دەگاتە رۆژی ئیمڕۆمان بە شێوەیەکی زۆر ووردو دروستەوە .

بۆ وێنە ، هیچ زەحمەت نی‌یە هەموو ئەو هەستو ئازارە لە ناخەوە پەنگ خواردووانـەی [ئـانـا کارنـیـنـای تۆلسـتـۆی‌و [راسکۆلینکۆف]ی شاکارەکەی دۆستۆیفسکی (تاوان و سزا) (الجـریمـة والعقـاب) کە بە دوورو درێژیی زۆر بە ووردیی باسیـان لێوە کراوە، دەڵێم زەحمەت نی‌یە وەربگێردرێنە سەر زمـانەکانی ئۆکڕانیایی یا بیلۆرووسیی وەیاخۆ بۆ سەر زۆرەها زمانی جوداوازی دیکەوە.

دەگـەڕێمەوە سەر هەمان باسەکەوەو دەڵێم مەبەس لە دەوڵەمـەنـد کردنی زمـان لە رێگـای وەرگێـڕانەوە چی‌یە؟ ئەو لێـکـۆڵینــەوانــەی تا ئێستــا کراون بە قووڵیی بە لایــەنــە سەرەکییەکانی ئەم باسەدا رۆنەچوونەتە خوار، بەڵکو هەر بەوە وازیـان هێنـاوە کە واتـاو مانـای وەك یەکـو بەرامبەریان لە زمانەکەی تردا دیار کردووە . بەرای من (وەرگێڕان) ئەو کاتە دەتـوانێت زمان دەوڵەمەند بکات کە (وەرگێڕ)توانستی ئەوەی هەبێت تێکرای ئەو توانا زمانەوانییانەی زمانەکەی خۆی بەکار بهێنێ بەهــەمان رادەو لێهاتوویی‌و ووردییەوە کە بۆ نموونە (بـۆشکـین یا خۆ تۆلستـۆی) لە نووسینی داهێنەرانەیانا بە زمانی زگماکی خۆیانا بەکاریان دێنن .جار بێتو وەرگێڕ ئەوەی بۆ ئەنجام نەدرێت ئەوە نەك هەر بە شداریی لە دەڵەمەند کردنی زمانەکەی‌دا ناکات بگرە بە پێچەوانەیشەوە..

بەمــەوە من نامــەوێ لە گرنگیی ئەوەی ووتــراوە کەم بکەمەوە کە وەرگێڕ پێویستە لەو زمانەدا زۆر بە تواناو دەست ڕۆیشتــوو بێ کە لێیــەوە وەردەگـرێت . ئەمەیان راستییەکی سادەو بەڵگە نەویستەو هیچ سەلماندنێکی گەرەك نییە!

ئێمــە بەبــێ هەردوو چاو نابـیـنـیـن و بەبێ هەردوو گوێچکـەش نابیســین، ئەوجـا هەرگیز پێویست بەم پرسیارە ناکات: کامیان گرینگترین بۆ وەرگێڕ ، زانینی ئەو زمانەی لێیەوە تەرجـەمــە دەکـات یاخـود ئەوەی تەرجەمەکەی پێ دەکات ؟ وەدەبێت وەرگـێڕ بەلانی کەمــەوە دوو زمـان بەبـاشی بزانێت، ئەوەیش لە خۆیدا (بەدیهییە)یەکە سەلماندنی ناوێت . بەڵام، ئەفســوس ! هەندێ جار تووشی کەسانێك دەبین کە تەرجەمە دەکـەن هەردووك زمـان وەکـو یەك باش نازانن ، جا ئەمەیە (کــارەســـات !) قســـەیش دەمــانکێشێتــە سەر باسکـردنی (وەرگێڕانی دەقاو دەقەوە)، لەکاتی گفتوگۆدا ئەم پرسیارە هاتە پێشەوە: ئایا ئێمە پێویستیمان بە وەرگێڕانی دەقاو دەق هەیە یا نەء وە ئایـا ئەم جۆرە کارانــە زیانبەخشن یان نا؟ بەرای من کارەکە بەوەوە بەند نییە ئەم جۆرە وەرگێرانانە سوود بەخشن یا نەء ، بەڵکـو بەئـاستی بەچـاکی زمان زانینەوە بەندە چونکە هەتـاکـو (ناتەواویی) لە رۆشنبیریی زمانەوانیی پێویست دا مابێت ، ئەوا پێـویستی بەم جۆرە (وەرگێڕانە دەقاو دەق) بیە نەفرەتی‌یە هەر دەمێنێ ! .

نکــوڵی‌یش لەوە ناکــرێت وەرگــێڕانی دەقــاودەق کەم یا زۆر ئاستێکی دیـاریی‌کراویی زمان - زانی‌ی نیشان دەدات . وە پێویستە ئامادەو بەکارهێنانی ئەو ( تەرجەمەی حەرفی ) یە بە پێی چەنـد بنـەرەتی دیـاری کراوەوە بچێت بەرێـوە ، کەچی (واقیع) شێوەیەکی جوداوازە جاری وا هەیە ، دەبینین هەندێ هۆنراوەی وەرگێردراو چاپ دەکرێن بەم شێوەیەی خوارەوەن :- لە لای چەپـدا دەقــە ئەســڵـیـەکــە نووسراوەتــەوەو لە بەرامبــەریشی‌یــەوە دەقی تەرجــەمــە حەرفی‌یەکەیە . پێویستە

ئاستی ئەو جۆرە وەرگێرانانە زۆر بەرز بێت، بەڕادەیەك ئەوەی ئامادەی كردووە شەرم لەوە نەكاتەوە ناوی خۆیی لە تەكیا بهێنێ. لێرەدا ، بۆ نموونە دەیلێم ، شاعیری مەزنی جیكۆسلۆڤاكی ( وولیەم زەفادا ) كە چەندان زمان بەباشی دەزانێت ، هیچ نزمیو كورتەك لەوەدا نابینێ لە پایینی وەرگێڕاوەكانیدا ئەم تێبینییە بنووسێت : (وەرگێڕانی وولیەم زەفادا ، بە پێداچوونەوەی فلانە پسپۆڕی زمانەوانییەوە) وایش بزانم ئەم جۆرە دەستوورە خەراپ نییە، چونكە نرخی ئەو وەرگێڕی دەقاو دەقەی پەنا بباتە بەر وەرگێڕی سەرەكیی كە دەوری زمانەوانیی دەبینێت ، بە هیچ كلۆجێ كەم نابێتەوە .

هەندێك بە دڵنیاییەوە دەڵێن زۆر شاعیری داهێنەر شیعر لە چەندان زمانەوە تەرجەمە دەكەن كە زۆریش تیایاندا باڵا دەست نین بەڵێ ، باڵا دەستیی لە زماندا شتێكی (نسبی)یە . شاعیری چاك كە هۆنراو بەشێوەیەكی ئێجگار نایاب وەردەگێڕێت ، لە سەری نەكراوە هەر وەكو رابەرێكی زمان رەوان بەو زمانە بدوێت ، چونكە ئەگەر هاتو گفتوگۆی ئاسایی بە چاكی نەزانی ئەوە هەرگیز مانای ئەوە نییە كە زمانەكە نازانێت ! بگرە دەشێت گەلێك لە رابەرەكە باشتری بزانێ ! چاكترین نموونەش بۆ ئەوە ( ئا . سانغ ) ی شاعیرە ، یادی بەخێر بێ ، كە وەرگێڕانی نایابی پێشكەشی كردووین لە هەڵبەستی ( هاینەو نیكراسوف و تفاریۆفسكی ) یەوە ، كەچی نەیشی دەتوانی بە رەوانیی بە هەردوو زمانی ئەڵمانی و رووسیی قسە بكات هەرچەن شارەزاییەكی قووڵیشی لە هەردووكیانا هەبوو. جگە لەمەیش ، هونەری ئەستۆنیی ( سانغ ) تەرجەمەی كەم وێنەی شاكارەكانی ( ف . نیزفال ) ی شاعیری زمانی چیكی بۆ جێهێشتووین لە كاتێكدا هیچ شارەزاییەكی لەم زمانەدا نەبووە. سەرەتا ( تەرجەمەیەكی حەرفی )ی ئەو شاكارانەی بە یارمەتیی فەرهەنگ و ئەو تەرجەمانەی لە چەند زمانێكی تردا هەبوون ئامادە دەكرد ، دوایی توانیی ئەم كارە گرنگە بەم شێوەیە ئەنجام بدات . هەروەها ( ماتس ترات ) لەم دواییەدا چەند هەڵبژاردەیەكی وەرگێڕاوی بڵاو كردەوە لە شاكارەكانی بوێژی مەزنی جیكۆسلۆڤاكی ( ي . فولكیر ) كە بە یارمەتیی (تەرجەمەی حەرفی)ی ئەو بەرهەمانەوە ئەنجامی دان كە خۆیی ئامادەی كردبوو . بەڵام ، بێ گومان ، باڵادەستیی و شارەزاییەكی تەواو لە زمانەكەدا و پەنا نەبردنە بەر ئەو جۆرە ( تەرجەمە حەرفی ) یانەوە ئامانجی هەرە بەرزن كە لە (وەرگێڕانا) هەنگاوی بۆ هەڵدێنینەوە .

هەمووان لەگەڵما یەكن لەوەدا كە جوداوازییەكی فراوان هەیە لە نێوان وەرگێڕانی هۆنراوەو پەخشان دا لە هەمان كاتیشدا دەتوانم لەسەر ئەوە پێ داگرم كە وەرگێڕانیی بەرهەمەكانی نووسەران ( لیسكۆف و بۆنین ) بۆ نموونە ، ساناتر نین لە وەرگێڕانیی هەڵبەستەكانی ( لێرمەنتۆف ) یاخود (بلۆك) . راستە ، پەخشان بەگشتیی ( عەقڵانی )ی ترە كاتێك لە هۆنراودا لایەنی ئەندێشەو رۆح پتر تیایدا زاڵە ، دەبینین وەختێك ( ئیقاع ) ێكی هێمن و لەسەرە خۆی دەبێت و كاتێكی دی پڕیەتی لە جۆرەها هەستی كرژو توندو تیژەوە . بەڵام كاتی وەرگێڕان ی هەر چەشنە دەقێك ، هیچ بنەمایەكی تایبەت یاخۆ تیۆرییەكی دیاریی كراومان پێویست نابێت .

(ب ـ نوبر) لە وتەكەیدا ئاماژەی ئەوەی كرد كە لەگەڵ ئەوەشدا كە چەندەها وەرگێڕان بۆ یەك بەرهەمی وێژەیی دیاریی كراو هەیە لە زمان گەلی جیاوازدا ، دیسانەوە دەبینین وەرگێڕەكان ئیستەیش پەنا بۆ دەقە ئەسڵیەكەوە دەبەنەوە . ئایا ئەو وەختە بۆمان هەیە پاكانە بۆ ئەو رایە بكەین كە دەڵێت شتێكی ( حەتمی ) یە هەر بەرهەمێكی ئەدەبیی دەبێت لێكدانەوەو شیكردنەوەی جوداوازی بۆ بكرێت ؟

من ئاوای تێناگەم . ماوەیەك لەمەوبەر مۆسیقازانێ پێمی ووت: وەرگێڕ لە كارەكەیدا لە كۆنداكتەری ( قائد ) ئۆركەسترا دەچێت چونكە ئێمە ( بیتهۆڤن و شۆبەرت و شتاكونیتش ) ناناسین تەنیا لە رێبازی ( تەفاعول ) و تێگەیشتن و ئەو رێگایەوە نەبێ كۆنداكتەر پێیانی پێشكەش دەكات ، نەك لە رێیی نۆتەی مۆزیقاوە . هەروەها حاڵی كەلە نووسەرانی جهانیش هەر ئاوەهایە چونكە تێگەیشتنی ئەدەبەكەیان و بە دڵ بوونیان پەیوەستە بە رادەی توانستی وەرگێڕەكەوە لە گەیاندنی شاكارەكانیان بۆ لە سەدا نەوەدو نۆی ( ٩٩٪ ) ئەو

خوێنەرانەوە کە توانای ئەوەیان نییە ئەسڵەکەی بخوێننەوە . ئەمــە تەنیـا بەراوردکـردنێکی جوان و هۆشمـەنـدانـەیـەوە هیچی‌تر... ئەگینا لە توانای سەرکردە مەزنەکانی ئۆرکەسترادا نی‌یە ئەو شکۆمەندییە بە دەس بێنن ئەگەر بەهۆی ئەو کۆشش و خۆ ماندوو کردنە بەردەوامەوە نەبێت کە بۆ چوونە ناخی هەرە ناوەوەی ئەو شاکارانە دەیدەن کە لەبەر دەستیانایەو هەروەها هەوڵی بێ ووچانیان نەبێت بۆ تەفاعول کردنێکی سوود بەخش لە گەڵیـانـدا . ساڵی پار ، لە ( ئەستۆنیا ) دا پێشبرکەیەکمان سازکرد بۆ وەرگێڕانی هەردوو چیرۆکی ( کابتن ئیڤان بۆنین و فاسیلی سوکشین ) بە نێوی ( شەماڵێکی فێنك ) و ( دوو نامە ) وە بەشـداربووانی پێشبرکێی ، کە ژمارەیان گەیشتبووە ٩١ کەس هەموویان ناوو نیشانی ( دوو نامە ) ی چیرۆکی سوکشین یان بەیەك شێوە گۆڕیبوو ، کەچی لەتەك چیرۆکی ( بۆنین ) کار لە بارێکی تردا بوو ، چونکــە بە بیست شێـوەی جوداوازەوە ناوونیشـانـەکەی تەرجەمە کرابوو . لەگەڵ ئەمەشەوە هێشتا پێویست بە ناوو نیشانێکی لەبارو راستو دروست هەبوو بۆ ئەم چیرۆکـە کە لەگـەڵ ناوەرۆکـە بە پێـزەکەیو رۆحییەتەکەیدا بگونجێت . ئەم راستییە واتای ئەوە ناگەیەنێ هەر وەرگێڕێك مافی ئەوەی هەبێ بە گوێرەی راو بۆ چوونی خۆی شتان لێك بداتەوە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کەپێویستە ئاگاداری ئەوە بێو بزانێت کە هەر وەرگێڕانێکی داواکراو سیماو روخسارێکی نموونەیی هەیەو پێویستە(ئەم) کۆشش بۆ ئەوە بکات کە بیگاتێ : .

هەن دەڵێن هەر خوێنەرەو ، هەر ژمارەیەکی دیاریی‌کراو لە خوێنـەرانی هاو تەمـەن و ، یا هەر وەچەیەك بە شێوەیەك مامڵەت لەگـەڵ دەقێکی ئەدەبیی‌دا کە تایبـەتـە بە خۆیو بە تێپەربوونی کات نرخو بەهای تازەتری تیادا دەدۆزێتەوە . ئەمە راستە . بەڵام ئاخۆ دەکرێ وا دابنێین کە هەر وەرگێڕێك مافی ئەوەی هەیە ( دەقەکە ) بە ڕێگای خۆی لێك بداتەوە ؟ راستە ، وەرگێڕیش خوێنەرێکە بەڵام من واتێدەگەم ئەم جۆرە بۆ چوونە دروست نی‌یـە وەرگـێڕ خوێنەرێکی ئاسایی نییە ، بەڵکو ئەم نوێنەری گشت خوێنەرەکانە ! کاتێك باس لە ( تەعامولی ذاتی ) ی وەرگـێڕ لەتەك (دەقەکەدا) دەکرێت زۆربەی جار لادانی وەرگێڕ بەو بیانووەوە پاکانەی بۆ دەکرێ گوایا هەر کەسێ ماف ئەوەی هەیـە هەر دەقێك لە گۆشەنیگای خۆیەوە بخوێنێتەوەو تێی بگـات . لێرەشـــەوە ئەم راستی‌یـە قوت دەبێتەوە کەدەڵێ لادانی وەرگێڕ لە دەقە ئەسڵی‌یەکەوە هەر لەوەوە سەر هەڵدەدات کە بەبێ ( گوێ پێدان دەقەکە دەخوێنێتەوە .

زۆر پێـویستە لەسەر وەرگێڕ ( دەقەکە ) بە شێوەیەکی باسخـوازنـە ( موضوعي ) بخوێنێتەوەو لەگەڵیا لە ئەو پەری (ئەمانەت)دا بێت . چونکە هەر مامەڵەکردنێکی ناپاکانە لە تەك هەر دەقێـك دا لە ئاکـامـدا بێ گومـان کرداری وەرگـێڕانی ئەسلەکەی بەرەو لادان دەبات .

تەنانەت ئەگەریش بە ( وەرگێڕ ) بڵێین [ لێکدەرەوە ] ئەوە پێـویستە ئەوەندە بە ووردیی ( دەقەکە ) لێك بداتەوە لەگەڵ گیانی دەقە ئەسڵەکەدا بگونجێت و هەر ئەوەش بێ کە ئەسڵەکە ڕێی بێ دەدات .

وەرگێرانی ئەدەبیی ئیمرۆ بە دوو ڕێگای دژ بەیەك دا دەڕوات وەرگێرانی ووشە بە ووشەو چارەسەریی خودیی .. زۆر شتێش گوتراوون دەربارەی راستی‌یە بنەرەتی‌یەکانی زانست و هونەری وەرگێرانەوە سەبارەت بەوەوە کە پێویستە بیرو باوەڕو هەستەکان تەرجەمە بکەین نەك تەنیا ووشە گەلێك ! وەرگێرانی ووشەکانی خۆی لە خۆیدا ( تەرجەمەی حەرف ) یە کە کۆن بووەو ئیمرۆ باویی نەماوە . بەڵام ، بە داخەوە ، تائێستەش زۆر شت بڵاو دەکـرێـنـــەوە کە ، نە رۆح و نەفسییـــەت و ، نە ووردەکـاریی‌و جوانکـاریی و نە زۆر لایـەنی دیکـەی (دەقە ئەسڵ) یەکەی تێدا نی‌یە ، چونکە بە ڕێبازی تەرجەمەی حەرف وەرگێڕ دراوەو هەر دوو بارەو سێ بارەش دەکرێنەوە .

کەمێك پێش ئێستە باسی ئەو پێشبرکێ‌یەی وەرگێرانم کرد کە ٩١ وەرگێڕ لە ( رووسیی‌یەوە ) بۆ ( ئەستۆنیی ) ی و ( 32 وەرگێڕ ) لە زمانی ( ئەستۆنی ) یەوە بۆ ( رووسی ) ی تیایدا بەشدار بوون . ئەم بەشدارییە بەرفراوانە لە پێش برکێ کەدا دەرفەتێکی باشی بۆ رەخساندین بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایانی ( تەرجەمە ) بناسین و ( دیراسەتیان ) بکەین و بەم ئەنجامەیش گەیشتین : بەداخەوە ، کاری وەرگێرە ناشی‌یەکان (ئــەوانەی تازە بە تازە هاتوونەتە ئەم مەیدانەوە) (تەرجەمەی

حەرفی) یو ئارمزووی ئەوەی تێدا زاڵە کە ( ئەسڵەکە ) ووشە بە ووشــە بگــوێــزرێتــەوەو ، بە شێــوەیــەکی میکــانیکییــانــە پێــداویستیــەکــانی لە یەکچــوون ( مطابقــة ) لە تەرجەمەدا تێگــەیشتوون . لە هەمان کاتیشدا ، زۆر لە وەرگێرەکان ، لە کۆبــوونــەوەو دیــدارو سیمینــارەکانا ، ئەم پرسیارە ئاراستە دەکەن: مەودای سەربەستیی وەرگێر چەندەو تا چ سنوورێك بۆی هەیــە لە راگــوێزانی دەقە ئەسڵیەکەوە لە ( تەرجەمەی حەرفی ) ی دوور کەوێتــەوە تاکو بتوانێ بیروراو هەستەکان بەرجــەستــە بکــات ؟ شتێکی روون و بەڵگــە نەویستە کە ( وەرگــێران ) بەبێ (ووشــە) ناکــرێت ، چونکە بە وشە دەست پێدەکات و هەر بە وشەش کۆتای دێت بەلام پێویستە بە قووڵی لە بیرورا هەستەکانی نووسەرا تێ بگەین کە کەوتوونەتە نێوان هەردوو ووشــەکــانــەوەو دەرکیــان پێ بکەین و لە تەکیاندا ( تەفاعوول ) بکەین ، و لەگەڵ ئەمەشدا ، وە لە هەمان کاتدا ، کارێکی زانستیــانــەو داهێنــەرانــە ئەنجام بدرێت مادامەکی دەنگی ( نووسەر ) لە ووشەی ( وەرگێرەکە ) دا وون نەبووەو ئاشکــرایە . لە نێوان ووشەی یەکەم و دووەمدا ناکۆکییەك لە بەینی پسپۆرانی وەرگێران دا هەیە لەبارەی ئەوەوە ئایا کامیان گرنگترن بیر یان ووشە ، روخسار یاخود ناوەرۆك ؟ وە دەتوانم بڵێم لە ( تالین و تورتو ) دا گفتوگۆکەران بوون بە دوو بەشەوە : نووســەرانی وێــژەییو زانــایــانی زمــانــەوانیی . نووســەرە ئەدەبییــەکان گرنگییەکی زۆر دەدەن بە بیرۆکەو ناوەرۆك و هەستەکانی دەقە ئەدەبییەکەوەو کرداری وەرگێر بە (داهێنان) دادەنێن . کاتێك زمانەوانییەکان بە پێچەوانەی ئەوەوە دەڵێن ووشــە گرنگترەو وەرگێرانیش بە یەکێك لە باسەکانی زانستی زمان دادەنێن و هیچی تر . کەچی نووسەرە وێژەییەکان بەوە زانــایــانی زمــانــەوانیی تاوانبار دەکەن کەوا ئەوا ئەو رێساو قاڵبــانــەی لەبــەر دەم وەرگــێرانا دایان دەنێن سەربەستیی داهێنەرانەی وەرگێر قۆڵ بەست دەکەن و رێگەی لێکدانەوەو بۆ چوونی لێ دەگــرن . هەرچی پسپۆرانی زمانیشن ئەوە دەڵێن سەربەستیی داهێنان و لێکدانەوە دان بە وەرگێر دەبێتە هۆی لادانی وەرگــێرەکەوەو دەیخاتە هەڵەی ناقۆلاو بێ ماناوە . بۆ ئەمەیش ئەو ( تەرجەمانە ) ی بەرهەمەکانی ( شەکسپیر ) بە بەڵگــە دێنــنــەوە کە شاعــیری رووسیی ( بۆریس باسترناك ) کردوونیە ، " چونکە هەست بە هیچ بوونێکی شەکسپیر ناکرێت بەڵکو تەنها باسترناك خۆیەتی و بەس نموونەی لەم بابەتانەیش ئێجگار زۆرن . بەلام پێچەوانەی ئەوانەی لە سەرەوە باس کران ئێستــە ( دیــراســات ) لە مەیــدانی وەرگــێرانــا لە شێــوەی (میتافــزیقی) یەوە بەرەو شێوەیەکی لۆجیکی ( منطق ) یانەوە دەروات و ( ف . دی . سوسبــور ) ی لێکــۆڵەری زمــانیی ، گۆرانێکی ئێجگار گرنگی لەم رووەوە ئەنجام داوە . لەسەرەتای ئەم سەدەیەمانا ، لەکاتێکدا بیروراکانی خۆیی بڵاو کردەوە کە دەڵێن :

( ووشە ) بە جەوهەری خۆی دوورە پەرێز نییە ، بەڵکو زۆرەها پەیــوەنــدیی ئاڵۆزکاوی بە خۆیەوە گرتووە . ( تەرجەمە ) ش رووالەتێکــە لە رووالەتەکانی ئەم پەیوەندییانەوە کە لە ووشە بیانییەکەوە جێ گۆرکێ دەکەن بۆ ووشەی نێو زمانەکەی ترەوە . بێ گومان وەرگێرە رەسەنو بەهرەدارەکان بێ ( سۆسبور ) و بیردۆزەکەیشییەوە بەم ئەنجامە گەیشتبوون لە داهاتووشا پەرە بە کارەکــانیــان دەدەن و بەوەیشــەوە ، شیاوییو لێهاتوویی هونــەرمەندی ووشەو زانای زمان بەرجەستە دەکەن . بەمەدا ( تەرجەمە حەرفی ) ی نە هەر تەنیا وەرگێرانی ووشە بە ووشەی پاتەو پات نییە ، بگرە بەکەم ـ زانینی ئەو (لۆجیکە ) یە (منطق) کە دەڵێت ( ووشــە ) برێتییــە لە نەژادێــك زۆر پەیــوەنــدیی ئاڵۆزکــاویی لە خۆیــدا حەشــار داوە . وەرگــێری ووشــە بە ووشــەریش یەکــەمــین چەمــك هەڵدەبــژێــرێت کە لە وەختی تەرجەمەدا بە خەیاڵیدا تێدەپەرێت وەیا لە فەرهەنگدا بەرچاوی دەکەوێت ، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدات کە ووشە ، دەیان ، جار هەیە سەدان چەمك و لێکدانەوە هەڵدەگرێت بە پێی شوێن و بەکار هێنانییەوە لە دەستەواژەو رستەگەل ی جیاوازدا
١٩٨٨/٦/١٦

**سەرچاوە : گۆڤار ( المترجم ) ـ بغداد ـ ژمارە ( ١ ) ساڵ ی (١) کانونی یەکەم /١٩٨٧ لاپەرە (82 - 88 )**



# ڕەنج
# لە پەندی پێشینانی كوردیدا

ساجد ئاواره

لەو كاتـەوەی گەردوون ئەم زەویە خڕەی لێپەیدابوو ، مرۆڤ كردیە مەڵبەندی خۆی هەر لەو كات و ساتەش دا ، كورد جێ پێی خۆی داناو ڕەنجی تیاداو ئاوەدانی كردەوە ، ناوی كوردی نا، بەشـاخ و چۆم و دەشت و تەپ و بەندەن و زێو كانیاوو دێهاتی دروست كرد، هەرێزو چوغوردو شەخەلانی هەڵكێشاو نەمـامی ناشت و ئاژەڵی پەیدا كردوو زەوی كێڵاو تۆوی تێدا وەشـانـدو ئەوجـا بوونـە خاوەن داب و نەریتی كۆمەڵایەتیو فۆلكلۆری میلیو ، بەم چەشنە كورد هۆگری یەكترو هاوجۆری دەروون بوون ، مرۆڤی كورد بە درێژایی مێژوو ، وەكو گشت مرۆڤی كۆمـەڵگاكانی تری سەر زەوی ئەركی گرانی كێشاوەو چەوساوەی خوێنی پژاوەو ، بۆ ئەوەی بەردەوامی بدات بە بوون و مانی خۆیو بژێوی مسۆگەر بكات ، ئەم هەمووئێش و ئازترو ڕەنجە بوو بە ماكی ئەدەبی بەرایی میلی كوردو سەرەتاكەی بە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و چیرۆكی گوێ ئاگردان ، سەر زارەكی دەستی پێ‌كرد ...! باسەكەمان پەندی پێشینانە كە بە ئاخاوتنێكی كورتەبر ناو دەبرێو مەبەست بە دەستەوە ئەدات و فەلسـەفەیەكی ڕەسـەن و قاڵبووی تاقی كردنەوەیەكی ڕاستـەكی كۆمـەڵگای كوردانە خوڵقاوە ، قەرەوێڵ دەگرێت و ژیرانە دەرك بە مەبەست دەكات و هۆشیارانەش دەیپێكێ ، ئەم دەربڕینە سامانێكی بەفەرو هەمەڕەنگە ، شاكاری بارۆنامای فەلسەفەی ژیانی كورد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەوی دەردەخات ، لەم سامـانــەدا ڕەفتاری تایبەتیو بیركردنەوەی گەلی كوردو باری كۆمەڵایەتیو ژیانی ڕوون و ئاشكرا دیارە ....!

لەبـەر ئەوە زانستانە سەپێنراوە كە پەندی پێشینان شاكاری گەل و نەتەوەی كورد ڕێكی خستوون : هەموو بارێك و سەرێكی ژیـانی خۆی تیـایـدا نیشـان داوە ، بە فەلسەفەوە دوواوە ، هەرچەندە لە خاسیەتی پەندی پێشینان ئەوەیە كە ئەو بیرەی كە تێی دایە واتاكەی پێ ڕوون دەبێتەوەو بە ئاسانی لە پەندەكە دەگەین ...!

تەنها هەر ڕەنج و هەوڵ و كۆششە میللەتان بەرەو دونیای نوێ دەبات ، تێ‌ڕامانو بیركردنەوەش هەر بەری تەقەللای ڕەنجەو بە جوانیی دەری دەخات كورد لە پەندێكیدا دەڵێت :ـ

**« ئەوەی بە پەیژەدا سەركەوێ**
**دەبێ لە خوارەوە دەست پێ بكات »**

مەسەلەیەكی پەروەردەیی بەهێز لە بیرۆكەی ئەم پەندە بەهادارە دەوروژێ ، ئەگـەر هات و وەرزێرێك سەرمایەی جووتێ گاو

هەوجارو گاسنێك بوو ، جێی سەد هێڵ لە زەوی گومان بردبێت بە وەرزی ساڵێـك نایكاتە خاوەن زەوی‌و زارو رەزی زەبەند ، حەوت جووت گای وەچـنـگ ناكـەوێ گێرە لە زەویـە پان و بەرینەكەیدا بكات ،...!
پەندێكی تری هەیە دەڵێت :ـ

**« دەیەوێ بە ترێ ببێتە كورێ »**

دەبێ وورده وورده، هەر ساڵەی دەستكەوتێك بەرەنجی باسك و شانی خۆی ، پاشەكەوت بكات و تا تێپەربوونی چەند ساڵێك ، ئەوجا بەم ئاواتە بەرزە دەگات ....!
وەك قوتـابیـەكی پۆلی یەكی سەرەتـایی دەبێ بە چوار ساڵ خوێنـدن چوار پلە ببرێت ، ئەو حەلە سەر دەكەوێ بۆ پلەی پێنجەم ، پەندی تری كوردی دەڵێت :

**« ئەوەی بە جووتیار ببرێ ، دانەوێڵەیە »**

بەمانا رەنج لەگەڵ چ بەرووبوومێك و كارێك بدەیت ، بەرهەمی زۆر بكـەیت ، هەر لەو بابەتەت وەچنگ دەكەوێ ، كە رەنجت لەگەڵیدا كێشاوە ..!
پەندی‌تر لەسەر رەنجدان هەیەو دەڵێت :ـ

**« رەنج پەیژەی سەركەوتنە »**

بەبێ هەوڵ و تەقەللا ، ژیانی خۆش بەدی نایەت رەنجی بێ ووچان ، ساڵ لە دوای ساڵ ، بەرەو پێشەوە دەت بات ، لە كۆری ژیاندا پێی سەردەكەوی دەبا پەندی :ـ

**« دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە »**

لەیاد نەكەین ، كە هەركەسێ رەنج نەدات و هیلاكی نەچەژێ‌و ئارەقی ناوچەوان نەرێژێ ، هەتا ماوە تێری بەسكی خۆی نادات و ناخوات و هەرگیز نا حەوێتەوە ،
(رەنج) لەپەندی پێشینانی كوردی‌دا ، ئەو فەلسەفەی ژیانەت نیشـان دەدات ، كە رەنجـدەر لە ژێـر رژێمی چەوسانەوەی چینـایەتی ئەوە دەر دەخات ، كە بەشی رەنجدەر هەر ئەركەو رەنجـەو كۆششـەو ژیانیشی پڕە لە چەرمەسەری نانی بە ئاو نابێت و با بارو دۆخیش بگۆردرێت ، وەكو لە واتەی ئەم پەندە دەردەكەوێت

**« ئەگەر شەعبانە ، ئەگەر رەمەزانە ، مووچەی كورە كەچەڵ هەر دۆ نانە »**

كورە كەچەڵ نموونەی چەوساوەی ناو كۆمەڵگایە زەمانەو دەور لەهەر بارێكدا بێت ، رەنجدەر هیلاكەو نانی بەستەم دەستگیر دەبێت....! رەنجـدەر لە كوردەواریـدا ، دەبێ هەر پشت بە رەنجی شانـو باهووی خۆی ببەستێت ، بە ئارەقی ناوچەوان بژی ، وەكو ئەم پەندە پێمانی دەسەلمێنێ

**« هەركەسە چاوەرووانی تێشووی خەڵك بێت ، لە برسانا دەمرێت »**

پەندێكی‌تر دەڵێت :ـ

**« هەركەس بەتەمای خاڵوو مام بێت**
**ئێوارە بێ‌نان ، شەو بێ دۆ دەبێت »**

رەنجـدەری كورد پەیـرەوی فەلسەفەو تاقی كردنەوەی باب و باپـیرانی خۆی دەكـات ، كە هاندەرێكە بۆ ئەوەی بیكاتە ئەو مرۆڤـە بە جەرگـەی ، كە لە كۆری ژیـاندا بەرهەم بێنێ‌و بە رەنجـدان و تێكـۆشـان خۆی پێ دەگـەیـەنێت ..! بەم كارە نەتـەوەكـەی پێش دەخات ، ئەوەشی ئەم رێبازە بەر دەدات ، پەندی كوردی وا هەیە بە پەندی دەكات و دەڵێت :ـ

**« رۆژی پاك بۆ تەمەڵ شەوەزەنگە »**

تەمەڵ لەكۆمەڵگای كوردەواریدا نەفرەت لێكراوە رۆژی پاك لە بارە بۆ ئەوەی رەنجی تیایدا بدەیت ، ئەوەی لە رۆژی پاكدا كار نەكات لێ‌ی دەبێ بە تاریكایی ئەنگوست لە چاوان تامی ژیانی تێدا ناچێژێ‌و بێ هاوەڵ دەمێنێتەوە ، تووشی هەر رەنجدەرێك ببێت ئەم پەندە دەكاتە سەر زەنشت كردنی‌و بە تەوسەوە پێ‌ی دەڵێت :ـ

**« ئەیەوێ ماسی بگرێت و قنگی تەر نەبێت »**

تەمەڵ دەرامەت و پۆشاك و پارووی چەور دەخوازێ بێ ئەوەی تۆزقاڵە رەنجێك لە پێناوی‌دا بدات ، ئەم كارەش نابێتە كالا بۆ هیچ كەسێ كە نەجووڵێ‌و هەرمانێك نەكات و خۆی پێ نەگەیەنێت و سوود بە نەتەوەكەی نەبەخشێ ...!
پەنـدی پێشینـانی كوردی وانـەیەكی بەهاداری نیشتمانیە، مەرجـە منـدالانی كورد زمانیان بە پەندی كوردی بكرێتەوەو لەسەر وتنەوەی رابێن ...!



# ستراني‌ت هرچ له‌يزاندنێ

- شڤان هرورى -

پێ نه ڤێت ل سه‌ر تايێ ستراني‌ت كوردى باخڤم و ل سه‌ر چه‌قێت ژ ڤى تاى دچن ، به‌لێ ياژ هه‌ژى گوتنێ‌يه بـ‌بێژم گه‌له‌ك ژڤى سامانێ ره‌نگين يێ هاتيه به‌رزه كرن و ل بن په‌رێت تارى شه‌ڤا يێ هاتيه ڤه‌شارتن .

هه‌ر چه‌نده خه‌تيرا خه‌باتا مه ده‌رباري فولكلورێ كوردى ياگه‌ش دبيت و روژ بو روژێ ئه‌ڤ سامانه يێ سه‌رێ خو هه‌ل ده‌ت و دچيته ناڤ په‌رتوك و په‌رێت گوڤارو روژناما .

ڤێجارێ دێ ره‌نگه‌كێ ستراني‌ت كوردى بێت فولكلورى ده‌ينه نياسين بو ملله‌تى دابزانين كانێ چه‌ند باب و باپيرێت مه دشه‌هره‌زابون دڤه‌هاندنا ستراناندا ، ئه‌ڤ ره‌نگێ سترانا ژى ئه‌ڤـه‌يه (ستراني‌ت هرچ له‌يزاندنێ) به‌لێ جهێ داخێ‌يه ئه‌ڤ سترانـه بتـنـێ ياڤ ده‌ست من كه‌تى ئه‌وژى ئه‌گـه‌را ڤێ چه‌ندێ‌يه، ئه‌ڤ سترانه دكێمن و كێم كه‌س ڤان سترانا دزانن و ده‌مێ دهـاتنـه گوتن و ڤه‌ژانـدن ژى ل سه‌ر ده‌ڤێ هنده‌ك كه‌سێت تايبـه‌تى بووه‌كى (مـام هوستـايـا) . داخـازا من ژ خانـده‌ڤـانا ئه‌وه هه‌چيێ سترانه‌كێ ژڤى ره‌نگى ببينت بلا ب پشت گوهێ خوڤه نه ئاڤێژيت .

ده‌مێ به‌رێ ل گوندو زوميێت كوردا مام هوستا دا هه‌ڤساره‌كى ده‌ته سه‌ر سه‌رێ هرچێ ئو سه‌رێ دى كه‌ته دده‌ستێ خوه‌دا ئو گوپاله‌كى بده‌ستێ خو يێ دێ هه‌لگريت ، ل ناڤ به‌رسڤه‌كا به‌ر فره‌هـ ئان ل ناڤ واركه‌كێ به‌رفره‌ه خه‌لكێ گوندى دا لێ كومبن ب بچويك و مه‌زن ڤه‌و به‌رێ خو ده‌نه ڤێ ياريا خوش (هرچ له‌يزاندنێ) مام هوستا دا ده‌ست ئاڤێته سترانا و دابێژيت ، ئه‌ڤ هرچا فێربوى دا يارى‌و فندو فيلێت خو ل دويف په‌يڤێت ستراني كه‌ت ، بو نمونه ده‌مێ مام هوستاى دگوت :

مه‌شكێ بژه‌نه‌و جانه ژنانه هرچ (شه‌مو) دا‌وه‌كى ژنكێت گه‌نـج مه‌شكێ كێت ب وى گوپـالێ دده‌ست مام هوستـاى‌دا ده‌مێ مام هوستاى دگوت :.

ب كه خه‌وێ پيره ژنانه هرچ دا وه‌كى پيره‌ژنا خو درێژ كه‌ت و كه‌ڤتـه خه‌وێ ، هوسـا هه‌تـا مام هوستـاى ستـرانێت خوه بدويماهى دئينان ، خه‌لكێ گوندا گه‌له‌ك بڤان ستران و داوه‌تا هرچێ كه‌يف خوه‌ش دبون ، هه‌ر ئێك ل دويف پێ چێبونا خو چ مسته كا برنجى ئان يا ساڤارى ئان تژى موخه‌لێ مێويژو هه‌ژير كه‌ت و بو مام هوستاى ئينت ، يێ پێ چێبباژى دا هنده‌ك دراڤى ده‌تێ .

ئه‌ڤى ره‌نگێ سترانا ئاوازه‌كێ تايبه‌تى يێ هه‌ى نه‌وه‌كى ئاوازێت سترانێت داوه‌ت و شه‌ڤه‌روكانن ، كانێ چه‌وا سترانێت شه‌ڤه‌روكا تێنه گوتن ل دويف بادانا ده‌ستكێ دستارى ئه‌ڤ سترانه‌ژى ل دويف يارى و فندو فيلێت هرچ دزانت تێنه گوتن، ئاوازه‌كـێ بره‌ونـه‌قـه، به‌لێ سه‌رو بنێت ڤێ سـترانێ وه‌كى ئاخڤتنێ‌يه و نه‌يا لێك ئيناندى‌يه وه‌كى دى ئه‌ڤ سترانا رێك و پێكه .

- ستران -

چ رۆژه‌كـى باعـه‌در
عه‌بـدلا ئاغـا دكـو دكـو چار موچكێ نه‌نـه‌در
هه‌مـا به‌رى نيڤـرو شه‌مـو بگـه‌هيتـه ئه‌ودر
خاتـويـنـا قوتـه زه‌ر
سه‌رى ژخـانـى بيـنـه ده‌ر

پێپك چارن دومال دیارن

حوتیارەمان حوتیارەمان
كورتێ هەر چ دابتە بینم ؟
حوتیارەمان حوتیارەمان
بەگ تەلا قەو دێ بدرینم
حوتیارەمان حوتیارەمان
تێل تێلۆ تێلێدا دبینم
حوتیارەمان حوتیارەمان
مەمك خالەو لناڤ رەزی
حوتیارەمان حوتیارەمان
سەردا بەردان بسك و كەزی
حوتیارەمان حوتیارەمان
شەمویە شڤانێ پەزی
حوتیارەمان حوتیارەمان
شەمو شڤانێ پەزییە
حوتیارەمان حوتیارەمان
لەو رم بازە رم پەچییە
حوتیارەمان حوتیارەمان
رم دەینانده سەر ملیە
حوتیارەمان حوتیارەمان
سەعدین ئاغا گەرگەری یە
حوتیارەمان حوتیارەمان
لەو شمبوزێ وێ سیار بیە
حوتیارەمان حوتیارەمان

حوتیارەمان حوتیارەمان
تویتنا شەموی كاو تەڤییە
حوتیارەمان حوتیارەمان
تویتن هاتو ژ ئورمی یە
حوتیارەمان حوتیارەمان
ئەڤرو شەمو وێ ها تییە
حوتیارەمان حوتیارەمان
شەموی قەلوین تێكری یە
حوتیارەمان حوتیارەمان
قەلوینێ تێكەو دمنگی نەكە

حوتیارەمان حوتیارەمان
خەتێ جوتی هود هودە كە
حوتیارەمان حوتیارەمان
گەنم و جهان ئەرزان دكە
حوتیارەمان حوتیارەمان
خو ل وەلاتا بێ ناڤ نەكە
حوتیارەمان حوتیارەمان
مەشكێ بژەنەو جانە ژنانە
حوتیارەمان حوتیارەمان
تێرنێ مەرجێ بێ بگونا نە

حوتیارەمان حوتیارەمان
بكە خەوێ پیرە ژنانە
حوتیارەمان حوتیارەمان
لەو پیرە ژن هەر دكەڤی
حوتیارەمان حوتیارەمان
هندی دخوت دەوینی شەڤی
حوتیارەمان حوتیارەمان
دەنگ درەڤی ، دێ چت زەڤی
حوتیارەمان حوتیارەمان
چەقل و سیقل ژبەر رەڤی

دێ شەموی بەمەدێرە بوینێ
دێ لێ كەم جلێ ماهینێ

تێبینی:ـ
ئەڤ سترانە من ژزار دەڤێ (عمر ئاسهی) یا وەرگرتی ، خەلكێ گوندێ (ئاسها) بەرواری بالایە ، ژیێ وی نێزیكی ٧٠ سالانە ، ئو نوكە یێ ل دهوكێ دژیت ، ئەز گەلەك سوپاسیا وی دكەم .

# کاروانی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا

**دزوار**

### سەرنووسەر

لە هەفتەی چوارەمی مانگی تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٨دا لە دیوانی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان ئاهەنگێکی خنجیلانە سازکرا بەبۆنەی گواستنەوەی سەیدا محمد امین محمد احمد ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری و لاوان سەرنووسەری گۆڤاری کاروان و کاروانی وەرزش لە شاری هەولێر بۆ بەغدای پایتەخت .

لە سەرەتادا بەرێز محمد محی الدین جێگری



ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان وتەیەکی بە سوزی خوێندەوە تێدا باسی ڕۆڵی سەیدا محمد امین محمد لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەی لە ئەمینداریێتی .. کە چ هەوڵێکی داوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئەدەب ، ڕۆشنبیری ، هونەر ، لاوان ، وەرزش ، چاپکردنی کتێبی هەمە جۆری ئەدەبی و مێژوویی‌و زانستی ... تاد

هەروەها یارمەتی‌دانی ئەدیب و هونەرمەندان و وەرزشکارانی ناوچەی کوردستان . هەروەها ئەو ئەخلاقە بەرزەی کە توانی زۆربەی هەرەزۆری ڕۆشنبیران لە دەوری ئەم ئەمینداریەتە کۆبکاتەوە بۆ زێدە خزمەت کردنی میللەت وخاک . سەیدا ئەمینداری پێشوو دەرچووی کۆلیجی ڕاگەیاندن بوو بۆیە هەردەم حەزی لە نووسین و ڕۆژنامە، گۆڤار ،کتێب ،شانۆ، تەلەفزیۆن ، پێشانگا ، وەرزش بەهەموو جۆریەوە بوو ، ئەو ماوەیە واتە حەوت ساڵەی سەیدامان محمدامین محمد احمد پڕە لە جموجۆڵی هەمە جۆری هونەرو ئەدەب و وەرزش ، لەو کاتەی بەرێزی دەچێتە بەغدا بۆ وەرگرتنی کاری نوێی ، ئێمە هەموومان خۆزگەی بەردەوامی‌و تەمەن درێژی بۆ دەخوازین .

دوا بە دوای وتەی بەرێز محمد محی‌الدین جێگری ئەمیندار تیپی مۆسیقاو گۆرانی سەر بە ئەمینداریەت چەند ئاوازێکی مۆسیقای بە سۆزیان لێداو کاک مەحفوز ئاکرەیی گۆرانی دەست لێک بەردان و خواحافیزی چڕی‌و دڵی هەموو ئامادەبوانی چزاند ، ئینجا کاک محمد عزیزی هونەرمەندو گۆرانی بێژی لاو زیاد ئەسعەدیش بەشداری ئەو ئاهەنگە خنجیلانەیان کرد لە کۆتاییدا لەسەر شەرەفی سەیدای

سەرنووسەر لە چێشتخانەی ئەمینداریێتی نانی نیوەڕۆ خورا ، لە دواییدا هەرئەوەندە دەڵێین تەمەن دار بێ سەیدا محمدامین دهـۆکی و بەردەوام بێ گۆڤـاری کاروان بەخـێرهـاتنیش بۆ سەرنووسەری نوێ .

## ڤیستڤاڵ

لە ٦ـ١٠ /١١/١٩٨٨ لە هۆڵی میدیا ، ابن المستوفي ، یانەی کرێکاران ، رۆشنبیری جەماوەر ، چالاکی قوتابخانەکان دا ڤیستڤاڵی شانۆی هونەرمەندانی هەولێر لەلایەن ئەمینداریێتی رۆشنبـیریو لاوان سازکرا . لە بەیانی یەکەم رۆژدا سەعات (١٠) بەڕێز مامۆستا محمد محی الدین وتەیەکی خوێندەوەو تێیـدا وتی : [ئـەمینـداریەتیەکەمان ، توانیویەتی رێگایەکی پوختـە بگـرێتـە بەر بۆ پەرەسـەندنی بزووتنەوەی هونەریو رۆشنبیریو لاوان . هەر لەماوەیئەم ساڵدا ، توانرا دیداریکی شانـۆیی لە شاری سولەیمـانی سازبکـرێت ، ئەمـەو لەگەڵ دیداریکی تر بۆ هونەری شانۆ لە شاری دهۆك .

وا ئەم جارەش ، ئەم ڤیستڤاڵە شانۆییە بۆ هونەرمەندانی شاری هەولێر سازدەکـەین بە نیـازی بنیـاتنانی ڤیستڤاڵێکی شانۆیی فراوان بۆ ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆمی . هاریکاریو تەقـەلادانی هونەرمەندانی هەولێر بۆ سازدانی ئەم ڤیستڤاڵە هەنگـاوێکی هونـەری باشـە بۆ چەسپـانـدنی بزووتنەوەی هونەری . یارمەتیەکانی ئەمینداریەتیەکەمان دەگەرێتەوە بۆ ئەو بزووتنەوە هونەریەی کەوا ناوچەی کوردستان بەخۆیەوە دەبینی لە سایەی شۆرشی ١٧ـ٣٠ تموزو بیرباوەرەکانی بەسەرۆکایەتی سەرکـردەی قارەمـان صدام حسین خوا بیپارێزی .. لەگەڵ رێزمان بۆ ئامادەبونتان] .

دوا بە دوای وتـەکەی بەرێز محمد محی‌الدین جێگری ئەمیندار ، تیپی هونەری هەولێر شانۆگەری (هاوارێك لە حاجی قادری کۆیـیـەوە) نووسینی زایـەر عبـدالله ، دەرهێنـانی هونـەرمـەند مامۆستا سەعدون یونس . ئەکتەرەکان بەگشتی حەمە علی ، فیصل محمد صالح ، احمد جمیل ، بکر معروف محمد سعید ابراهیم ، سیروان عثمان ، سمیرە عبدوك ، سوسن سعدون ، سلام سعدون و دارەوان .

سەرەرای گۆرانی بێـژی لاو زیـاد ئەسعـەد ، مۆسیقـایش هونەرمەند نجم الدین بابکر .

لە ئێوارەی هەمان رۆژدا دەزگای گشتی سینەماو شانۆ تیپی نواندنی هەولێر شانۆیی (لە پرسەی سیراجەدین دا)ی ، پێشکەش کرد . نووسینی مامۆستا چەتۆ حەسەن و دەرهێنانی صفوت الجراح . ئەکتەرەکان بە پێی دەرچونیان : محمد سعید ابـراهیم ـ سامی ، سلام کۆیی ـ سیراج ، فریدە فتح الله ـ رەعنا خان ، بکر معروف ـ ئەحمەد شاربەدەر ، جلال بەیار ـ عوسمان برنۆ ، ئەژی چەتۆ ـ کوری عوسمان برنۆ ، طه ئاغاجان ـ لطیف چارداغی ، غازی غفور ـ عبدالله نەخشین ، ابراهیم حکیم ـ کێل فرۆش + فەراش ، چەتۆ حسن ـ سعید بێ باڵ ، جوهـر بـاپـیر ـ محی‌الدین بنـاو خەیـات ،عـلی احمـد ـ بکر رووخۆش، رزگار لشکری ـ نورالدین تەقتەنی + بەرێوەبەر ، رأفت و نجـدت صفـوت ـ کورانی سیراج ، علی گەرمیـانی ـ مستـەفا کەمتیار ، انور عزیز ـ بهرام شێلمان ، شاهین نجم الدین ـ برین پێـچ .

بەرێـوەبـەری بەرهەم ـ صفوت الجراح ، بەرێوەبەری شانۆ ـ شاهین نجم الدین ، ئەندازەی دیکۆر ـ ئازاد کریم و لقمـان طاهر ، جێبەجێ کردنی دیکۆر ـ ئازاد کریم و لقمان طاهر ، ئەندازەی رووناکیو جێبەجێ کردنی ـ بکر بورهان ، سیروان عمـر . جل و بەرگ ـ شاهین نجم الدین ، مۆسیقا ـ لقمان طاهر باپیر ، پروپاگەندە ـ لقمان طاهرو ئازاد کریم .

لە رۆژی دووەمی ڤیستڤـاڵ ئێـوارەکەی تیپی هونەری هەولێر شانـۆگـەری (مـۆزارت و سالیری) نووسینی پۆشکین وەرگـێرانی محمـود زامـدار دەرهێنانی فؤاد جلال . نواندنی محسن



محمد ـ سالیری ، حەمە علی ـ مۆزارت . دیکۆر و جل و بەرگ ـ ساجـدە ابراهیم ، مۆسیقا ـ فؤاد جلال ، اکرم مولود ئەوەی شایانی باسە ئەم شانۆیە بۆ بینەری تایبەتی بوو هەروەها بە چوونە ژوورەوە بەجلی تایبەتی بوو . پێشکەش کرد .

دوا بەدوای مۆزارت هەمـان تیپ شانـۆی (شتێك بەرەنگاری چارەنووس دەبێتەوە) پێشکەش کرد ئەم شانۆیە لە نووسینی یوسف العاني و وەرگێرانی و دەرهێنانی حەمە علی هونەرمەند بوو ، نواندنی محمد سعید ابراهیم ، دەنگ محسن محمد ، مۆسیقا لقمان جوهر ، رووناکی فؤاد جلال .

لە رۆژی سێیـەمی ڤیستڤـاڵەکـە کۆمـەڵەی هونـەرە جوانەکانی کورد لقی هەولێر شانۆگەری (راشۆمۆن) نووسینی یونـوسـوکی ئاکـاتـاجـارا وەرگـێرانی عبـدالله احمد داود ، دەرهێنانی فەرهاد شەریف . ئەکتەرەکان جەلال بەیار ـ کاهن جوهر ، باپیر ـ داربر ، بکر معروف ـ باروکە دروستکەر ، احمد حەیران ـ جێگیر ، نەوزاد رمضان ـ تاجامارۆ ، جوهر انور ـ مێرد ، امل عاصی ـ ژن ، محبوبە محمود ـ دایك ، ئازاد خەمە ـ رۆحی مێردەکـە ، کۆرس بەسـەرپـەرشتی رزگـار لشکری ، بەرێوەبەری شانۆ ـئازاد خەمە، دیکۆر ـجلال بەیار ،مۆسیقا ـ جوهر باپیر ، ئارایشت ـ مؤید فقێ ، رووناکی ـ ش اهین نجم الدین .

هەروەهـا تیـپـی شانـۆی هونـەری نوێی کوردی سیناریۆی شانۆگەرییەکی ژەهراوی نمایش دەکات پێشکەش کرد . لە نووسینی پۆشکـین و وەرگـێرانی محمـود زامـدار دەرهێنانی هونەرمەند کریم عثمان . نمایش کاران : سلام کۆیی ـ سالیری ، کریم عوسمان ـ موزارت ، دلزار اسماعیل ، سیروان نعمت ، هوشیـار حسن لەگـەڵ کۆمـەڵە هونەرمەندێکی تیپی نەتـەوایـەتی هونـەرمیللییەکان سینۆگرافیا ـ کریم عثمان ، تۆمـارکـردنی دەنگ ـ سیروان عمر ، مۆسیقا ئامانج غازی ، بەرێوەبەری نمایش ـ شاهین نجم الدین .

لە دوا رۆژدا تیپی شانۆی رۆشنبیری شانۆگەری (حەمە دۆك) رۆمانی یەشار کمال وەرگێرانی عبدالله حسن زادە ئامادە کردن و دەرهێنـانی مامـۆستـا طلعت سامـانی هونـەرمـەند پێشکەش کرد . ئەکتەرەکان بە گشتی : عاسم ئەفەندی ـ چەتۆ حسن رەعنا ـ فەریدە فتح الله ، زەینەب ـ محبوبە محمود ، عەبدی خان ـ جوهر باپیر ، وەسمان ـ قاسم نوری ، خدە ـ نەوزاد رمضان ، عەلە ـ ابراهیم حکیم ، حەمەدۆك بە منداڵی ـ . هەرمان طلعت ، مچە بە منداڵی ـ ئەژی چەتۆ ، حەسۆ شێلم ـ احمد جمیل ، حەمەدۆك ـ طە ئاغاجان ، مچە ـ جوهر انور ، بلە سلام کۆیی ، ولیە شل ـ غازی غفور ، خەجیج ـ ئەمەل عاسی ، جەبار ـ مؤید فقێ ، لادێی + رێبوار ـ مصطفی مغدیدو صالح ابراهیم ، لادێی + رێگر ـ قاسم ابراهیم ، لادێی + جەندرمە ـ هەڵکەوت عزیز ، حسن + جەندرمە ـ اکرم خالی ، لادێی ـ جلال ابراهیـم ،لادێی + جەندرمە ئامانج عبداللەو احمد حمد امین، لادێی ـ مظفـر نوریو نجـاە کاکـەو رۆستم حسن . میوانی بەرهـەم سعدون یونس ـ احمدە زلە ، فەرهاد شەریف ـ مام سلمان .

ئەم بەرێزانەیش بەشداری کارەهونەرییەکانیان کردووە : احمد جمیل ، مؤید فقێ ، ساجدە ابراهیم ، محمد سلیم ، خیری محمـد ، بکـر بورهـان ، سیروان عمر . بەم جۆرە کۆتایی بە ڤیستڤـاڵی شانـۆی هونـەرمـەنـدانی شاری هەولێر هات ، تا ڤیستڤاڵی فراوانی کوردستان بەخواتان دەسپێرین .

## کارەساتی نەبەز

لە رۆژی ٣١/١٠/٩٨٨ تیپی شانۆی هەنگاو سەر بە یەکێتی قوتـابیـان و لاوان لە ئامـادەیی سەربەستی کوراندا شانـۆگـەری کارەساتی نەبەز لەسەر شانۆی هۆڵی ئامادەیی نضال لە نووسینی مهدی عباس و دەرهێنانی هونەرمەند خطاب حامـد کاروانی پێشکـەش کرا . ئەکتـەرەکـان بە گشتی



عبـدالرزاق طلعت ـ نەبەز ـ ، فريق فتح الله ـ ڕێبەر ، زياد عبـدالرحمن ـ باوك ، اكـرم بهـرام ـ قوتابی كۆلێج ، ادريس عبـدالكريم پاقـلانی ـ مامـۆستای كوردی ، رسول صالح ـ مامۆستای زيندەوەرانی ، ايوب جوهر ـ مامۆستای بيركاری ، طارق صالح ـ بەڕێوەبەر ، صباح عمر ـ فەراش ، محمد رضا محمد ـ قوتابی ، اسماعيل طاهرو كيفی قادرو سامان طەو مامە حسـين ـ قوتابيان ، نعمت عثمان ـ پۆليس ، شوان عثمان ـ مفوض ، محمد ابراهيم ـ پۆليس . ئەوەی شايانی باسە ئەم بەڕێزانەيش بەشداری كارەهونەرييەكانيان كردووە : ڕووناكی ـ مؤيد حسن و محی الدين طه ، مۆسيقا ـ عثمان ياسين مكياج ـ زيـاد عبـدالرحمن مەلازادە ، جل و بەرگ و پروپـاگنـدە ـ ئەكتەرەكان .

## دوو ماجستێر

لە ٢٠/٨/٩٨٨ نامـەی بەڕێـز دلشاد علی لە زانكۆی صلاح الدين مونـاقـەشەكرا . نامەكە بە ناونيشانی (بنياتی هەڵبـەسـت لە هۆنـراوەی كوردی‌دا) بوو بريـتـی بوو ، لە لێكـۆڵينـەوەيەكی رەخنەيی بەراووردكار دەربارەی هەڵبەست (القصيده) . چەمكی هەڵبەستيش لە لێكۆڵينەوەكەدا ئەو بنياتە هونـەرییـە دەگـرێتـەوە كە هۆنـراوەی خودی (ليريكی) تيا بەرجـەسـتـە دەكـرێ . مامـۆستـای نووسەر لە لێكۆڵينەوەكەيدا پەيرەوی ڕێبازێكی زانستانەی كردووە ، ڕێبازەكەش لەسەر سێ بنەرەت دامەزراوە كە بنەرەتی مێژوويیو شی كردنەوەو بەراووردكارين ، ئەمـەش بەنيازی گەڵاڵە كردنی تێروانينێكی ڕوون و ئاشكرا دەربارەی هەڵبەستی كوردی بەگشتی لەلايەك و پەردەهەڵماڵين لەسەر بنەمای هونەری ئەو هەڵبەستە رەسەنانەی كە لە زەمينە رەسەنەكەی خۆيانەوە چەكەرەيان كردووە لەلايەكیترەوە .

لێكۆڵينەوەكە لەدوو ڕووەوە دەڕوانێتە بنياتی هەڵبەست ، لەڕووی ئەو بابـەتـانـەی كە تاقی كردنـەوەكـانی شاعـير بەرجـەستـەدەكـەن و لەڕووی شێوە ئاوازەيیيەكەيەوە ، هەر لێرەوە بەپێی بابـەت و ئامـانـج و سنـوورو ڕێبازی باسەكە لێكـۆڵينـەوەكە كراوە بەسێ بەشەوەو لە كۆتايشدا ئەنجامێكی پوختی باسەكە خراوەتە ڕوو .

بەشی يەكـەمی لێكۆڵينەوەكە كە بەناونيشانی (هۆنراوەو هەڵبەست)ە ، هەردوو چەمكی هۆنراوە (الشعر) و هەڵبەست (القصيـدە) ڕوونكـراونـەتەوە ، ئەمەش بەنيازی هەڵبژاردنی چەمكێـك كە لەگەڵ تێروانينی نووسەردا دەگونجێ ، هەروەها لەبەشی يەكەمدا باس لە ڕێبازە ديارەكانی شی‌كردنەوەی بنياتی هەڵبەست لەرەخنەی كۆن و تازەی جيهانی‌دا كراوەو لە پاڵياندا ڕێبازێكی تايبەت بەخۆی خستووەتە ڕوو .

لە بەشی دووەمدا كە بە ناونيشانی (تاقيكردنەوەو بنياتی هەڵبـەست)ە ، نووسـەر بەپێی ڕێبـازەكەی خۆی لە بواری شی‌كردنەوەی بنياتی هەڵبەستدا كە بەڕێبازی (يەكگير) ناوی دەبـات لەلايەك و لەژێر تيشكی چەمكی هەڵبەست لەلايەكی ترەوە كۆمـەڵێ هەڵبـەسـتـی دێـرين و هاوچـەرخی كوردی شی‌دەكاتەوەو بەهۆيانەوە چوار جۆر بنيات دياری دەكات ، ئەم چوار جۆرەش بەبنيـاتی سادەو تێكەڵ و لێكدراوو ئاوێتە ناو دەبات .

هەرچی بەشی سێـيەمی باسـە كەشە كە بە ناونيشانی (ئاواز بنياتی هەڵبەست)ە ، ئەوا باس لەو شێوە ئاوازەيیيانە كراوە كە دانـەی ئاوازەيیـيـان بەيت و دێرو پێی هۆنراوە بە

(تفعيله) . لەسەرەتای ئەم بەشەشدا نووسەر باس لە ئاوازی ناوەوەو ئاوازی دەرەوەی هەڵبەست دەکات پێش ئەوەی دەوری کێش و قافیە لە بنیاتنانی هەڵبەستدا دەست نیشان بکات ، ئەوە جگە لەوەی کە لە روانگەی تێروانینێکی نوێوە پێناسەی کێش و قافیـە دەخـاتە بەر دەست . هەر لەبەشی سێیەمدا ئاور لە بنیاتی هۆنراوەی سەربەستی کوردی دراوەتەوەو هەوڵ دراوە سەرەتای سەرهەڵدان و چەمك و تایبەتی‌یەکانی دیاری بکرێو بنەما ئاوازەیی‌یەکەی دەربخرێ .

ئەوەی شایانی باسە لێکۆڵینەوەکە بریتی بوو لە (١٩٠) لاپـەرەو تیـایدا دەست نیشانی (١٤٣) سەرچاوەی کوردی‌و عەرەبی‌و بێگانە کراوە .

لە رۆژی ٢٩/١٠/٩٨٨ نامـەی بەرێـز فەرەیـدوون عەبـدول بەرزنجی کرا کە ئەم مامۆستایانە لیژنەی موناقەشە بوون . دکتـۆر وریـا عومـەر ئەمـین سەرۆکی لیژنە ، دکتۆر کوردستـان موکـریـانی ئەندام ، مامۆستا محەمەد مەعروف فەتـاح ئەنـدام (سـەرپـەرشتکـار) . نامـەکـە بەناونیشانی (نـادیـاری) لێکـۆڵینـەوەیـەکی بەراوردە لە نێوان دوو زاری کوردی‌دا . بریتی‌یە لەپێشەکیەك و پێنج بەش و ئەنجام .

لەبـەشی یەکـەم دا برای نووسـەر بەوکارانەدا چۆتەوە کەپێش کارمکەی خۆی لەبابەتی بکەر نادیار (المبني للمجهول) لە زمانی کوردی‌دا کراون و لە دوایی‌دا کەم و کورتی کارەکان بەشی دووەم دەردەخـاو هەڵیـان دەسەنگێنێ . لەبەشی دووەم دا نووسـەر هەوڵ دەدا بەهـۆی نیشـان دانی چەند پێناسەیەکی بکەرنادیارەوە بگاتە پێناسەیەکی لەبار بۆ بابەتی (نـادیـاری)ی ، لە زمـانی کوردی‌دا ، دوای ئەوە نووسـەر ئەرکەکانی بکەر نادیار لە زمانی کوردی‌دا روون دەکاتەوە ، لە کۆتایی بەشەکەش دا چەند لایەنێکی تیوری‌ی نادیار لەچوار بۆ چوونەوە دەخاتە روو بۆ چوونەکانیش ئەمانەن :

١ـ بۆ چوونی ئاوەژوو کردنەوە (Conversion)
٢ـ بۆ چرونی یەکەمی تەحویلی‌یەکان
٣ـ بۆ چوونەکانی تری تەحویلی‌یەکان
٤ـ بۆ چوونی لێکدانەوەی ووشەیی (Lexical - Interpre tive)

بەرای نووسەر بۆچوونی چوارەم (بۆ چوونی لێکدانەوەی



ووشـەیی) لەوانی‌تـر سەرکـەوتـووترە بۆیە رەخنە لەوانی تر دەگرێو کەم و کورتیان دەردەخاو بابەتەکەی خۆی (نادیاری) لەچوارچێوەی ئەم بۆ چوونەدا روون دەکاتەوە .

بەشی سێـیەمی نامـەکـەش بریتی‌یـە لە (مۆرفۆلۆجیاو سینتاکسی بکەر نادیار لە کرمانجی خواروودا) کە بریتی‌یە لەم برگانە :

١ـ لەرووی ووشە سازی‌یەوە
٢ـ لەرووی رستە سازی‌یەوە
٣ـ پەیوەندی نادیاری بەکارەوە
٤ـ پەیوەندی نادیاری بەبکەرەوە
٥ـ پەیوەندی نادیاری بەکەرەستەکانی تری رستەوە
٦ـ بریتی‌یەکانی بکەر نادیار

بەشی چوارەمیش مۆرفۆلۆجیا سینتاکسی بکەر نادیارە لە کرمانجی ژووروودا کەهەر ئەو برگانەی بەشی سێیەمە ، بەڵام لەکرمانجی ژووردوودا ، هەرچی بەشی پێنجەمیشە بەراوردی بابەتی نادیاری‌یە لەنێوان هەردوو زارەکەدا لەرووی لێکچوون و جیاوازی‌یەوە .

ئەوەی شایـانی باسە ئەم دوو مامۆستایە دلشاد علی‌و فەرەیـدوون بەرزنجی شوێن پەنجـەیان لە ئەدەبی کوردی‌دا بەتایبەتی شیعرو رەخنەدا هەیەو دەمێکە ئەسپی خۆیان لەم مەیـدانـەدا تاو داوە پیرۆزبـایی لەم دوو نووسەرو ئەدیب و مامۆستایە .

## نیقابەی هونەرمەندان و دوو پیشانگای تایبەتی

● نیقـابـەی هونــەرمـەنـدان ـ لقی سلێمانی لە ١٠/٩/ تا ٢٠/٩/١٩٨٨ پیشـانگـایـەکی تایبەتی لە هۆڵی گەلەری بۆ هونەرمەندی لاو محەمەد فەتاح کردەوە .

لەم پیشـانگـایەدا کە دووەم پیشانگای تایبەتیی هونەرمەند «محەمەد فەتاح» بوو پتر لە (٦٥) تابلۆی پیشان دا کە بریتی بوون لە کاری هونەری مۆنۆتایپ و کەرەسەی وەك بۆیەی رۆنی و پۆستەر و مەرەکەبی چینی و چاپی تێدا بەکار هێنرا بوو .

هونەرمەندی لاو سەبارەت ئەم پیشانگایەی خۆی دەڵێت : «وا تێ دەگەم ئەمە یەکەم تاقی کردنەوە بێ بەو چڕیە کە گشت کارەکـانــی مۆنــۆ تایـپ بێ .. ئەم هونــەرە گەلێـك بواری تاقیکـردنـەوەی تێدایە ، بە تەواوکەری ئەو زنجیرە هونەریەی دەزانم کە پێیـان ئاشنـا بووین ئەو بابەتانەی پیشانم داون هەمـووی لەژیـانی رۆژانــەمـانـدان و هێندێکیشیان وێنەی سروشــتــن ، بەڵام گرنـگ ئەوەیــە لەهــەر تابـلۆیــەکـدا تاقیکـردنەوەیەکی نوێم پیشان داوە ، ئایا وەك تەکنیك بێ یا لایــەنە جوانکاریەکەی و هارمۆنیەتی رەنگەکان.. حەز دەکەم لەمـرۆوە بینـەر بەبێ ناوەنـدێکی وەکو «ناونیشان» خۆی لە جیهـانی تابلۆکـە بگات و چێژی لێ ببینێت .. پێویستمان بە داهێنان و نوێخوازیە .. پێویستە ئەو کۆتە بپچڕێنین کە لە ملی هونەری کوردیدایە وەك لێکچوونی رێبازەکان یان خۆ بەستنەوە بە حەزی چەند کەسانێکەوە کە لە نوێخوازی یەوە دوورن .

ئەوەی ویستم بیڵێم ئەوەیە کە بەم کارەم هەوڵم دا پێناسەیەکی ئەم هونــەرە بۆ جەمـاوەر بکەم و بۆیەکەم جار وشـەیەکی تازە بخـاتە قامووسە هونەریەکەیەوە ، دوای ئەوەی کە ژمارەیەکی کەم دەیانزانی ئەم هونەرە چیە .

ـ هونەرمەند لەساڵی ١٩٦٥ دا لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە

ـ لەساڵی ١٩٨٥ دا لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی دەرچووە .



ـ لە ساڵی ١٩٨٧ دا یەکەم پیشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە

● هەر لەلایـەن نیقـابـەی هونەرمەندان ـ لقی سلێمانیەوە دووەم پیشــانگـای تایبەتیی هونەرمەندی لاو «سامان قادر» کرایەوە ، پیشانگاکە لە ١٢/١٠/٩٨٨/ وە لە هۆڵی گەلەری کرایەوە .

هونەرمەند لەم پیشانگایەدا «٢٢» تابلۆی خۆی پیشان دا کە زۆربەی بریتی بوون لەکاری هێڵکاری بە قەڵەمی رەساس و بەزۆربــەی کارەکـانــەوە پرکێشی لە بەکـار هێنـانی قەڵەمی رەساسدا دیاربوو شایانی ئاماژەیە کە بەرای هونەرمەندی لاو سامان تاوەکو بە تەواوەتی خۆی لە بواری هێڵکاریدا قاڵ نەکات نایەوێت لە تابلۆکانیدا رەنگ تەوزیف بکات .

لەو تابلۆیانەی لەم پیشانگایەدا پیشان دران : ( گوڵە سەختەکە ، ئارەزووە مردووەکان ، خەوێکی لاسار ، مردن لە دەشتا ، سیما شێواوەکان ، ناکۆکی ، کۆچ ، خۆراگرتن .

ـ هونەرمەند لە ساڵی ١٩٥٨ دا لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە

ـ دەرچـووی پەیمـانگـای تەکنۆلۆجیایە بەشی وێنەی ئەندازە سلێمانی ٧٨ ـ ٧٩ .

ـ لەساڵی ١٩٧٩ دا بەهاوبەشی لەگەڵ هونەرمەند ( ئازا حەسیب قەرەداخی) دا پیشانگایەکیان کردووەتەوە .

ـ لەســاڵی ٩٩٨٣ دا لەگـەڵ هونـەرمەند «عومەر رەسوڵ» دا پیشانگایەکیان لەکەرکوك کردووەتەوە .

ـ لەساڵی ١٩٨٤ دا لەسلێمانی پیشانگایەکی تایبەتی کردووەتەوە.
ـ لەساڵی ١٩٨٥ دا هاوبەشی شەشەم پیشانگای هونەرمەندانی سلێمانی‌ی کردووە .
ـ لەساڵی ١٩٨٦ دا هاوبەشی پیشانگای هونەرمەندانی کوردی لە هەولێر کردووە .
ـ لەساڵی ١٩٨٦ دا لەگەڵ هونەرمەندان «عومەر دەروێش» و «عومەر رەسوڵ» دا پیشانگایەکی هاوبەشیان لە سلێمانی کردووەتەوە .
ـ لەساڵی ١٩٨٧ دا هاوبەشی پیشانگای هونەرمەندانی سلێمانی کردووە کە بە بۆنەی رۆژی هونەرەوە سازدرا .

## «ماریانا پینیدا»

تیپی پێشرەوی شانۆی کوردی لە رۆژی ١٩٨٨/٩/٢٢ەوە دەستی بە پێشکەش کردنی نمایشی شانۆیی‌ی «ماریانا پینیدا» کرد . ئەم شانۆیی‌یە یەکێکە لەو شانۆییانەی لورکا لە سەرەتاکانی نووسینیدا بۆ شانۆ نووسیویەتی و بەیەکێك لە کارە جوانەکانی شاعیری مەزنی ئیسپانیا دەژمێردرێ ؛ شانۆییەکە چیرۆکنووس مامۆستا رەووف بێگەرد لەعەرەبییەوە کردبووی بەکوردی‌و هونەرمەند کاك «ئیبراهیم چێوار» دەری هێنابوو . ئەم کارە شانۆییە بەنیسبەت برای دەرهێنەرەوە پەرەپێدان بوو بەو شێوازەی کە لە کارێکی پێشوویدا (شانۆیی‌ی «ئاسکۆریال») گرتبوویە بەر .
ئەکتەرەکانی ئەم شانۆیی‌یە برێتی بوون لە : (عەدنان کەریم و رێبوار تۆفیق ـ گۆرانی بێژ ، ژیان ساڵح ـ ماریانا ، هەلاڵە عومەر ـ کلاڤێلا ، تەلار محەمەد رەشید ـ ـ ئامبارۆ ، جوان کەمال ـ لۆسیا ، عوسمان مەعروف و کەمال عەلی ـ فرناندۆ ، سیروان جەمال ـ پیدرۆسا ، دانا عەلی ـ پیدرۆ ، تەها ساڵح ـ کەسی یەکەم ، جەمیل سابیر ـ کەسی دووەم ، ئاراس محەمەد ئەمین ـ کەسی سێیەم ، مەلیحە تاهیر ـ کارمن ، شادمان عەزیز ـ ئالیگریتۆ ، ئەخشین محەمەد ـ راهیبە ، سۆما وەهاب ـ ـــ ال) .

هونەرییەکانی ئەو کارەش برێتی بوون لە : (ئازاد بەرزنجی ـ یاریدەدەری دەرهێنەر ، جەبار مەعروف ـ بەرێوەبەری شانۆ ، ئیبراهیم چێوارو سیروان جەمال ـ ئەخشەی دیکۆر ، جێبەجێ کردنی ـ سیروان جەمال شادمان عەزیز ، رووناکی ـ سیروان محەمەد ئەمین ، رێبوار تۆفیق ـ مۆسیقا ، بەهرە عەلی و دابان رەشید ـ جلوبەرگ، دانا عەلی سەعیدو ژیان ساڵح ـ ماکیاج ، سیروان جەمال ـ پۆستەر ، سەرکەوت ـ خۆشنووس ، پێشرەو رەفیق ـ بەرێوەبەری هۆڵ) .
شایانی ئاماژەیە کە گۆرانی‌یەکانی ئەم شانۆیی‌یە هونەرمەند «خالید سەرکار» ئاوازی بۆ دانابوون و تیپی مۆسیقای «دیلان» یش بەجێیان دەهێنا کە برێتی بوون لەم هونەرمەندە لاوانە : (سامان عەلی فەرەج ، پەروێز ئەحمەد ، دانا ئەحمەد ئارام عومەر ،بەختیار محەمەد ،عومەر عەبدوڵا).
دەرهێنەر لە وتەکەیدا دەڵێت : (ئەوانەی گوڵ لەسەر بەرد دەروێنن ؛ بۆنی گوڵەکانیان خۆشە .. بەڵام کەسکوونە .. ئای کە ستەمە لەسەر تاشەبەرد گوڵ بروێنیت .. گەرچی لوورە لووری رەشەباش بێت ، دەبێ کۆڵ نەدەیت و گوڵی خۆت هەر بروێنیت) .

## «بەرێوەبەرێتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەرو دوو کۆر»

● بەرێوەبەرێتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی لە رۆژی پێنج شەممەی رێکەوتی ١٩٨٨/٩/١ داو لە هۆڵی یەکێتی‌ی نیقابەکانی کرێکاران کۆرێکی بۆ چیرۆکنووس مامۆستا «محەمەد فەریق حەسەن» سازدا کە تیایدا چیرۆکێکی درێژی خۆی خوێندەوە لە ژێر ناونیشانی «پەری خان» دا .
پاش خوێندنەوەی چیرۆکەکە ئەم نووسەرە بەرێزانە گفتوگۆیان لەسەر چیرۆکەکە کرد : (رەووف حەسەن ، محەمەد رەشید فەتاح ، عەبدوڵا حەمە سوور ، عەبدولکەریم حەسەن) ، شایانی باسە کە برای شاعیر «جەمال غەمبار» کۆرەکەی بەرێوە دەبرد .
● هەر لەلایەن بەرێوەبەرێتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەرەوە لە



رۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی ٨/٩/١٩٨٨دا لیژنەی ڕۆشنبیریی بەڕێوەبەرێتیی ناوبراو کۆڕێکی بۆ خاتوو «لەیلان» سازدا کە تیایدا باسێکی مێژوویی لەژێر ناونیشانی (هۆزی زازا)دا خوێندەوە ، ئەم کۆڕە کاک کەمال عارف بەڕێوەی دەبرد و پاش تەواوبوونی خوێندنەوەی باسەکە چەند پرسیارێك لەلایەن ئامادە بووانەوە ئاراستەی خاوەن باس کراو بەوەرام دانەوەیان کۆتایی بە کۆڕەکە هات .

## «یەکێتی نووسەران و چەند کۆڕێکی ڕۆشنبیری»

● یەکێتیی ئەدیبان و نووسەران ـ لقی سلێمانی لە ڕۆژی ؟/٩/١٩٨٨ داو هەر لەهۆڵەکەی خۆیدا کۆڕێکی تایبەتی بۆ مامۆستا «حسەین حوزنی موکریانی» سازدا ، لەم کۆڕەدا دووباس خوێندرانەوە ؛ سەرەتا لەلایەن خاتوو «لەیلان»ەوە باسێك لەژێر ناوی «حسەین حوزنی موکریانی و میر نشینیی سۆران» دا خوێندرایەوە کە تیایدا خاوەن باس لەمەڕ چۆنێتی دروست بوونی میر نشینیی سۆران و فەرمانڕەوایانیو میرەکانی‌یەوە دواو ئینجا سەبارەت کارە گرنگەکانی پاشای گەورەو دروست کردنی قەڵاکەوەو بڵاکردنەوەی ڕۆشنبیری‌یەوەو پاشانیش کۆتایی هاتنی ئەو میرنشینی‌یەوە دواو بەمە کۆتایی بەباسەکەی هات .

دووەم باسی ئەم کۆڕە لەلایەن کاك «ئومێد ئاشنا»ی نووسەرەوە خوێندرایەوە لەژێر ناونیشانی «جێگای زاری کرمانجی‌لە ژیانی ڕۆشنبیریی کوردیدا» ؛ خاوەن باس لە نووسینەکەیدا گۆڤاری زاری کرمانجی بەسەرکردەوەو سەبارەت ڕۆڵی ئەو گۆڤارە دوا کە دامەزرێنەرەکەی مامۆستا حسەین حوزنی‌بوو لە مێژووی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردیدا .

شایانی ئاماژەیە ئەم کۆڕە لەلایەن برای شاعیر کاك «هوشیار بەرزنجی»یەوە بەڕێوەبرا .

● هەر لەلایەن لقی یەکێتیی ئەدیبان و نووسەرانی سلێمانی‌یەوەو سەر لەئێوارەی ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ١٠/١٠/١٩٨٨ کۆڕێکی تایبەت بۆ ئەدیب دڵشاد مەریوانی سازدرا کە تیایدا باسێکی بەناوی «شیعرو ئەزموون»ەوە خوێندەوەو باسەکەی نووسەر پتر سەبارەت ئەزموونی خودی شاعیر خۆی بوو ، نووسەر لەم باسەیداو لەتێڕوانینی خۆیەوە بۆ شیعر ئەزموونی ژیانی شیعری خۆیە چوار تەوەرەی خستەڕوو و بەم جۆرە (١ ـ قۆناغی عەفەویەت لە شیعردا ، ٢ ـ قۆناغی سەنعەت سازی ٣ ـ فەلسەفەو بابەتە ویژدانیەکان و کردنی شیعر بە چەکی خەبات ، ٤ ـ ئایا شیعر درامایە) بۆ هەریەك لەو تەوەرانەیش نموونەی ئەزموونی شیعریی خۆی دەهێنایەوەو لە کۆتاییشداو لە وەرامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا شیعر چی‌یە ؟

وتی شیعر هەموو ئەوشتانەیە کە لێوەیان دوام و هیچیشیان نی‌یە ، دوای خوێندنەوەی باسەکە چەند پرسیارێك ئاراستەی خاوەن باس کران و بەوەرام دانەوەیان کۆتایی بە کۆڕەکە هات کە هەر لەهۆڵی یەکێتی خۆیدا سازکراو برای شاعیر «هوشیار بەرزنجی» بەڕێوەی برد .






**○ سۆران حەریری ئامادەی کردووە ○**

**خوێنەرە ئازیزەکانم :**

واگۆڤارەکەتان پێی ناوەتە ساڵی حەوتەمو ، پەیتاپەیتا بەهەوڵ و کۆششێکی زۆرەوە هەنگاو بەرەو ساڵێکی تازە دەنێ و ، دیدەی ئێوەی ئازیزو خۆشەویستی «کاروان» گەشاوەتر دەکات و ، شانازی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر دۆستایەتی و دڵسۆزی و وەفاداریتان .

ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە هەر لە زووەوە ئێوەمان بە خاوەن ماڵ داناوەو ، گوتوومانە هەموو نووسەرێکی کورد کەم تا زۆر بەرپرسیارن لە بەرەو پێشەوە بردن و ، دەوڵەمەندتر کردنی «کاروان» . وا ئەمساڵیش دووبارەی دەکەینەوەو دەڵێین : کاروان تەنها موڵکی چەند کەسانێك نی یە وەکو هەندێ خوشك و برا بە هەڵەوە تێی گەییوون . بەڵکوکاروان ، موڵکی هەموو نووسەرێکی دڵسۆزو بەوەفای کوردە . موڵکی هەموو قەڵەم بەدەستێکی ڕەسەن و شارەزایە . موڵکی هەموو شاعیرو چیرۆکنووس و لێکۆڵەرەوەیەکی بەتوانایە ، ئیتر ئەوان ڕاستەوخۆ لەهەموو کەموکوتی یەکی گۆڤارەکەیاندا بەرپرسیارن . هەر لەم ڕوانگەیەشەوە ، بە هەموو جۆش و خرۆشێکەوە هەوڵی ئەوە دەدەین کە ئەم گۆڤارە ئازیزەمان بە هاریکاری ئێمەو ئێوە زیاتر ڕەگ داکوتێ و دەوڵەمەندتربێ و ، ڕازاوەتر خۆی نیشان بدات .

ئیتر با هەموو لایەکمان وەك یەك بنەماڵەی یەکگرتوو ، کۆشش بکەین بۆ لابردن و بنەبڕکردنی هەموو کێشەو گرفت و تەگەرەیەك کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم بەرەو پێشەوە چوونی ڕەوتی «کاروان»ی گۆڤارو ، کاروانی ڕۆشنبیری پێشکەوتنخوازی گەلەکەمان ، ئێستاش فەرموون لەگەڵ وەڵامی بەشێکی تری ئەو نامەو نووسینانەی کە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون و ، بوونەتە میوانی گۆشەی پۆستەی کاروانی ئەم ژمارەیەمان .

**○ بۆ ئەو دوو برا ئازیزەی ئەم دوو بەرهەمەیان بۆ ناردووین : «خۆراکی دانەوێڵەیی منداڵان . تاوانی کوشتن چۆن چارەسەر دەکرێت ؟ .**

بەڕێزان پێشەکی سوپاستان دەکەین بۆ هاوکاری و بەشداری کردنتان لە دەوڵەمەندکردنی گۆڤارەکەماندا . بەڵام ئەوەی مایەی داخە ئەوەیە کە هەردوو بابەتەکەتان نەگەیتۆ ڕێبێزی گۆڤارەکەماندا نەدەگونجان و شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون . هیواخوازین لەداهاتوودا بەرهەمی باشترو سەرکەوتووترمان بۆ بنێرن و دووبارە سوپاس . .

**○ «ورێنەو فەلسەفە» . بابەتێکە کاك «ف . ح» لە شاری سلێمانی یەوە بۆی ناردووین .**

پێشەکی سوپاسی ئەو برا ئازیزەمان دەکەین . بۆ بەردەوام بوونی لە هاوکاری و پشتگیری کردنی گۆڤارەکەمان و . ڕازاندنەوەی بە نامەو بەرهەمەکانی خۆی . بەڵام داخمان ناچێ کە زوربەی ئەو بەرهەمانەی بۆمانی دەنێرێ لە ئاستی گۆشە جیاوازەکانی «کاروان» دا نین و . زۆریان بە بەرەوە ماوە کامڵ بن . بۆیە دەبێ بمانبەخشێ لە بڵاونەکردنەوەیان . چاوەڕوانی بەرهەمی سەرکەوتووترین . .

**○ بۆ ئەو شاعیرە بێناوەی شیعری «ئەی نیشتمان»ی بۆ ناردووین . .**

مایەی سەرسوورمانە کە گۆڤاری «کاروان» تا ئێستا «٦٩» ژمارەی لێ دەرچووە . جارەهای جاریش ئەوەمان دووبارە کردۆتەوە هەر بابەتێك یا نووسینێك ناوو . ناونیشانی تەواوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبێ . بەرهەمەکەی پشت گوێ دەخرێ . کەچی ناوە ناوە هەندێ نووسین و بەرهەمی نووسەرانمان پێ دەگات نەك هەر ناوی نووسەرەکەی بەسەرەوە

نی‌یه ، به‌ڵکو نازناویشی نه‌نووسیوه ، ئیتر ئیمه ده‌بی چۆن مامڵه‌ت له‌گه‌ڵ ئه‌و جۆره نووسه‌رو به‌رهه‌مانه بکه‌ین . . هه‌ر به‌م بۆنه‌یه‌شه‌وه به‌و شاعیره بیناوه ده‌ڵیین ، کاکی برا گه‌ر له‌وه بترسی ناوی خۆت ئاشکرا بکه‌یت ، ئه‌وه له ئیستاوه دڵنیابه جه‌نابت نابی به شاعیر ، بۆیه وا باشه ئه‌م ره‌فتاره واز لی‌بینی‌و ، دووباره‌ی نه‌که‌یته‌وه ، بۆ ئه‌وه‌ی ئیمه‌یش دووباره به شاعیری بیناو له قه‌ڵه‌مت نه‌ده‌ین‌و ، سوپاس . .

• **بۆ ئه‌م دۆست‌و برا ئازیزانه‌ی به‌شعیر گۆڤاره‌که‌مانیان به‌سه‌ر کردۆته‌وه :**

«احمد جلال احمد هیمه‌ت ، بهجت محمد أمين ، حسن احمد ابراهيم ، هونه‌ر محمد كريم ، أسكندر عثمان ئاكره‌یی ، به‌رزو ابراهيم حسن ، زريان باغه‌جنێری ، سامی سلێمان ، عارف طه صالح ، هه‌ژار جعفر ابراهيم ، هيوا ناكام ، كاوان محمد علی ، عبد السلام عبد العزيز ، أبو بكر علي محمد ، عبد المجيد محمد علي ، پیره‌مێرد محمد ، جبار مصطفى نجم الدين ، برهان مجيد قه‌ره‌داغی ، شۆڕش مارف سعيد ، نوزاد مدحت عبد الله ، مصلح سلمان سندی ، سه‌رحه‌د احمد هارونی ، عبد الله ئاواره ، مغديد ابراهيم خۆگر ، حسن أمين قادر ، فرياد شوانی » . .

به‌ڕێزان له‌سه‌ره‌تادا پڕ به‌دڵ سوپاستان ده‌که‌ین که به‌وپه‌ڕی جۆش‌و خرۆشه‌وه به‌گه‌ڵ کاروان که‌وتوون‌و ، هه‌ریه‌کێکتان به‌جۆرێ هه‌وڵی خزمه‌تکردنی ئه‌ده‌ب‌و ڕۆشنبیری نه‌ته‌وه‌که‌تان ده‌ده‌ن ، ئه‌ڵبه‌ته ئه‌م سه‌رگه‌رمی‌و ده‌روون گه‌رمی‌یه‌شتان له پاکی‌و وه‌فاداری‌و دڵسۆزی‌یه‌وه‌یه ، جا بۆ ئه‌وه‌ی که‌فو کوڵی ئه‌م وه‌فاداری‌یه‌تان دانه‌مرکێنه‌وه‌و ، زیره‌کانه‌و هۆشیارانه مامڵه‌ت له‌گه‌ڵ ووشه‌و شیعری کوردی‌دا بکه‌ن ، وه‌کو برایه‌ك داواتان لێ ده‌که‌م زیاتر به خۆتاندا بچنه‌وه‌و ، قووڵتر به‌ناخی شیعرو ئه‌ده‌بیاتی کوردی‌دا بچنه خواره‌وه‌و ، شاره‌زایی باشتر وه‌ده‌ست بێنن بۆ ئه‌وه‌ی هه‌وڵه‌که‌تان به‌رهه‌مێکی باش‌و به‌سوودی بێت ، هیواداریشم له داهاتوویه‌کی نزیکدا ببنه ڕۆڵه‌یه‌کی بیر رووناك‌و ، ڕۆشنبیرێکی به‌تواناو هۆشیار

بۆ شیعره کانیشتان ده‌بێ ببوورن که به‌چاکی پێ‌نه‌گه‌یشتوون‌و نه‌بوونه‌ته شیعری سه‌رکه‌وتوو ، دووباره سوپاستان ده‌که‌ین‌و ، هه‌ربژین . .

• **بۆ كاك محمد صالح فرج دوكانی . .**

براله پێشه‌کی هه‌ربژیت بۆ ئه‌و سۆزو خۆشه‌ویستی‌یه‌ی له نامه‌که‌تدا ده‌رت بڕیوه ، بۆ ئه‌و شیعره‌یش که به ناوی «ورێنه ، یان – خه‌یاڵی ڕابردوو»ه‌وه بۆت ناردووین ، ده‌بێ ببووری که ته‌نها ئه‌م کۆپله‌یه‌ی خواره‌وه‌ی شیاوی بڵاوکردنه‌وه بوو ، خۆزگه شیعری باشترت بۆ ده‌ناردین . .

**• ورێنه ، یان – خه‌یاڵی ڕابردوو – •**

**له کۆپله‌و دێڕی هه‌ڵبه‌ستم**

**خۆی تیا ئه‌نوێنێ مه‌به‌ستم**

**به‌یان ئه‌کا رازی دڵم**

**سۆزی ئه‌وینی به کوڵم**

**فرمێسکی ڕوونی دوو چاوم**

**ناڵه‌ی ده‌روونی سووتاوم**

**دڵی پڕ جۆش‌و خرۆشم**

**کانگای بیرو هه‌ست‌و هۆشم**

**یادگاری ڕابردووی دوێنێ**

**له خه‌یاڵما خۆی ئه‌نوێنێ**

• • • •

• **بۆ ئه‌و نووسه‌ره بێ‌ناوه‌ی شیعری «نائومێدی ژیانم»ی بۆ ناردووین . .**

کاکه گیان مرۆڤ گه‌ر به نائومێدیش بژی ، به‌ڵام ده‌بێ هه‌رگیز هیوا براو نه‌بێ‌و نه‌گاته ئه‌و ڕۆژه‌ی وه‌ك تۆ بیر شڵه‌ژاو بێو ، ته‌نانه‌ت ناوی خۆیشی له‌بیر بچێته‌وه . . براله ژیان به ئومێد خوراوه ، ئیتر هیواداربن تۆش به ئومێده‌وه بژی .

• **بۆ خوشکه گوڵزار سه‌ر چناری له شاری سلێمانی یه‌وه . .**

خوشکێ گیان چوار پارچه شیعرت بۆ ناردووین که هه‌ر یه‌که‌یان له ئاشێ لێ ده‌که‌ن ، له یه‌که‌میاندا غه‌م‌و په‌ژاره کۆ ده‌که‌یته‌وه کۆچ ده‌که‌ی ، له دووه‌میاندا ئازیزه‌که‌ت هه‌ر له‌یاده‌و ، هه‌ر بۆ ئه‌ویش ئه‌ژی ، له سێ‌یه‌میاندا داوای درکاندنی خه‌مه‌کان ده‌که‌ی ، له چواره‌میشیاندا به ده‌ست ئازاره‌وه گیرۆده‌ی . . به‌ڵام له‌هه‌ر هه‌موویاندا به‌سه‌ر هونه‌ری

